# تەفسیری زمناکۆیی

بەقەڵەمی

مەلا سعیدی زمناکۆیی



جزمی: ٦ ، ٧

بەرگی پێنجەم

# تەفسیری زمناکۆیی

بەقەڵەمی

مەلا سعیدی زمناکۆیی

جزمي ﴿٦ ، ٧﴾

بەرگی پێنجەم

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

**سوپاس بۆ پەروەردەکەری هەموو بونەوەران**

**درودی خوا لەسەر پێغەمەرو هاوڕێکانی و هەموو پەیڕەوانی.**

خوای مەزن کاتێ نهێنی دوو ڕوەکانی ئاشکرا کرد و ئابڕویانی برد لەنێو دانیشتواندا و ئاشکراکردنی نهێنیش شایانی میهرەبانی خوا نیە ، بۆیە لەمەو پاش باسی شتێکمان بۆ ئەکا وێنەی بیانو هێنانەوە بۆیان و ئەفەرموێ:

لَّا يُحِبُّ اللَّهُ الْجَهْرَ بِالسُّوءِ مِنَ الْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَ وَكَانَ اللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا ﴿١٤٨﴾ إِن تُبْدُوا خَيْرًا أَوْ تُخْفُوهُ أَوْ تَعْفُوا عَن سُوءٍ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا ﴿١٤٩﴾

﴿لا يحب الله الجهر بالسوءِ مِنَ القولِ ﴾ بەڕاستی خوا پێی خۆش نی‌یە دەنگ بەرز کردنەوە بەدەربڕینی خراپەو نهێنیش بەڵام ئاشکرا کردنی خراپترە لەگفتوگۆدا .

﴿ إلاّ مَنْ ظلم ﴾ مەگەر دەربڕین و ئاشکراکردنی کەسێ نەبێ ستەمی لێ کرابێ ، یانی ئەوکەسەی ستەمی لێ کرابێ بۆی هەیە دەربڕینی باسی خراپی ستەمکار بۆ دانیشتوان ، ئەو کاتە خوا پێی ناخۆش نی‌یە .

بۆ زانین : باس کردنی دانیشتوان بەخراپە دروست نی‌یە بەهیچ جۆرێ ئاگایان لێبێ یــا نە ، خراپەکەیان تێدابێ یان نە؟ بەڵام هەندێ جار وەهەندێ خراپە بۆ هەندێ کەس دروستە دەربڕین و ئاشکرا کردنی خراپە . وەك ئەمانەی خوارەوە :

١- ئەو کەسەی دزی لێ کرابێ ، یا هەر ستەمێ تری لێ کرابــێ دروســتە نــاوی دز و ستەمکارەکان ببا بەخراپە ، خراپەکانیان بڵاو بکاتەوە لەنێو دانیشتواندا ، بەتایبەتی لای دادوەران.

٢- کەسێکی داماوی بی کەس و کەس نەناس و هەژار ببــی بــەمیوانی کەســێ و ڕای نەگرێ بەمیوان ، ئەو داماوە بۆی دروستە باسی ئــەو کەســە بەخراپــە بکــا لــەنێو دانیشتواندا و خراپەکەی بڵاو بکاتەوە .

٣- کەسێ جنێوی پێ بدرێ بۆی دروستە سەربەسەر جنێوەکەی بداتەوە و لــەئــەندازە تێنەپەڕێ .

٤- بۆ دانیشتوان دروستە مان گرتن و خۆپیشاندان لەدژی کاربەدەستانی ســتەمکار ، بگرەە وایش ئەبێ پێویستبێ ، بەو مەرجەی ڕێگە تر نەگونجێنێ بــۆ نەهێشــتنی ئــەو ستەمە و نەبێتە هۆی هۆسەو لەناوبردنی سامان و ووڵات .

ئەو شوێنانەی دروستبێ باسی خراپەی هەندێ کەسی تێدا بکری هەر ئەوانەی پێشــونین بەڵکو زۆر جێگەی تر هەن دروستبێ ناوبردنی خراپە و نایەنە ژمــارە . بــەکورتی ســتەم لێ کــراو لــەلایــەن کاربەدەســتانەوە بــێ یــا جگــەی ئــەوان بــۆی دروســـتە ئاشــکراکردنی خراپەکانیان، ئەگەر سەر نەکێشێ بۆ لای ستەمی خراپتر ، وەك کوشــتن و بــەند کــردن و ئەشکەنجە و شتی تر .

﴿ وكانَ اللهُ سميعاً عَليماً ﴾ وەخوا هاواری ستەم لێ کــراو ئەبیســێ ، ئــەزانێ بەســتەمی ستەم کاران . ئەو ڕستەیە ئادەمیزاد ئەترسێنێ لەباس کردنــی خراپــەی دانیشــتوان و نابــێ ئابڕویان ببەن بەبوختان و درۆ ، چونکە خوا نهێنی دڵی هەموکەس ئەبیسێ و ئەیزانێ .

چاکە کردن هەرچەندە نایەنە ژمارە ن بەلآم سەرچاوەی هەمویان دوو شتن :

١- ڕاستی ووتن لەهەمو کارێکا ڕەوابێ و ڕەوشتی چاك بەکارهێنان لەگەڵ هەموو دروست کراوانی خوادا .

٢- ئەو شتانەی پەیوەندیان بەدروست کراوانی خواوە هەبێ بەم دووشتانە پێك دێ :

أ- بەگەیاندنی سوود و قازانج بە هەموو گیانداران بۆیە خوا ئەفەرموێ:

﴿ إن تبدوا خيراً أو تُخفوهُ ﴾ ئەگەر ئێوە پەرستن و چاکە بکەن و ئاشکرای بکەن یا ئێوە ئەو چاکەیە بشارنەوە و بەنهێنی بیکەن .

ب- ﴿ أو تعفوا عَنْ سوءٍ ﴾ یائێوە خۆش بن لەو خراپانە لەگەڵتان ئەکرێ ، بۆیشتان هەیە مافی خۆتان سەربەسەر وەربگرن هەرچەندە لێبوردن چاکە ، بۆیە خوا ئەفەرموێ:

﴿ فإن الله كان عفواً قديراً ﴾ دوایی بەڕاستی خوا لێبوردنی زۆرە بۆ کەسانێ بێ فەرمانی خوا ئەکەن ، خاوەنی توانایە بۆ سزادانی ستەمکاران و بۆ پاداشتی ئەو کەسانە خاوەنی لێ بوردنن ، کەواتە ئێوەیش پەیڕەوی خوا بکەن .

لێ بوردن لە ستەمکاران زۆر شیرین و چاکە لەکاتێکا لێ بوردن چاکبی بۆ هەردو لایان و نەبێتە هۆی زیان بۆ کۆمەڵان ، بەلآم ئەگەر لێبوردن ئەبو بەهۆی هاندانی ستەمکاران بۆ خراپە کردنیان و بلآو بونەوەی ستەمی زۆرتر ، بەپێچەوانەوە پێویستە تۆڵەیان لێ بسێنرێ و بە خۆڕایی بەرەڵا نەکرێن و چاویان لێ نەپۆشرێ ، ئەگەر بەو پێویستیە هەڵنەسن یاسا نرخی نامێنێ خراپەیش پەرەئەسێنێ ، ژیانی دانیشتوان تاڵ و ترش ئەبێ و ئاسودەیی بۆ کەس نامێنێتەوە بەگوێرەی فەرمودەی خوا ﴿ ولكم في القاص حياة ﴾ وەبۆ ئێوە هەیە لەتۆڵەسەندنەوەدا ژیان و مانەوەی ئادەمیزاد .

خوای گەورە کاتێ باسی دووڕووەکانی بۆ کردین لەمەو بەر ، لەمەوپاش باسی جولەکە و گاورەکان و کردەوە خراپەکانیانمان بۆ ئەکا ، باسی باوەڕدارانمان بۆ دووبارە ئەکاتەوە و ئەفەرموێ :

إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤۡمِنُ بِبَعۡضٖ وَنَكۡفُرُ بِبَعۡضٖ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ حَقّٗاۚ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴿١٥١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَلَمۡ يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ أُوْلَٰٓئِكَ سَوۡفَ يُؤۡتِيهِمۡ أُجُورَهُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١٥٢﴾

﴿ إن الذين يكفرون بالله ورُسُلِهِ ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕ بەخوا و بەفروستادەکانی خوا ناهێنن و پەیڕەوی ئەوان ناکەنە و بەزمان دەری نابڕن و کار بەفەرمانەکانیان ناکەن .

﴿ وَيريدون أن يفرقوا بين الله ورسله ﴾ وەئەو کەسانە ئەیانەوێ کەجیاوازی بخەنە نێو خواو نێردراوەکانی خوا . یانێ باوەڕ بەخوا ئەهێنن و باوەڕ بەفروستادەکانی خوا ناهێنن بەگوێرەی دەرکەوتوی کرداریان .

﴿ ويقولون نؤمن ببعضٍ ونكفر ببعض ﴾ وەئەڵێن ئێمە باوەڕ ئەهێنین بەهەندێ لەفروستادەکانی خوا و ، ئێمە باوەڕ ناهێنین بەهەندێ لەفرودستادەکانی خوا ، جولەکەکان ئەڵێن ئێمە بڕوامان بەتەورات و بەموسا هەیە ، بڕومان بەعیسا و موحەمەد و ئینجیل و قورئان نیە ، گاورەکان ئەڵێن ئێمە بڕوامان بەعیسا و بەئینجیل هەیە ، بڕوامان بەقورئان و بەموحەمەد نیە .

﴿ ویریدون أن یتخذوا بین ذلك سبیلاً ﴾ وەئەیانەوێ کە وەربگرن و دروست بکەن بۆ خۆیان لەنێوان بێباوەڕی و لەنێوان باوەڕداردا ڕێگەیەکی تایبەتی ڕایان بکێشێ بۆلای گومڕایی .

ئەبێ بزانن ڕێگەی مام ناوەندی لەلای خوا هەرگیز نەبووە و نابێ ، بەجۆرێ ئەوانیش خاوەنی گومان بن هەر بەبێ باوەڕ دائەنرێن .

﴿ أولئك هم الكافرون حقاً وأعتدنا للكافرین عذاباً مهیناً ﴾ ئەو کەسانە لەنێوان باوەڕ و بێ باوەڕیدا ڕێگەیان بۆ خۆیان داناوە ئەوانە بێ باوەڕن بەڕاستی ، ئیتر باوەڕیشیان بەهەندێ لەپێغەمەران هەبێ ، چونکە باوەڕهێنان پارچە پارچە نابێ و ، ئێمە ئامادەمان کردووە بۆ بێ باوەڕان سزایەکی ئابڕوبەر بۆیان و ئەی چێژن لەپاشەڕۆژدا .

موسوڵمانان بەوبۆنەوە بڕوایان بەوانەی پێشوو هەیە ، باوەڕیشیان بەهەموو بنچینە و بەلقەکانی ئاین هەیە بەبێ جیاوازی بەو جۆرەی خوا فەرمانی پێداوە خوا لەباسیانا ئەفەرموێ:

﴿ والذین آمنوا باللهِ وَرُسُلِهِ وَلَم یفرقوا بین أحدٍ منهم ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە بەخوا و بەنێردراوەکانی خوا و ، جیاوازیان نەخستۆتە نێوان هیچ کەسێ لەفروستادەکانی خوا و باوەڕیان بەهەموویان و بەیەکێتی خواهەیە .

﴿ أولئك یؤتیهم أجورهم وکان الله غفوراً رحیما ﴾ ئەو تاقمە باوەڕیان هێناوە بەخوا و بەهەمو نێردراوەکانی خوا ، خوا ئەبەخشێ بەوان پاداشتی خۆیان لەپاشەڕۆژدا ، ئەو کەسانەیش ئەوانەن پەیڕەوی موحەمەدی کوڕی عەبدوڵایان کردووە و بڕوایان بەهەموو پێغەمەران هەیە کەفەرمویەتی پێغەمەران هەمویان برای یەکن ئاینیان یەکە و هەریەکەیان خاوەنی گەلی تایبەتی خۆیانن ، موحەمەد ﴿ ﷺ﴾ کۆتایی هاوەری هەموو پێغەمەرانە ، گەلەکەیشی لەهەمو گەلانی تر دادپەروەرترین ، خوا خۆش ئەبێ لەوانە پەشیمان ئەبنەوە و گوناهەکانیان دائەپۆشێ ، میهرەباە چاکەکانیان وەرئەگرێ ، لەباسی مانای ئایەتی (١٣٦) ی ئەم سورەتەدا و ئایەتی (٢٨٥) ی ئەلبەقەرەردا ناوەرۆکی مانای ئەو ئایەتە باس کراوە .

جولەکەکانی دانیشتوانی مەدینە بەناڕەوایی لەدژی پێغەمەر ڕاوەستابوون و پیلان و فێڵیان ئەسازان ، یەکەمین پیلانیان بەرپایان کرد ئەوە بو داوایان لەپێغەمەر کرد کەنامەیەکیان بۆ بهێنێ لەئاسمانەوە ، خۆیان بەچاوی خۆیان ببینن ، ئەوەیشیان بەدڵی پیسەوە ئەوت ، نەك بەدڵێکی پاکەوە ، خوای گەورە لەجیاتی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ وەڵامی دانەوە و فەرموی :

يَسْـَٔلُكَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيْهِمْ كِتَٰبًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۚ فَقَدْ سَأَلُوا۟ مُوسَىٰٓ أَكْبَرَ مِن ذَٰلِكَ فَقَالُوٓا۟ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ بِظُلْمِهِمْ ۚ ثُمَّ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ فَعَفَوْنَا عَن ذَٰلِكَ ۚ وَءَاتَيْنَا مُوسَىٰ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴿١٥٣﴾ وَرَفَعْنَا فَوْقَهُمُ ٱلطُّورَ بِمِيثَٰقِهِمْ وَقُلْنَا لَهُمُ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُلْنَا لَهُمْ لَا تَعْدُوا۟ فِى ٱلسَّبْتِ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ﴿١٥٤﴾

﴿ يَسألك أهل الكتاب أن تنزل عليهم كتاباً من السماء ﴾ پرسیار ئەکەن لەتۆ خاوەن نامە جولەکەکان کە تۆ بهێنیتە خوارەوە بەسەرئەواندا لەئاسمانەوە بەیەکجاری وێنەی تەورات نەك کات لەدوای کات بەوێنەی قورئاوێن ، ئەو پرسیارەیان بەتانەوە بوو ، ئەو پرسیارەی ئەوان ئەگەر گران و گەورە بێ لای تۆ ، ئەو کەسانە لەبەر بێ شەرمی خۆیان لەخزمەت خوادا و لەبەر خۆبایی‌ی بونیان بوو کەخوای مەزن ئەمرۆ کوتوپڕ سزای ئەدان، دەستیان دایە بێ فەرمانی خوا کردن بەزۆری و بەبێ گەڕانەوەیان بۆ لای خوا .

﴿ فَقَدْ سألوا موسى أكبر من ذلك ﴾ دوایی بەڕاستی ئەوان پرسیاری لەوە گەورەتریان لەموسا کرد لەوەی لەتۆیان کردووە ، کەواتە تۆ دڵ گران مەبە ، ئەو جولەکانە چۆن باوەڕ بەتۆ ئەهێنن ، ئەو جولەکانە خوانەبێ کەس بەو شتانە نازانێ کەتوشی موسا هاتووە بەهۆی ئەوانەوە . ئەو شتە ناپەسەندانە هەندێکیانە ئەمانەی خوارەوەن .

١- ﴿ فقالوا أرنا الله جهرةً ﴾ دوایی ئەوان بەموسایان ووت : تۆ بەئاشکرا خوامان پێ نیشان بدە ، بەئاشکرایی بەچاوی سەرمان تەماشای بکەین .

﴿ فأخذتهم الصاعقة بظلمهم ﴾ دوایی هەورە گرمەیە بەئاگرەوە لەئاسمانەوە هاتە خوارەوە ئەوانی سوتان و مردن بەهۆی ستەم کردنی خۆیانەوە کە ئەو پرسیارە نەگونجاوەیان لە موسا کرد خوا ببینین لەم ڕۆژەی جیهاندا ، خوای مەزن دوای مردنیان زیندوی کردنەوە کەچی تەمێ خوار نەبون .

٢- ﴿ ثم أتخذوا العجل من بعد ما جاءتهم البينات ﴾ لەپاشا گوێرەکەیان وەرگرت بەخوای خۆیان و پەرستیان ، لە دوای ئەوەی هاتبو بۆ لایان چەندین بەڵگەی ڕوون لەسەر پەرستنی خوا و ڕاستی موسا و پێغەمەرایەتی موسا .

﴿ فعفونا عن ذلك وآتينا موسى سلطاناً مبيناً ﴾ دوایی ئێمە لەتاوانی پەرستنی گوێرەکەکە لەوان خۆشبوین و بەهۆی پەشیمان بونەوەیان لەو تاوانە گەورەیە ، ئەبوایە بەو گوێرەکە پەرستنە بنەبڕبونایە ، بەڵام خوا میهرەبانە ، وەئێمە بەخشیومانە بەموسا بەڵگەیەکی ئاشکرا و بێگومان و بیانویان نەماوە کەکاتێ ئێمە فەرمانمان پێدان بەکوشتنی خۆیان ، بەڵام لای جولەکەکان هەمو شتێ سوکە لایان ، بەهێز نەبی تەمێ خوار نابن بۆیە خوا ئەفەرموێ:

٣- ﴿ وَرَفعنا فوقهم الطور بميثاقهم ﴾ وەئێمە بەرزمان کردەوە بەسەریانا کێوی تور بەهۆی ئەو پەیمانەی خۆیانەوە کەبترسن و فەرمانەکانی تەورات وەربگرن و کاری پێ بکەن و ئەو پەیمانە نەشکێنن کەچی شکاندیان ، لەترسی کەوتنە خوارەوەی ئەو کێوە نەبوایە

پەشیمان نەئەبونەوە لە تاوانەکانیان . کەواتە جێگـەی سەرسوڕمان نیە لـەم سـەردەمەی ئێستادا پەیڕەوی ئاینی ئیسلام نەکەن و گوێ ڕایەڵی موحەمەد نەبن هەروەك پێشوەکانیان.

٤- ﴿ وَقُلنا لهم الباب سجداً ﴾ وەئێمە بەوانمان ووت : لەسەر زمانی یوشەع پێغەمـەر : بچنە نێو شاری (ئیلیا) لەو دەرگایەوە بۆیان دیاری کراوە بەو شێوەیە سـوژدە ببـەن بـۆ خوا سوپاسی بکەن لەسەر ئەوەی لەدەشتی (تەیها) توشیان بوبـو ، کـەچی ئـەوان بـەدژی فەرمانەکەی خوا هەڵسان و بەقونەقونە چونە نێو شار و گاڵتەیان بەفەرمانی خوا کرد.

٥- ﴿ وَقُلنا لهم لا تعتدوا في السبت ﴾ وەئێمـە بـەوانمان ووت : لەسـەر زمـانی داود پێغەمەر : ئێوە دەست درێژی مەکەن و لەسنوری خوا دەرمەچن لەڕۆژی شـەممەدا و ڕاوی ماسی مەکەن ، کەچی فێڵیان سازاندا بۆ ڕاوەماسی لەجگەی ڕۆژانـی پێشـوی شـەممەدا ، ماسیەکانیان کۆ ئەکردەوە لەجێگەیەکی تەنکەبەر لـەڕۆژی شـەممەدا ، بـەڵام دوای ڕۆژی شەممە کۆیان ئەکردنەوە و وایان ئەزانی خوا ئاگادارنیە .

﴿ وأخذنا منهم میثاقـاً غلیظـاً ﴾ وەئێمـەوەرمان گرتبـوو لـەوان پـەیمانێکی ئەسـتور و شایستە بۆ نەشـکاندنی پەیمانـەکانی خـوا کەئێسـتا لەمـەودوا خـوا ئاماژەیـان بـۆ ئـەکا و ئەفەرموێ:

فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ وَكُفْرِهِم بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَقَتْلِهِمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَلْ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥٥﴾ وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ بُهْتَٰنًا عَظِيمًا ﴿١٥٦﴾ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ

رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ ۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٥٨﴾ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾

٦- ﴿ فبما نقضهم ميثاقهم ﴾ دوای بەهۆی شکاندنیانەوە پەیمانەکانی خۆیان ، سزای گەورەمان دان و کردمانن بەمەیمون و لەمیهرەبانی خۆمانمان دورخستنەوە ، چونکە بەیاسای دەستکردیان کەکاری ڕەوایان ئەکرد بەناڕەوا و کاری قەدەغەکراویان ئەکرد بەڕەوا.

٧- ﴿ وكفرهم بآيات الله ﴾ وەبەهۆی باوەڕنەکردنیان بەئایەتەکانی خوا لەتەورات و لە قورئاندا . پێشوەکانیان بەتەورات و ئەوانەی ئێستا بەقورئان کەبەڵگە بوون لەسەر ڕاستی موسا و عیسا و موحەمەد .

٨- ﴿ وقتلهم الأنبياء بغير حق ﴾ وەبەهۆی کوشتنی پێغەمەرەکان بەناڕەوایی وێنەی زەکەریا و یەحیا کەبەڵگەی ئاشکرا هەبون بۆ پێغەمەرایەتی ئەوان ، هەرچەندە کوشتنی پێغەمەران ناڕەوایە بەڵام لای ئەوان ڕەوا بوو .

٩- ﴿ وقولهم قلوبنا غلق ﴾ وەبەهۆی ئەوەی ووتیان : دڵمان داپۆشراوە و بانگ و ئاوازی موحەمەد ناچێتە دڵمانەوە ، پێویستمان بە ز انین و زانیاری موحەمەد نیە ، هەرشتێ ئەو ئەیلێ بڕوامان پێی نیە و بێ سودە لامان .

١٠- ﴿ بَلْ طَبَعَ الله عليها بِكفرهم ﴾ بەڵکو خوا مۆری داوە بەسەر دڵیانا بەهۆی بێ باوەڕیان بەخوا و دڵیان بەگوێرەی سروشت دانەپۆشراوە ، بەڵکو بەهۆی بێ باوەڕیان بە

موحەمەد و بەدرێژەدانیان بــەگومڕایی و بـەیاخی بـوون ، بـەو بۆنـەوە دڵیـان ڕەق بـووە بەوێنەی بەرد و بگرە ڕەق تر و وایان لێ هاتووە خاوەنی دڵی خۆیان نەبن .

﴿ فَلا یؤمنون إلاّ قَلیلاً ﴾ دوایی باوەڕ ناهێنن بەناوەڕۆکی تـەورات مەگـەر کـەمێکیان نەبێ وێنەی عەبدولاّی سەلام و هاوڕێکـانی ، یـا مەگـەر بـاوەڕ بـهێنن بـەباوەڕێکی کـەم بەتەورات و بەموسا بەجۆرێ نرخ بۆ ئەو باوەڕە دانەنرێ .

١١- ﴿ وَبِکُفرهِم وقولهم علی مریم بهتاناً عظیماً ﴾ وەبەهۆی بێ باوەڕیان بەعیسا بەو هەمو بەڵگانەوە لـەسەر ڕاستی و پێغەمەرایەتی عیسا و ، بەهۆی ووتنیـان بـۆ ئـەو بوختانـە گەورەیە دابویان بەسەر مەریەمدا کەگوایا داوێن پیس بووە.

جگەی جولـەکەکان کەسی تر بەر لـەوان ئەو باسە خراپەیان بەرپا نــەکردوە ، جێگـەی سەرسوڕمانە گاورەکان بێ شەرمانە ئەو دوژمنە ناقۆڵای خۆیان پڕ چــەك ئەکـەن بـۆ سـەر قودسی پیرۆز و بەتایبەتی بۆ سەر کلێسا و گۆڕستانی باو باپیریان . بەڵام ئەبێ هەروایشـبێ چونکە بێ باوەڕان لـەدژی موسـوڵمانانا یـەکن ، ئـەوەی گرنگبـێ پێویسـتە موسـوڵمانان خۆیان گێل نەکەن بەگشتی و چاو لـەکار بەدەستانی خۆیان بەناو موسوڵمان نەکەن .

١٢- ﴿ وَقَولِهم إنا قَتَلنا المسیحَ عیسـا ابـن مریـمَ رسُـلَ اللهِ ﴾ وەبـەهۆی ووتنیـان : بەڕاستی ئێمە عیسای کـوڕی مەریـەم فروسـتادەی خوامـان کوشـتوە ، ووشـەی مەسـیح ماناکەی ئەمەیە : کەجبرەئیل دەستی فەڕی خۆی پێدا هێناوە ، بۆیە ئەویش دەسـتی بەسـەر هەر نەخۆشێکا بهێنایە ڕزگاری ئەبو لـەو نەخۆشیە . جولـەکەکان ئــەو ووشـە بەنرخانـەیان بەکار ئەهێنا بۆ عیسا بەپلار و بەگاڵتە و بەتاوانجەوە بوە ، ئەگینا ئەوان بڕوایان بەپیرۆزی و فروستادەیی عیسا نەبووە.

﴿ وَما قَتَلوهُ وَما صَلَبـوهُ وَلکِـن شـبه لَـهُمْ ﴾ وەبـەڵام ئـەوان عیسـایا نەکوشـتوە و ، هەڵیانەواسیوە و ، بەڵام کەجولـەکەکان بڕیاریاندا عیسا بکـوژن خـوا وێنـەی عیسـای دا بەسەر یەکی لـەو تاوانبارانەی شایستەی کوشتن بوو کوشـتیان و هـەڵیان واسـی ، دوایـی خۆیانیان بەسەر کردەوە و هاوڕێکەی خۆیانیان نەدۆزیەوە ، هــاتن بەیـەکا و سـەرگەردان

بوون ، ووتیان : ئەگەر هەڵواسراوە کە عیسابێ ، هاوڕێکەمان کوانێ ، ئەگر ئەویشە ئەی عیسا کوانێ ، بێژراوە ئەو تاوانبارەیە هوزای سەرکردەی پیلانەکەیان بوو .

﴿ وَإنَّ الذين أختلفوا فيه لَفي شكٍ مِنهُ ﴾ وەبەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ ناکۆکیان هەبو لەبارەی ڕووداو و بەسەرهاتی عیسادا بەڕاستی لەگوماندا بوون لەکوشتنی عیسا دا و هەمویان بڕیارەکانیان دژی یەك بوون .

جولەکەکان ئەیان ووت : ئەم هەڵواسراوە بەڕومەت عیسایە و بەلەش هاوڕێکەمانە ، ئەیان ووت: عیسا لەداوێن پیس کەوتۆتە خوارەوە ، گاورەکان ئەلێن : عیسا کوڕی خوایە و سێ‌هەمی سێ خوایە ، جولەکەکان لایان وایە عیسا هەڵواسراوە و لەژێر خاکایە و نایەتەوە . گاورەکان لایان وایە عیسا هەڵواسراوەو لەدوای سێ ڕۆژ هاتۆتەوە بۆ سەر زەوی ، جولەکەکان ئەلێن : ئێمە عیسامان کوشتوە ، گاورەکان ئەلێن : ئەو کوشتنە کەوتۆتە سەر بەشە مرۆڤایەتی‌یەکەی جگەی خوایەتی‌یەکەی . خوای مەزن وەڵامی هەمویان ئەداتەوە و ئەفەرموێ : ئەوانە هەمویان گومانن .

﴿ ما لَهُم بِهِ مِنْ عِلمٍ إلاّ إتباع الظن ﴾ نیە بۆ ئەو کەسانە هیچ بەڵگە و زانستێکی بێ‌گومان مەگەر دواکەوتن و پەیڕەوی کردنی گومان ، گومانیش سودێ نابەخشێ ، ئەو شتەی گومانی تێدا نەبێ ئەمەیە : کە خوا ئەفەرموێ:

﴿ وما قَتلوه يَقيناً بَلْ رَفَعَهُ اللهُ إلَيهِ وَكانَ اللهُ عَزيزاً حَكيماً ﴾ وەجولەکەکان عیسایان نەکوشتوە بەبێ گومان ، بەڵکو خوا بەرزی کردۆتەوە بۆلای جێگەیەکو بۆلای فەرمانی خۆی یا بۆلای ئاسمان .

بۆ زانین : چەندین پرسیار ئەکرێ لەبارەی عیساوە : ئەو بەرز کردنەوەیە چۆن بووە و لە چ کاتێکا بووە ؟ بەر لەهەڵواسینی عیسا بووە بەوێنەکەی یا لەدوواییدا ؟ بەرزکردنەوەکەی بەگیان بووە بەتەنها یا بەگیان و لەش بووە ؟ بەرز کردنەوەکەی بۆ ئاسمانی چوارەم یا ئاسمانێ تر یا بۆ جێگەیە تر بووە ؟ لەو جێگانەدا خەریکی چ شتێکە ؟ ئایا بەر لەڕۆژی دوایی دێتە خوارەوە بۆ سەرزەویی و پیشەی ئەو کاتە چ شتێکە ؟ چەند پرسیاری تریش .

وەڵامی ئەو هەمو پرسیارانە بەجۆرێ جێگەی خۆی بگرێ بەبێ گومان بەم جۆرەی خوارەوەیە :

قورئانی پیرۆز و فەرمودەی پێغەمەر بەجۆرێ بڕیار و بڕوای هەموو موسوڵمانان بێ وەڵامی ئەو پرسیارانەیان بۆ ئێمە ڕوون کردۆتەوەە ، بەهیچ جۆرێ نەلەکۆن و نەلەتازەدا ئەو شتەی ڕاستبێ و بەهیچ جۆری گومان ڕووی تێنەکا : عیسا نەکوژراوە و هەڵنەواسراوە . خوا بەرزی کردۆتەوە بۆ لای خۆی . ئەو کەسەی کوژراوە و هەڵواسراوە وێنەی عیسا بووە نەك عیسا بەگوێرەی گومان و بوختانی جولەکەکان ، جگەی ئەو شتانە هیچ شتێ تریان بۆ ئێمە ڕوون نەکردۆتەوە ، ئەوەی شایستە و شیاو بێ بۆ ئێمە ئەوەیە لەدەقی قورئان دەرنەچین ، مەگەر جگەی قورئان فەرمودەیەکی پێغەمەرمان دەست بکەوێ کەکەس نەتوانێ دژی ڕاوەستێ ، ئێمە بۆ وەڵامی ئەو پرسیارانە بەرپرس نین لەلایەن ئاینەوە ئیتر بۆ ئەبێ خۆمانی بۆ ماندو بکەین . هەرچەندە فەرمودەی تاکی پێغەمەر هەن بۆ هەندێ لەو پرسیارانە ، بەڵام بڕوای بێگومان پەیداناکەن بۆ بنچینەی باوەڕ و ، خوا زۆر بەدەسەڵات و گەورەیە ، هەموشتێ لەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ ، بەتایبەتی بەرزکردنەوەی عیسا و تۆڵە سەندن لەجولەکەکان .

﴿ وَإن من اهل الکتاب إلاّ لیؤمنن به قبل موته ﴾ وەنیە هیچ کەسێ لەخاوەن نامەکان مەگەر بەڕاستی ئەو کەسە باوەڕ ئەهێنێ بەعیسا بەر لەمردنی ئەو کەسە : زانایان مانای ئەو ڕستەیەیان بەجۆرا و جۆر کردووە ئەوەی‌لای زۆربەیان گونجاو بێ ئەو مانایەی پێشوە .

بۆ ڕوون کردنەوەی مانای ئەو ڕستەیە ئەمەیە : ئەو کەسانەی بڕوایان بەعیسا نەبووە بەو جۆرەی خوا ڕوونی کردەوە ، بەردەوامیشبن لەسەر بێ باوەڕی خۆیان ، لایان وابوە عیسایان کوشتوە و هەڵیان واسیوە بەبێ گومان ئەبێ لەمەودوا باوەڕ بەعیسا بهێنن لەکاتی بێ هۆشی سەرەمەرگدا هەرچەندە سوودیان پێ ناگا ، ئەو جولەکانەیش ئەیان ووت : عیسا جادوگەرە و کوڕی ژنێکی داوێن پیسە ، ئەبێ واز لەو بیرو باوەڕە بهێنن و باوەڕ بەعیسا بهێنن کە عیسا فروستادەی خوایە و دایکی داوێن پاك بووە ، ئەو گاورانەیش لایان وابووە عیسا کوڕی خوایە یا سێ‌هەمی سێ خوایە ئەبێ باوەڕ بهێنن کەعیسا بەندەی خوایە و دروست کراوی خوایە نەك خواو کوڕی خوا ، ئەوانە لەسەرەمەرگدا ئەبن .

هەندێ لەزانایان ئەڵێن : ڕاناوی ﴿ بِهِ ، موتِهِ ﴾ هەردوکیان ئەگەڕێنەوە بۆلای عیسا ، ئەو مانایەش لە ئیبنو عەباسەوە وەرگیراوەتەوە . یانێ هەموو خاوەن نامەکان باوەڕ بەعیسا ئەهێنن کاتێ لەئاسمان دێتە خوار لەکۆتایی هاتنی جیهاندا و هەموو کەس ئەبێ بەموسوڵمان.

ناوەرۆکی ئەو مانایانە هەمویان ئەگونجێن و دژی ئاین نین ، چونکە خورپەی دڵ و سروش هەواڵی داوە بەناوەرۆکی زۆربەی ئەو مانایانەی پێشوو ، ئەقڵیش لای گونجاوە ، ئیتر پێویستە لەسەر ئەو کەسانە بڕوایان بەو شتانە هەیە لەبەرچاونین بەوێنەی ڕۆژی دوایی ئەبێ بڕوایشیان بەناوەرۆکی ئەو ئایەتەیش هەبێ .

پرسیار / چ سودێ لەو هەواڵەدا هەیە کە خاوەن نامەکان لەسەرەمەرگدا باوەڕ بەعیسا ئەکەن کە فروستادەی خوایە و نەتوانن ئەو کارانەی لەکیسیان چوە بەسەری بگرنەوە ؟

وەڵام / بۆ ئەوەیە خوای گەورە بەو ئایەتە هانیان ئەدا بەر لەسەرە مەرگ پەلە بکەن و هەوڵ بدەن بۆ ڕاسیت کردنەوەی باوەڕی چەوتی خۆیان هەتا لەو کاتەدا تووشی خەفەت و ئازار نەبن ، ئەبێ بزانرێ هەموو کەسێ لەسەرەمەرگدا جێگەی خۆی ئەبینێ چاك بێ یا خراپ .

﴿ وَيَوم القيامة يكونِ عَلَيهِمْ شهيداً ﴾ وەلەڕۆژی هەڵسانەوەیان لەگۆڕەکان عیسا ئەبێ بەشایەت بەسەریانەوە کە جولەکەکان دوژمنایەتیان کردووە و باوەڕیان پێ نەهێناوە کاتێ خوا ڕەوانەی کردووە بۆ لایان ، گاورەکانیش فەرمودە و دەستوری خوایان شکاندووە و ئەپەڕی خراپەیان کردووە کەعیسایان بەکوڕی خوا یا سێهەمی سێخوا داناوە ، بەبەندەی خوایان دانەناوە.

خوای مەزن لەمەو بەر باسی ڕەفتاری ناپەسەندی بێ باوەڕانی بەگشتی و خاوەن نامەکانی بەتایبەتی کرد ، لەمەودوایش باسی ئەمەمان بۆ ئەکا خوا تەنگیان پێ هەڵئەچنێ و فەرمانی گرانیان ئەدا بەسەردا ، وەك قەدەغە کردنی ئەوشتانە لەوان کەلەوەوبەر ڕەوا بوون کردنیان ، لەڕۆژی دواییشدا ئامادەی کردووە بۆیان سزای خاوەن ئازار و ئەفەرموێ :

فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرًا ﴿١٦٠﴾ وَأَخْذِهِمُ ٱلرِّبَوٰا۟ وَقَدْ نُهُوا۟ عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦١﴾ لَّٰكِنِ ٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ مِنْهُمْ وَٱلْمُؤْمِنُونَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ ۚ وَٱلْمُقِيمِينَ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ وَٱلْمُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ أُو۟لَٰٓئِكَ سَنُؤْتِيهِمْ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٦٢﴾

﴿ فَبِظُلمٍ مِنَ الذينَ هادوا حَرَّمنا عَلَيهِمْ طَيباتٍ اُحِلَتْ لَهُمْ ﴾ دوایی بەهۆی ستەم کردن لەکەسانێکی ئەوتۆ خاوەنی ئاینی جولەکە بون ئێمە قەدەغەمان کردبو لەسەریان چەندین خواردەمەنی پاك و خۆش ڕەواکرابو بۆیان لەباڵندەو گیاندارانی تر ؛ بەیارمەتی خوا لەمەو پاش لەسورەتی ئەلئەنعامدا و لەئایەتی (۲۲) دا ئەو باسە بەدرێژی ئەزانرێ ، ستەمەکانیان بریتی بوون لەوانەی لەئایەتی (۱۵۵) هەتا ئایەتی (۱۵۹) باسیان کرا لەم سورەتەدا .

﴿ وَبِصَدِهِمْ عَنْ سَبيلِ اللهِ كثيراً ﴾ وەبەهۆی قەدەغەکردن و ڕێگە گرتنی زۆر کەس لەڕێگەی ڕاستی ئاینی خوا و پەرستنی خوا ، ناهێڵن هەندێ لەخۆیان و پەیڕەوانی موحەمەد ﴿ ﷺ ﴾ پەرستنی خوا بکەن .

﴿ وَاَخذِهِمْ الرِبا وَقَدْ نَهوا عَنهُ ﴾ وەبەهۆی وەرگرتنیان سود و زۆر تر لەوشتە ئەیاندا بەقەرز ، بەڕاستی ئەوان قەدەغە کرابو لێیان وەرگرتنی لەتەوراتا .

﴿ وأكلِهِمْ أموال الناس بالباطل ﴾ وەبەهۆی خواردنی ئەوان دارایی ئادەمیزاد بەجۆری پووچ و نارەوا بەمفتە خۆری وێنەی بەرتیل و ڕاکێشانی سامانی خەڵکی بۆ لای خۆیان .

لەو ئایەتەوە وا دەرئەکەوێ جولەکەکان یەکەمین کەس بوون یاسای خراپی سودیان دانابێ ، لەسورەتی ئەلبەقەرە و ئایەتی (٢٧٥) و ئایەتی (٢٨٦) بەدرێژی باسی سود و بەکارهێنانی کراوە . بەکورتی بەهۆی هەمو ئەو هۆیانە خوا خواردەمەنی وەك گۆشتی هوشتر و گۆشتی باڵندە و هەمو ئەو چەوریانە لەسەر ئێسك نەبن لەوانی قەدەغە کرد.

﴿ وأعتدنا للكافرين منهم عذاباً أليماً ﴾ وەئێمە ئامادەمان کردۆوە بۆ بێ باوەڕان لەوان سزایەکی خاوەن ئازار.

بۆ زانین: ئەگەر ئێمە بەراوردی ڕەوشتی جولەکەکانی کۆن بەتایبەتی ئەوانەی سەردەمی موسا و عیسا و موحەمەد ﴿ ﷺ﴾ بکەین لەگەڵ ڕەوشت و ڕێگە و شوێنی جولەکەکانی ئێستا هیچ جیاوازی‌یەکمان بەدەست ناکەوێ لەنێوانیاندا ، لەبارەی بێ باوەڕی و گومڕایی و ئاژاوە نانەوە ، بەڕاستی کوڕی باوکی خۆیانن لەوانە و لەدوژمنایەتی مرۆڤایەتی و کاری ناپەسەند و گوێ نەدانیان بەهیچ پەیمانێ مەگەر بترسن بەوێنەی بەرزکردنەوەی کێوی تور لەسەریان ، وامان پیشان ئەدەن کە خراپە کردنی ڕەوشتی نەگۆڕراوە لەنێو جولەکەدا هەرچەندە کات و جێگە گۆڕانی بەسەردا بێت ناگۆڕێن وێنەی دووپشك و پێوەدانی چزەکەی و وێنەی مار لەڕژاندنی ژەهرەکەیدا . (پرۆتۆکۆلاتی حکماء الصهیون ) گەورەترین بەڵگەن لەسەر دوژمنایەتی کردنی مرۆڤایەتی و پەیدا کردنی ڕەوشتی بێزلێکراو بۆ ئادەمیزاد.

بەدەگمەن جولەکە چاکیان لێ هەڵئەکەوێ ، بەگوێرەی تاقیکردنەوە سروشتیان هەر خراپەکردنە ، بەکەمی چاکیان لێ پەیدا ئەبێ ، وەك ئەمانە خوا لەم ئایەتەی دواییدا باسیان ئەکا و ئەفەرموێ:

﴿ لكِنِ الراسِخونَ في العِلمِ مِنهُم ﴾ بەلام ئەو کەسانەی ئەوتۆ بەردەوام و زانای کارامەن لە زانستدا لەجولەکەکان ، گومان ڕویان تێ ناکا و بەزانین و زانستی خۆیان

ئەگەن بۆ سودی خۆیان و بۆ سودی ئـادەمیزاد . بـەلاّم ئـەو کەسـانە نامـەکان ئـەزانن و شارەزای هەمەجۆرەی زانیارین و کاریان پێ ناکـەن لـەناوەرۆکا زانـانین ، ئـەو زانایانـەی کارامەو کار بەزانینی خۆیان ئەکەن وێنەی عەبدوڵای کوڕی سەلام و هاوڕێکانی . کەواتە باوەڕی گەش و زانستی دامەزراو ئەبنە پێشەوا بۆ خاوەنـەکانیان، ئەیانبـەن بـۆلای هـەموو بیروباوەڕێکی ڕاست ، ڕایان ئەکێشێ بۆلای یـەکێتی خـوای مـەزن ، زانیـاری ڕاستەقینە ئەنجامەکەی باوەڕهێنانی ڕاستە ، بۆیە خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ والمؤمنون يؤمنون بِما أنزِلَ إلَيـكَ وما أنـزِلَ مِـنْ قَبْلِـكَ ﴾ وەکەسـانێکی ئـەوتۆیش باوەڕدارن لـەوان و لـەیار و یاوەرانی پێغەمـەر و لـەپـەیڕەوی ئیسـلام باوەڕئـەهێنن بەشـتێ هاتۆتە خوارەوە بۆلای تۆ و بەشتێ نێراوە لـەپێش تۆ لـەقورئان و لـەنامە پێشوەکان . لـەبـەر بەرزی پلەی نوێژ خوا ئەفەرموێ:

﴿ والمقيمـين الصـلاة ﴾ وەمـن خۆشـم ئـەوێ لـەبـەر چاکییـان کەسـانێکی ئـەوتۆ ۆنوێژەکانیان ئەکەن و ڕای ئەوەستێنن بەبێ ناتەواوی.

زانایان بیریان جیاوازە لـەبارەی نووسینی ووشەی ﴿ المقيمين ﴾ هەندێکیان بەو جۆرەیان نوسیوە و ئەڵێن : مەنسوبە بە (أمدح) هـەندێ تریـان نوسـیویانە بـە (المقیمـون ) ئـەڵێن : موبتەدایـە و ڕسـتەی ﴿ أولئـك سنؤتيهم ﴾ خەبـەرە بـۆ ئـەوو بـۆ ﴿ المؤتـون ﴾ و بـۆ ﴿المؤمنون﴾ .

﴿ والمؤتون الزكاة والمؤمنون باللهِ واليوم الآخر سنؤتيهم أجـراً عظيمـاً ﴾ وەکەسـانێکی ئەوتۆ زەکات ئەبەخشن بەهەژاران و ، کەسانێکی ئـەوتۆ یاوەڕیـان هەیـە بـەڕۆژی دوایـی ئەوکەسانە ئێمە ئەبەخشین بەوان پاداشتێکی گەورە .

خوای مەزن کاتێ باسی ئەو جولەکانەی کرد پرسیاریان لـەپێغەمەر کرد نامەیەکیان بـۆ بهێنێ لـەئاسمانەوە ، ئەو پرسیارە بۆ شارەزایی و فێر بوون نەبو ، بۆ پلار و گاڵتـە و توانـج بو ، باسی کردەوە خراپەکانیشی کردن ، بۆیە لـەمەو پاش وەڵامی ئەو پرسیارەیان ئەداتەوە بەڕونی و ئەفەرموێ:

﴿ إِنَّآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ كَمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيْمَٰنَ ۚ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿١٦٣﴾ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَٰهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ ۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾ لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشْهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيْكَ ۖ أَنزَلَهُۥ بِعِلْمِهِۦ ۖ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَشْهَدُونَ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿١٦٦﴾

بەر لەوەی دەست بکەین بەماناکردنی ئایەتەکان بابزانین مانـای ووشـەی ﴿ الوحـي ﴾ چیە ؟

ئەو ووشەیە بە زۆر مانا هاتوە ، ئەوانەی شایانی باسن بۆ ئێمە ئەمانەی خوارەوەن :

١ – هاتوە بەمانای فڕێ دانی مەبەستێ لەلایەن خوای گەورەوە بـۆ نێـو دڵـی هـەندێ ئادەمیزاد و جگەی ئەوەی پێغەمەر بێ بەبێ نوێنەر ، وەك فەرموی بـەدایکی موسـا ﴿ وأوحينا إلى أمْ موسى أنْ أرضعيهِ ﴾ ئێمە خستمانە دڵی دایکـی موسـۆا کـە تـۆ شیر بدە بەموسا ، سورەتی ئەلقەسەس ، ئایەتی (٨)

٢- هاتوە بەمانای فەرماندان لەلایەن خوای مەزنەوە بەهەندێ گیاندار بۆخۆ ئامادەکردنیان بۆ بەجێ هێنانی مەبەستێ لەمەبەستەکان ، وەك خوا ئەفەرموێ بەمێش هەنگ : ﴿ وَأوحى ربُك إلى النحل أن اتخذى من الجبال بيوتاً ﴾ وەپەروەردگاری تۆ فەرمانی نارد بۆلای مێش هەنگ کەدەست بکە و وەربگرە لەکێوەکان چەندین هودەیە و چۆنیەتی ئەو فەرماندانە بۆ ئێمە شی ناکرێتەوە ، هەموو بونەوەران بەرانبەر بەخوا یەکسانن بۆ هەموو کار و وەڵامدانەوەیە .

٣- هاتوە بەمانا فەرمودەی خوا لەگەڵ پێغەمەران ڕاستەوخۆ بەبێ نوێنەر ، یا بەهۆی جبرەئیلەوە ، بەو جۆرە زانراوە لەوکاتانەدا جبرەئیل بچوبایە بۆلای پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەبردنی ئایەتەکانی قورئان پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ دڵی ئەکەوتە پەلە و خورپەوە ، بەجۆرێ پەیوەندی بەبونەوەرانەوە ئەپچڕا و بەهەموو ئەندامەکانی و لەشیەوە خۆی ئامادە ئەکرد بۆ وەرگرتن و فێربوونی ئایەتەکان ، بەجۆرێ ئێمە ناتوانین چۆنێتی ئەو شێوەیە شی بکەینەوە ، ئەم بەشە مەبەستە لەم ئایەتەدا کەئەفەرموێ:

﴿ إنّا أوحَينا إلَيكَ ﴾ بەڕاستی پەیام و سروشمان نارد بۆ لای تۆ بەهۆی جبرەئیلەوە کەقورئانی پیرۆز بخاتە دڵتەوە ، بەهوشیاری و لەکاتی خورپەی دڵتا و تۆیش وەرت گرت.

﴿ كَما أوحَينا إلى نوحٍ ﴾ هەروەك پەیام و سروشمان نارد بۆلای نوح ، هۆی دەست پێ کردنی نوح لەنێو پێغەمەراندا لەبەرئەوەیە دوای ئادەمی باوکی هەموو پێغەمەران یەکەمین پێغەمەرە کە گەلەکەی ئازاریان دابێ و دڵی خۆی بەستبێ بەجێبەجێ کردنی فەرمانی خواوە ، نوح باوکی هەموو پێغەمەرانی پاش خۆیەتی .

﴿ وَالنَبيين مِنْ بَعْدِهِ ﴾ وەسروشیشمان نار بۆلای پێغەمەران لەدوای نوح وەك هود و سالح و شوعەیب.

﴿ وَأوحَينا إلى إبراهيمَ وَإسماعيلَ وَإسحاقَ ﴾ وەئێمە پەیام و سروشمان نارد بۆلای ئیبراهیم و بۆلای ئیسماعیل و ئیسحاقی کوڕانی ئیبراهیم .

﴿ وَيَعقوبَ والأسـباط ﴾ وەبـۆلا ی یـەعقوب و کورِەکانـی کـە (١٢) کـورِ بـون ، ناوبردنی کورِانی یەعقوب لەرِیزیی پەیخاو و سرووشدا بۆلای نێردراوەکانی خـوا وامـان پیشان ئەدا کە ئەوانیش پێغەمەرن .

﴿ وَعيسا وأيوبَ وَيُونس وَهارونَ وَسُلَيمانَ ﴾ وەسروش و پەیخاومان نارد بۆلای عیسـا و ئەیوب و یونس و هارون و سولـەیمان .

ناوبردنی ئەو پێغەمەرانە بەتایبـەتی هەرچـەندە رِستـەی ﴿ والنبيـين مـن بعـده ﴾ ئـەیان گرێتەوە لـەبەر ئەوەیە کەئیبراهیم یەکێکە لـەو پێغەمەرانـە دلّـی خـۆی بەسـتبو بەجێبـەجێ کردنی فەرمانی خوا و خاوەنی کۆشش بووە عیسایش کۆتایی هـاوری پێغەمەرانـە جگـەی موحەمەد ﴿ ﷺ﴾ پێغەمەرەکان بەپێغەمەرە بەرِێز و بەناوبەنگەکانی تـرن و ئـازاری زۆریـان چێشتووە .

﴿ وآتينا داودَ زَبوراً ﴾ وەئێمە بەخشیومانە بەداود نامەیك کە نـاوی زەبـورە ، زەبـور بەمانا نوسراوە ، بریتی بووە لـەسوپاس و باسی خوا و ئامۆژگاری . یاسا و کار و فـەرمانی رەوا و قەدەغەی تێدا نەبووە . داود بەیاسا و دەستوری تـەورات کـاری کـردووە ، پـاش ئەوەی خوا ناوی کۆمەڵێ لەپێغەمەرانی رِوون کردەوە لەئایەتەکانی پێشوودا بـۆ پێغەمـەر، هەروەها بەاسی هەندێکی تر لـەپێغەمەرانی بۆ رِوون ئەکاتەوە کە ئەفەرموێ :

﴿ وَرُسُلاً قَدْ قَصصنا عَليكَ مِنْ قبلُ ﴾ وەئێمە هەواڵ ئەدەین بەتۆ چـەندین فروسـتادەو پێغەمەران ئێمە بەرِاستی ناو و بەسەرهاتی ئـەوانمان گێرِاوەتـەوە بەسـەر تـۆدا لـەپێش ئـەم سـورەتەدا وەك یوسـف و زەکـەریا و یـەحیا و ئەلیەسـەع و لـوت و عوزیـر و جگـەی ئەوانیش.

﴿ وَرُسُلاً لَمْ نَقصصهُ عَلَيك ﴾ وەرِەوانەمان کـرد چـەندین نـێردراوی تـر ئێمـە نـاو و ناونیشانی ئەوانمان نەگێرِاوەتەوە بەسـەر تـۆدا ، خـوای مـەزن ژمـارەی پێغەمـەرانی بـاس نەکردووە ، ئەوەی رِاستی بێ چاك وایە زانینی ژمارەیان هەواڵـەی خـوا بکـەین ، چونکـە

زانایان بیریان جیاوازە دەربارەی ژمارەیان خوای مەزن لەنێو باسی ئەو پێغەمەرانەدا بەناوی خۆیەوە ناوی موسای نەبردووە ، بەتەنها باسێکی بۆ جیا کردۆتەوە ، چونکە لەنێو پێغەمەراندا هەرئەو ڕاستەوخۆ لەگەڵیا فەرمودەی لەگەڵ کروە ، هەرچەندە خوا لەگەڵ هەمویان فەرمودەی کردووە ، بەڵام گفتوگۆی لەگەڵ موسادا شێوەیەکی تایبەتی داوەتێ و لەپشتی پەردەوە گفتوگۆی لەگەڵ کردوە ، ئەو پەردەیە چ جۆرێکە و چۆن وتو وێژ کراوە خوای مەزن ڕونی نەکردوەتەوە، پێویستە ئێمەش باسی نەکەین و بڕوامان پێی هەبێ ، موسا بەهەر شێوەیە خوا ڕێزی داپێتێ پلەی لەڕێزی پێغەمەران کەمتری ناکاتەوە ، مانایشی وانیە لەهەمویان گەورەترە چونکە ڕەوانەکردنی جبرەئیل بۆلای کۆتایی پێ هاوەری پێغەمەران بەڕێزترین پلە و گەورەترین پایەیە بۆی ، لەباسی موسادا خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَكلمَ اللهُ مُوسا تَكليماً ﴾ وەخوا گفتوگۆی کرد لەگەڵ موسادا بەگفتوگۆکردن بەبێ میانجی ، ئەوەیش پلەی بەڕێزە بۆموسا ، ئەو گفتوگۆیە وەك باسمان کرد هەرچۆنێ بووە پێویستە لەسەر ئێمە بەبێ چەند و چوون بڕوامان پێی هەبێ و بەس .

پرسیار / ئایا هەمو پێغەمەران دانیشتوی ڕۆژهەڵاتن و هیچ کامیان ڕۆژئاوایی نین ؟ چین و یابان و وڵاتانی تری ڕۆژهەڵات پێغەمەریان هەبووە یان نەء ؟ ئەگەر هەموو پێغەمەران ڕۆژهەڵاتی بن مانای فەرمودەی خوا کەئەفەرموێ ﴿ ولَقَدْ بَعَثنا في كُلِ اُمةٍ رَسُولاً ﴾ وەبەڕاستی ئێمە ڕەوانەمان کردووە لەنێو هەموو نەتەوەیەکدا فروستادەیە ، دوایی چۆن ئەوبیروڕایە پێك دێ کە خوا واز لەهیچ کەسێ بەبێ سود ناهێنێ ، ئایا ناردنی پێغەمەر تایبەتە بۆ نەتەوەیەك و نەتەوەیە تر بێ بەش بێ؟ بۆ ڕەگەزێکە و ڕەگەزێ تر نەبێ زۆر ڕونە میهرەبانی خوا بۆ هەموو کەسە بەبێ جیاوازی ، واز لەئادەمیزاد ناهێنێ بەبێ سوود بەبەرەڵایی وایش پێویستە خوا بۆ هەمویان پێغەمەرێ بنێرێ بۆ موژدەدان و بۆ ترساندنیان و ئامۆژگاری کردنیان و یارمەتیان بدا هەتا بیانویان نەمێنێ بەسەر خواوە ؟

وەلام/ خاوەنی ئەو بیرو باوەڕە کەئەڵێ : خوا واز لەئادەمیزاد ناهێنێ بەبەڕلایی و پێویستە کەبەڵگەیە دابنێ بەسەریاناوە بەرلەمردنیان و پرسیار و سزادانیان ، دیارە ئەو بیروباوەڕە بیروباوەڕێکی گشتیە بۆ هەمو ئادەمیزاد ، پەیوەندی بەرۆژهەلات و رۆژئاواوە نیە ، پەیوەندی بەرەگەزی سپی و ڕەش و زەرد و سورەوە نیە ، بەڵگە دانان بەناردنی پێغەمەرێکەوە نیە بۆ هەمو شارو گوندێ بۆ هەمو گەلێ . بەڵکو بەڵگە دانان بۆ ئادەمیزاد پەیدا ئەبێ بەناردنی پێغەمەرێ یابەنامەیەکی نێردراو ، یابەدەستورێکی خوایی ڕاوەستاو بێ بەسەر ئەودەستورەوە نوێنەران و جێگە نیشانی پێغەمەر ، بەجۆرێ ئەگەر ئەو پێغەمەرەیش بمرێ بەڵگە هەر بەردەوامە لەنێو ئادەمیزادا ئەگەر ئێمە هەوالّی ناردنی پێغەمەرانمان پێگەیشتبێ کەڕەوانەکرابن بۆ ڕۆژئاواییەکان و بۆ هەندێکیش لەڕۆژهەلاتیەکان ، ئیتر ئەو پێغەمەرانە لەخۆیانن یان نە ؟ مانای وانیە خوا پێغەمەری بۆ ئەوان نەناردبێ هەر لەبەر ئەوەی ئێمە بێ ئاگاین ، دووبارە پێویست ناکا بەڵگە دانان بۆ ڕۆژئاواییەکان پێغەمەران هەر لەخۆیان بن و هەر لەولاتی خۆیانا بن ، بەلام وائەبێ نامەکەی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوایش ئەگرێتەوە بەبێ جیاوازی ، بەهۆی جێگەنشین و نوێنەرانی ئەو پێغەمەرەوە ، یا بەهۆی نوێنەری خۆیانەوە ئەو پەیام و نامەیان پێ گەیشتبێ . بۆ سەلماندنی ئەو مەبەستە خوا ئەفەرموێ: ﴿ وَما أرسَلناكَ إلاّ كافةً لِلناسِ بَشيراً وَنذيراً ﴾ وەئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە مەگەر بۆ هەموو ئادەمیزاد ، موژدە بدە بەپیاو چاکان و پیاو خراپان بترسێنە .

بۆ وەلامدانەوەی بەشێ تر لەوپرسیارە لەنامە هەرە کۆنەکاندا کە ئەوپەڕی کۆنایەتیان هەیە هەوالّیان داوە بەناردن و پامی موحەمەد ﴿ ﷺ﴾ کەهەموو بونەوەران ئەگرێتەوە و میهرەبانیە بۆ هەموان ، هەر لەو نامە کۆنانەدا هەیە کەبەئاشکرا ناوی ئەبولەهەبیان هێناوە کەدوژمنی موحەمەدە.

بۆنمونە: ( عەبدولحەق فدریاتی) لەنامەی ( محمدٌ في الأسفار الدينية العالمية ) کەلەچاپ دراوە بەزمانی ئینگلیزی و (عەقاد) وەری گێڕاوە بۆلای عەرەبی لەنامەی ( العبقريات

الإسلامية ) بەناونیشانی ( الطوالع والنبوات ) لەنامەکانی (بەراهیمەکاندا، بەڕاستی لەبڕگەی (٦) و بڕگەی (٨) لەبەرگی دوودا : بەڕاستی ناوی فروستادەی عەرەب نوسراوە بەزمانی عەرەبی و بەناوی (ئەحمەد) لەنێونامەی (سامافیدا) کەنامەی (بەراهیمەکانە) هاتوە : ( بەڕاستی ئەحمەد دەستوری لەپەروەردگاری خۆیەوە وەرگرتووە ، ئەو دەستورەیش پڕە لەشتێ کەلەجێگەی شیاوی خۆیا دانراوە ، هەروەها هاتووە ئەڵێ : شێوەی (کەعبە) ی پیرۆز لەنامەی (الآثارفافیدا ) دا نوسراوە ، لەنامەی (زند ئافستا) کە ناوی دەرکردوە بەنامەی پیرۆزی مەجوسیەکان : هاتووە هەواڵی پێغەمەرێ کەباسی کردووە بەوە کەمیهرەبانیەکەی بۆ هەموو بونەوەرانەو بانگیان ئەکا بۆلای یەکێتی خوایە کەبێ وێنەیە ، دوژمنێکی بەرەنگاری ئەکا بەناوی ئەبولەهەب.

ناگونجێ ئەو هەولدانانە لەجگەی دروستکەری هەموو بونەوەرانەوە دەرچوبێ . بەڕاستی ئەبێ ئەو هەواڵانە پەی خاو و سرووش بێ بۆ لای پێغەمەرێ لەپێغەمەران بڕوا بکا بەپێغەمەرایەتی پێغەمەرێ بەهەزاران یا بەدەیان ساڵ پاش خۆی پەیدا بووبێ و ناوی ئەحمەد بێ و داوای پەرستنی خوای تاك و تەنها بکا و دوژمنەکەی ناوی ئەبولەهەب بێ .

ئەو هەولدانانە بەلگەی ڕوون لەسەر دووشت :

(١)ڕاستی موحەمەد ﴿ ﷺ ﴾ لەپێغەمەرایەتی خۆیا .

(٢)بەڕاستی لەڕابوردوی زۆرکۆندا خوای مەزنپێغەمەرانی تری ڕەوانە کردووە و ئێمە ناویانمان نەبیستوەو خوا ناویانی بۆ نەبردوین .

کەواتە خاوەنی خوێندن و بیستن هەرکاتێ ناوی زانایەکی گەورەی بینی لەنامەیەکدا ، ناوەکەی بیست لەو نامەیەدا لەوانەیە ئەو زانا بەسودە پێغەمەزێ بوبێ ، دەستور و یاساکانی هەمویان یا زۆریان گۆڕابن و دەست کاری کرابن ، ئەوانە هەمویان لەژێر ڕوناکی مانای بەربلاوی پیرۆزی فەرمودەی خوابن کەئەفەرموێ : ﴿ وَرُسُلاً لَمْ نَقصصهم عَلَيك ﴾ لەوانەیە ئەو هەموو زانایانە خاوەنی سوود بن و ناویان بەچاکە براوە بەر لەپێغەمەر ، ناوەرۆکی ئەو ڕستەیە بیبان گرێتەوە .

پرسیار / بۆچی خوا لێرەدا باسی ئەقڵی نەکردوە لەگەڵ ئەو یاسایانەی پێشوودا ، لەگەڵ ئەوەیشدا خوای مەزن وەك پێغەمەری کردووە بەبەڵگەی خوا ناسین بەهۆی پەیام و سروشەوە ، هەروەها ئەقڵیشی کردووەبەبەڵگە ؟

وەڵام / بەڕاستی ئەقڵ بەبێ گومان ئەبێ بەبەڵگە ، بەڵام تەنها بۆناسینی بونی خوای مەزنە ، بۆ ناسینی ڕۆژیی دوایی و ئەو شتانەی لەبەرچاونین و ناسینی ئەو کارانەی پێویستن و ڕەوان و ئەوکارانەی قەدەغە کراون پێویستیان بەئامۆژگاری کەرێ هەیە ڕانموییی ئادەمیزاد بکا و ڕێگەی ڕاستیان بۆ دەست نیشان بکا ، کەواتە پیشە و فەرمانی ئەقڵ لەو ڕاوگەدا ئێمە لەباسیداین ئەوەیە بیزانێ و وەری ئەگرێ لەپێغەمەرەوە لەپێویستیەکانی باوەڕوهێنان و لەبەڵگەکانی شارەزایی کردن بۆلای چاکەی هەردوو جیهان ، هەرکاتێ ئەوانەی لەپێغەمەرەوە زانی بڕیاری خۆی ئەدا و بڕوای پێ ئەکا بەبێ گومان و سەرپێچی کردن و بڕوا بەپێغەمەرو فەرمودەکانی ئەکا ، پێغمەرانی بۆ دەستیشان ناکرێ یەکەم جار .

﴿ رُسُلاً مُبَشرينَ وَمنذرين ﴾ وەئێمە ڕەوانەمان کردووە چەندین نێردراو هەندێکیان ناویان نەبراوە و هەندێکیان ناویان براوە ، دادپەروەر و مژدەدەرن بەبەندەکانی خوا بەبەهەشت ، بێ باوڕان ئەترسێنن بەدۆزەخ و بەسزادانیان .

﴿ لَئلا يَكونَ لِلناسِ عَلى اللهِ حجّة بعدَ الرّسل ﴾ لەبەرئەوەی نەبێ بەسەر خواوە بۆ ئادەمیزاد بەڵگەیە لەدوای ڕەوانەکردنی نێردراوەکان و بیانویان نەمێنێ .

زانایان ئەڵێن : سزادانی ئادەمیزاد بەبێ ڕوونکردنەوەی هۆکەی نابێ و ناگونجێ ، یاسا دەستکردەکانیش ئەڵێن : بەبێ دەربڕینی دەقی یاسا سزا ناسەپێ بەسەر تاوانباراندا ، ئەوانە ئاشکران خۆیان لەخۆیانا پێویستیان بەبەڵگە نامێنێ : بەڵکو ئەوانە خۆیان ئەبنە بەڵگە لەسەر جگەی خۆیاژن .

هەرکاتێ زانرا خوا ئادەمیزاد بەرەڵا ناکا لەکردوەو کاریانا بەبێ لێ پرسینەوە لەوان ، فەرمانیان پێ ئەدا بە چاکەکردن و خراپەیان لێ قەدەغە ئەکاو پێویستە ئەوانەیشیان پێ بگا

هەتا بیانویان نەمێنێ ئەگەر دژی ئەوشتانە هەڵسان . ئەگەر پێیان نەگا دیارە خاوەنی بەڵگەن لەو شتانەدا بەهۆی پەیامی دڵ و سروشەوە بۆ پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ کە بۆ پێغەمبەر هاتوون ، هەرکاتێ زانرا پێغەمبەران نوێنەرن لەنێوان خوا و ئادەمیزادا بۆ گەیاندنی فەرمان و موژدەدان و هەڕەشە لێ کردنیان ئەیشزانرێ ناردنی پێغەمبەران پێویستە بۆ ئەو مەبەستانە هەتا ڕێگەی ، بیانویان نەمێنێ ، خوای مەزن لەسورەتی (تاها) ئەم باسەمانی بۆ ڕوون کردوەتەوە.

﴿ وَكَانَ اللّهُ عَزِيزاً حَكِيماً ﴾ وەخوا زۆرگەورەیە و بەسەر هەموو شتێکا زاڵ ئەبێ ، هەر خوا دروست کەر و لەناوبەری هەموو بونەوەرانە ، هەموو شتێ لەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ ، بەتایبەتی ناردنی پێغەمبەران و هاتنە خوارەوەی نامە پیرۆزەکانی خوا .

پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ پرسیاری کرد لە جولەکەکان : ئێوە شایەتی ئەدەن کە من ناوم براوە لەنامەکانتانا ؟ ووتیان: شایەتی نادەین و نازانین کەسێ تر پەیام و سرووشی بۆ هاتبێ پاش موسا ، بت پەرستەکانیش ئەبان ووت بەپێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئێمە پرسیاری تۆمان کردووە لەجوولەکەکان لەبارەی ناوبردنی تۆ لەنامەکانیاندا گومانیان وایە تۆ ناناسن ، خوای مەزن فەرموی بەپێغەمبەر ئەگەر ئەوان شایەتیشت بۆ نەدەن خوا شایەتیت بۆ ئەدا و ئەفەرموێ:

﴿ لكِنِ اللّهُ يَشهدُ بَما أنْزَلَ إلَيكَ أنز له بِعِلمِهِ ﴾ بەڵام خوا شایەتی ئەدا بەشتێ ناردویێتی بۆ لای تۆ کە ئەو قورئانە سەرشۆڕکەری ئادەمیزادە بەڵگەی ڕوون و گەورەیە بۆ پێغەمبەرایەتی تۆ ، خوا ناردویەتیە خوارەوە بەهۆی زانیاری تایبەتی بێ وێنەی خۆی ، هەر خۆی ئەزانێ چۆنی دارشتووە و ڕێکی خستوە بەشێوەیە بەهەموو زانایانی زمان پاراوی ڕووی ئەم زەوی‌یە داماون و پەکیان کەوتوە و ناتوانن لەبەردەمیدا ڕاوەستن .

﴿ وَالملائكة يَشهَدون وَكَفى باللهِ شهيداً ﴾ وەفریشتەکانیش شایەتی ئەدەن لەسەر پێغەمبەرایەتی تۆ و ڕاستی نامە پیرۆزەکەت ، فریشتەکان بەبێ بەڵگە شایەتی ئەدەن ، ئێوەی ئادەمیزادیش دوای بیرکردنەوە لەبەڵگە باوەڕ بهێنن و شایەتی بدەن بەو شتە هاتۆتە

خوارەوە بۆ سەر پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ و ، بەسە خوا بۆ شایەتی دان لەسەر ئەو بەڵگانە دای ناون لەسەر ڕاستی تۆ و پێغەمەرایەتیت ، کەواتە پێویستە شایەتی خوا بۆ تۆ بەس بێت .

شایەتی دان دوو جۆرە : شایەتی دان بەزمان : ئەم بەشەیان جێگەی گومان و باوەڕ پێ کردنە ، لەهەندێ جاردا ، شایەتی دانە بەکردەوەو بەکار : وەك شایەتی دان لەسەر دروست کەری خوا و توانای خوا ، شایەتی دانی بەخشندەیی بەسەخاوەتی خاوەن بەخشش ، شەهادەتی دان لەسەر پەلاماردانی مرۆڤێ بەئازاییەکەی بۆ سەر دوژمن ، ئەم بەشەیان بەهێز تر و بەڵگەدار ترە لە شایەتی بەزمان کەلەوانەیە گومان ڕوی تێ بکا .

هەندێك لەشایەتی دان بەکار و کردەوە شایەتی دانی خوا بۆ موحەمەد ﴿ ﷺ ﴾ کە کردوێتی بەخاوەنی چەندین بەڵگە و کاری بەهەموو کەس نەکراو لەسەر ڕاستی ئەو ، هەندێ تریان شایەتی دانی قورئانە بۆ پێغەمەر بەوەی قورئان لەزانیاریەکانی خوایە و زانیاری بونەوەران نیە بێ بەنیشانە بۆ چەندین هەڵە ، بێگومان شایەتی دانی فریشتەکانیش پاشکۆی شایەتی خوان و پێویست بەشایەتی دانی تر ناکات .

هەموو کەسێ پێی خۆشە ئادەمیزاد بڕوا بەگفتوگۆی بکەن ، بەڵام مرۆڤی ژیر لای گرنگ نیە بەدرۆی بخەنەوە بەمەرجێ خۆی بڕوای بەڕاستی خۆی هەبێ ، هەرئەوەیشە مەبەستی خوا لەو ئایەتەدا ، واتە خوا ئەفەرموێ بەپێغەمەر خۆی : گرنگ نەبێ بەلای تۆوە کەسێ پێغەمەرایەتی تۆ بەدرۆ بخاتەوە و واز لە ئاینی تۆ بهێنێ بەو مەرجەی تۆ ڕاست ئەکەی ، بڕوات بەڕاستی خۆت هەبێ .

بێ باوەڕان بەتەنها ستەم کردنیان بریتی نیە لەوە هاوبەش دانێن بۆ خوا ، بەڵکو ستەمیان لەخۆیان و لەئادەمیزادیش کردووە ، ستەمیان لەڕاستی کردووە ، لەگەڵ ئەوانەیشدا ستەمی گەورەتریان کردوە بەڕێگە گرتن لە خۆیان و هەندێ کەسی تر لەو ڕێگەیە ئەیانبا بۆلای ئاینی خوا ، کەواتە ئەو بێ باوەڕانە چونەتە خوارەوە لەبێ باوەڕیدا ، چونەتە خواروە لەستەمدا ، گومڕان لەجیهاندا و لەپاشەڕۆژدا ، بە شێوەیە چاوەڕوانی ناکری بگەڕێنەوە بۆ لای ڕانموییی ، بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو مەبەستە خوا ئەفەرموێ :

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ قَدْ ضَلُّواْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١٦٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَظَلَمُواْ لَمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ طَرِيقًا ﴿١٦٨﴾ إِلَّا طَرِيقَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿١٦٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلرَّسُولُ بِٱلْحَقِّ مِن رَّبِّكُمْ فَـَٔامِنُواْ خَيْرًا لَّكُمْۚ وَإِن تَكْفُرُواْ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٧٠﴾

﴿ إنَّ الذين كَفَروا وَصدوا عن سبيل الله ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە بەپێغەمەرایەتی تۆ لەجولەکەکان و ڕێگەیان گرتووە لەئادەمیزاد لەڕێگەی ڕاستی خوا ئەڵێن بەعەرەبەکان باسی موحەمەد لە نامەکانی ئێمەدا نەکراوە و موحەمەد درۆ ئەکا .

﴿ قَدْ ضَلو ضِلالاً بَعيداً ﴾ بەڕاستی لایانداوە لەڕێسگەی ڕاستی و خۆیانیان گومڕا کردووە بەگومڕایەکی دوور و درێژو ناگەنە کۆتایی و جگەی خۆیشیان گومڕا کردووە و گومان ئەخەنە دەرونیانەوە .

﴿ إنَ الذينَ كَفَروا وظلموا لَم يَكُنْ الله ليغفر لَهُمْ وَلا ليهديهم طريقاً ﴾ بەڕاستی کەسانێ باوەڕیان نەهێناوە بەپێغەمەر و ناویان شاردۆتەوە ، ستەمیان لەخۆیان کردوە، بەدژی پێغەمەرایەتی تۆ هەڵساون و ڕێگەیان لەجگەی خۆیان بەستوە ، خوا لەو کەسانە خۆش نابێ ، و ڕانموییان ناکا بۆلای هیچ ڕێگەیە لەڕێگەکان ڕزگاریان بکا لەئاگر ئەگەر بەردەوامبن لەسەر گومڕایی خۆیان ، ڕێگە وەرناگرن .

﴿ إلاّ طَرِيقَ جَهَنَمَ خالدينَ فيها أبداً ﴾ مەگەر بـۆ لای ڕێگـەی دۆزەخ بـەردەوام ئـەبن لەنێو دۆزەخدا هەتا هەتایەو بەهەمیشەیی ، چونکە ئەو کەسانە ڕێگەی گومڕاییان گرتـوە و لەڕێگەی گومرایی لایان نەداوە ، هەرچەندە ترسێنراون لـەلایەن خواوە . ووشەی ( أبـداً ) یانی بەهەمیشەیی بۆ ئەوەیە نەوەك گومان ببرێ کەوشەی (خالـدين ) بۆئەوەیە زۆر بێ نـەك هەمیشەیی .

﴿ وَكانَ ذلِكَ على اللهِ يَسيراً ﴾ وەئـەو فەرماندانـەی خوا بـۆ مانـەوەیان لـەدۆزەخدا بەهەمیشە لەسەر خوا ئاسانە بەگـەورە و گرنـگ نـەزانرێ ، ئـەو ڕسـتەیە بـۆ دەم کـوت کردنەوەی ئەو کەسانەیە گومانیان وایە ئەیان ووت : ئێمە کوڕی خوایـن و دۆسـتی‌خواین گران نیە بۆی سزای خۆشەویستانی خۆی نەدا .

هەندێ لەزانایان لایان وایە ئایەتی یەکەم تایبەتە بۆ جولەکەکان ، ئایەتی دووهەم بۆ بت پەرستانە بەتایبەتی ، بەڕاستی جولەکەکان ڕێگەیان ئـەگرت لەموسـولمانان بەپـەیداکردنی گومان لەدەروندا . بت پەرستان ڕێگەیان لێ ئەگرتن بەستەم کردن ئەوەبو جەنگیان بـەرپا کرد لەدژی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بەبەردەوامی جار لەپاش جار .

خوای گەورە وەڵامی جولەکەکانی دایەوە بەچـەندین جۆرێکـی زۆر بەبلاوکردنـەوەی خراپەی خۆیان و ڕونیان ئەکردەوە ، لەپاشا ڕوو ئەکاتە هەموو ئادەمیزاد بەگشتی کە ئـەو جولەکان و جگەی ئەوانیش ئەگرێتەوە لەبانگ کردنیان بۆ لای موحەمەد لەهەموو کـات و جێگەیەکدا ، بەتایبەتی باسی ناردنی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ ئەفەرموێ:

﴿ يا أيها الناس قَدْ جاءَكُم الرسول بالحق من ربكم ﴾ ئەی ئادەمیزاد بەڕاسـتی هـاتووە بۆلای ئێوە فروستادەیە بەئاینی ڕاسـتەوە لـەلای پەروەردەکـەری خۆتانـەوە بەشـایەتی دان بەڕاستی ئەو قورئانە کەسەرشۆڕکەری زمانیانە ، ڕاست و دروسـتە و بـانگی ئەندامـەکانی خۆی ئەکا بۆ لای خوا و واز هێنان لەجگەی خوا ، ئەقلیش ئەزانێ ڕاسـتە ئەگـەر بخرێتـە کار .

﴿ فآمِنوا خَيرٌ لَكُم ﴾ دوایی پێویستە ئێوە باوەڕ بهێنن چاکترە بۆ ئێوە باوەڕهێنانتان لەئەنجامی ڕۆژی باوەڕنەهێنانتان ، کەواتە هەرکەسێ خوا پەرستنی پێ ببەخشێ ئەو کەسانە نزیکی خوان ن هەرکەسێ باوەڕ بەخوا نەهێنی خوا پێویستی بەهیچ کەسێ نیە بۆیە ئەفەرموێ :

﴿ وَإِنْ تَكفروا فَإِنَّ للهِ ما في السماواتِ وَالأرضِ وَكانَ اللهُ عَليماً حَكيماً ﴾ وەئەگەر باوەڕ نەهێنن دوایی بەڕاستی بۆ خوایە شتێ لەئاسمانەکان و زەویدان ، بێ باوەڕی ئێوە زیان بەخوا نابەخشێ ، هەروەژك باوەڕهێنانتان سودی پێ ناگەیەنێ و ، خوا ئەزانێ بەهەموو بەسەرهاتی بونەوەران و ئەو شتانە لەدەرونیایە ، هەموو شتێ لەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ ، تەماشای باوەڕداران و بێ باوەڕان وەك یەك ناکا .

خوای مەزن کەوەڵامی جولەکانی دایەوە ، لەمەو دوایش ڕوو ئەکاتە گاورەکان و وەڵامیان ئەداتەوە کەعیسا بەرز ئەکەنەوە بۆ پلەی خوایەتی ، لەگەڵ وەڵامی جولەکەکان کە ئەڵێن : عیسا لەداوێن پیس پەیدا بووە ، خوا ڕێگەی ڕاست نیشان ئەدا بەموسوڵمانان و ئە فەرموێ :

يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۖ وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌۚ ٱنتَهُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٞۘ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ﴿١٧١﴾ لَّن يَسۡتَنكِفَ

ٱلْمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبْدًا لِّلَّهِ وَلَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ۚ وَمَن يَسْتَنكِفْ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيَسْتَكْبِرْ فَسَيَحْشُرُهُمْ إِلَيْهِ جَمِيعًا ﴿١٧٢﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ ۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْتَنكَفُوا۟ وَٱسْتَكْبَرُوا۟ فَيُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٧٣﴾

﴿ ياأهلَ الكِتاب لا تَغلوا في دينكم ﴾ ئەی خاوەن نامەکان بەجولەکەو بەگاورتانەوە لەسنوری ئاینی ڕاستی خۆتان دەرمەچن ، جولەکەکان ئەلێن : عوزەیر کوڕی خوایە و عیسا کوڕی ژنێکی داوێن پیسە ! گاورەکان ئەلێن : عیسا کوڕی خوایە و سێهەمی سێ خوایە !! .

﴿ وَلا تَقولوا على الله إلاّ الحق ﴾ وهیچ کەسێ لەئێوە مەلێن ، خوا هاوبەش و کوڕی هەیە . باسی عیسا بەوە مەکەن عیسا چۆتە ناو خواوە و بوون بەیەك لەنێو لەشی خوادا ، عیسا بەڕاستی فروستادەی خوایە ، ئەوەی ڕاستی بێ نەعیسا کوڕی خوایە و نەسێهەمی سێ خوایە ، عوزەیر کوڕی خوا نیە .

﴿ إنّما المسيح عيسى ابن مريمَ رسُولُ الله ﴾ بەڕاستی عیسای کوڕی مەریەم نێردراوی‌خوایە و جگەی فروستادەی خوانیە. ووشەی (مریم ) بەمانا پەرستەرە ، عیسا کەدراوەتە پاڵ مریم نیشانەی ئەوەیە بێ باوکە ، هەمو کەسیش بەناوی دایکەوە بانگیان ئەکرێ ، هەر لەبەر ئەوەیشە لەسەر گۆڕی مردوو بەناوی دایکەوە بانگ ئەکرێن لەکاتی تەلقیندا .

﴿ وَكَلِمَتُهُ أَلقاها إلى مَرْيَمَ وَروحٌ مِنهُ ﴾ وەعیسا ووشـە و فـەرمودە و مـوژدەی خوایـە هاتوەتە بونەوە بەڕستەی ( كُنْ ) یانێ تۆ بە ، بەسەر بەخۆ بەهۆی شتێ هییچ ترەوە نەبوە و بەبێ باوك و بەبێ تۆوی باوكەوە بووە ، بـەهۆی فویـەكی جبرەئیلـەوە ، وەعیسـا خـاوەن گیانێكە لـەلایەن خواوە دروست بووەو بـەبێ هـۆی تـر و بەجگـەی خوایـێ تـر ، گیـانی عیسـایش گیانێكـە وەك گیانـەكانی تـر دروسـت كـراوی خوایـە ، بـەلام مانـای ئایـەتی ﴿ فأرسَلنا إلَيها روحَنا ﴾ یانێ دوایی ئێمەناردومانە بۆلای مەریەم خاوەن گیانێكی پـیرۆزی ئێمە كەجبرەئیلە .

خوای مەزن ڕوی بێ وێنەی خۆی ئەكاتە گاورەكان بەتایبەتی و ئەفەرموێ :

﴿ فَآمِنوا بِاللهِ وَرُسُلِهِ وَلا تَقولوا ثلاثة ﴾ دوایی ئێوە باوەڕ بهێنن بەخواو هەر ئەو بـەخوا دابنێن ، باوەڕیش بەفروستادەكانی خـوا بـهێنن هـەمویان فروسـتادەی خـوان و عیسـایش یەكێكە لـەوان ، لایان مەدەن لـەسروشتی خۆیان و دایان مەنێن بەخوا و ئێوە مەڵێن : عیسا سێهەمی سێ خوان ، هەندێ لـەگاورەكان ئەڵێن : سێ خوا هەن : خوا ، عیسا ، مەریـەم ، هەندێ تریان ئەڵێن : خواكان پێـك هـاتون لـەسـێ كـەس : كـوڕ بـاوك ڕوحولقـودس ، بەجۆرێ تر ئەڵێن : بوون كە خوایە ، زانیاری كە عیسایە ، زیندەیی كە جبرەئیلە .

﴿ إنتَهوا خَيراً لَكُمْ إنما اللهُ إلهٌ واحدٌ ﴾ ئێوە واز بـهێنن لـەوەی خـوا بەسـێ دابنێـن و وازهێنان چاكترە بۆ ئێوە لـەوەی خوا بەسێ خوا دابنێن ، خوای مـەزن بۆبـە بـەهێزكردنی یەكێتی خۆی ئەفەرموێ : بەڕاسـتی نیـە هیـچ خوایـە مەگـەر خوایـەكی تەنـها كەشـایانی پەرستنبێ ، خوا یەكە و زۆر تر لـەخوایە بەهیچ جۆرێ ناگونجێ و ڕەوا ینە ، خـوای مـەزن بۆ لـەمەو پاش خۆی پاك ئەكاتەوە لـەوەی كوڕی هەبێ و ئەفەرموێ :

﴿ سبحانه أن يكون له ولدٌ له ما في السماوات وما في الأرض وكفى باللهِ وكيلاً ﴾ پـاك و خاوێنە خوا كە بۆ خوا هەبێ منالْ ، چونكە ئەگەر منالێ هەبێ ئەبێ خـوا وێنـەی هـەبێ نەبون ڕووی تێ بكا ، ئاشكرایە زاوزێ بۆ مانەوەی ڕەگەزە لـەبنەبڕ نەبوون . خوای مـەزن

لەهەر جێگەیەکا خۆی پاك بکاتەوە لەمناڵ بوون ، دوایی بەو باسە خۆی ئەکا بەخاوەن و پاشای هەموو بونەوەران و ئەفەرموێ : بۆ خوایە شتێ لەئاسمانەکاندا و لەزەویدان ، هەمویان دروست کراوی خوان ، دروست کراوی وەك عیسا چۆن ئەبی وێنەی دروست کەری خۆی بێ کەخوایە ، مناڵ ئەبێ وێنەی باوکی خۆی بێ ، ئەگەر وایشبی ئەبێ ئەو شتانە لەئاسمان و زەویدان مناڵی خوابن بەبێ جیاوازی و جیا کردنەوەی عیسا لەناویاندا و بەسە خوا بەکاربەدەست بۆ بونەوەران و بەندەکانی خۆی لەکاتی ڕووداوی گرنگدا کاریان بسازێنێ خوا پێویستی بەکەس و کوڕ نیە .

ئەوشتەی خوای مەزن لەو ئایەتەی پێشوودا باسی کرد سروشتی ڕاستی عیسایە و بیرو باوەڕی موسوڵمانانە بەگوێرەی فەرمودەی خوا ، عیسا بەفروستادەی خوا ئەزانن بەبێ جیاوازی وەك ئیبراهیم و موسا و موحەمەد و پێغەمەرانی تر . لێرەدا گاورەکان ئەم پرسیارەر ئەکەن وئەڵێن :

پرسیار/ چۆن عیسا ئەبێ وەك پێغەمەرانی تر وابێ ؟ ئەوان هەمویان خاوەنی باوکن ، عیسا بێ باوکە ، دام و نەریتی خوا تێك و پێك نادرێ و ئەبێ عیسایش باوکی هەبێ ؟

وەڵام / خوای مەزن وەڵامی ئەو پرسیارە بەکورت ترین و گرنگترین وەڵام ئەداتەوە و ئەفەرموێ : عیسا ووشە و مـوژدەی خوایە و گەیاندوێتی بەمەریەم و گیانێکە لەلایەن خواوەداویە ، بەعیسا ، داواکاری گاورەکان کە ئەڵێن : عیسا بەبێ باوك پەیدا بووە ، بەسەر نەریتابازی داوی ئەوەی ئەوان ئەیلێن ، زۆر ڕاستە و بەجێن .

بەڵام هەڵەی ئەوان لەوەدایە ئەڵێن : ئەو جیاوازیە بەڵگەی خوایەتی عیسایە ، ئەوەیش هەڵەیەکی یەکجار گەورەیە و ناقۆلا ، چونکە ئەگەر بێ باوکی بەڵگەی خوایەتی بێ . ئەبێ ئادەم شایانتربێ بۆ خوایەتی لە عیسا ، بەو بۆنەوە ئادەم بێ باوك و بێ دایکیشە. بازدان بەسەر دام و نەریتا گرنگ نیە ، بەڕاستی ئاگر بۆ ئیبراهیم سارد بویەوە بەدژی سروشتی خۆی ، کەواتە ئیبراهیم ئەبوایە خوابێ . ئەمەیش بەسە لەهیچەوە بێ هیچ شتێ

ئەو بونەوەر سەرسوڕێنەرە خوا بۆی گران نیە بەووشەی (ببە) لەدایکەوە بێ باوك بەبێ تۆوێ عیسا دروست بکا . دروست کردنی عیسا گەورەترنیە لەدروست بونەوەران بەتایبەتی دروست کردنی ئادەم بەبێ باوك و بەبێ دایك .. گاورەکان و پاپاکان ئەیانەوێ نەخوێنەواران بخەڵەتێنن و ئەڵێن : ئەوە نیە خوا ئەفەرموێ : ﴿ وَرووْحٌ مِنهُ ﴾ بەگوێرەی مەبەستی خۆیان مانای ئەکەن وئەڵێن : وەگیانێکە لەخواوە . بەڵام لەپاش و پێشی ئەو ڕستەیە وورد نابنەوە کە لەپێشەوە ئەفەرموێ : ئێوە دەرمەچن لە سنووری خوا و ئاین لەبارەی عیساوە ، لەدواییشەوە ئەفەرموێ : مەڵێن عیسا سێهەمی سێ خوایە .

ئەگەر ئێوەی گاور ووشەی ( مِنهُ ) ئەکەن بەبەڵگە لەسەر خوایێتی عیسا ئەبێ ئەو شتانە لە ئاسمان و لە زەویدان هەموو خوابن. چونکە خوا ئەفەرموێ (وسخّو لکم ما في السّماواتِ وَما في الأرْضِ جَمِيعاً مِنْهُ) وەخوا ڕامی کردووە بۆ ئێوە شتێ لە ئاسمانەکان و شتێ لە زەویدان هەمووان لە خواوەن

نوێنەرانی گاورەکانی تەجران ووتیان بە پێغەمەر﴿ﷺ﴾ تۆ بۆچی هاوڕێی ئێمە شورەی داری ئەکەین؟ پێغەمەر﴿ ﷺ﴾ چ کەسێکە هاوڕێی ئێوە ووتیان: عیسایە، پێغەمەر فەرموی. چ شتێکم وتووە. ووتیان تۆ ئەڵێت: عیسا بەندەو فروستادەی خوایە: فەرموی ئەوانە شورەیە نین بۆ عیسا، خوای مەزن وەڵامی دانەوەو فەرموی:

﴿ لَنْ يَسْتَنْكِفَ الْمَسِيحُ أنْ يَكُونَ عَبْداً اللهِ وَلا الْمَلائِكَةُ الْمُقَرَّبُونَ ﴾ بەڕاستی مەسیح لای خراپ نیە کە ببێ بە بەندەی خواو لە نرخی عیسا کەم نابێتەوە جێگەی شانازیە بۆی. بەڵام سەر شۆڕی ئەوەیە بەندەی جگەی خوابێ. وشەی (نکْف) ئەمەیە: کاتێ مرۆڤ چاوی فرمێسك ئەڕێژێ بیسڕێتەوە هەتا کەس نەی بینێ.

خوای مەزن وەڵامی ئەوانەی پێشوو ئەداتەوە لەگەڵ ئەو کەسانەیش ئەڵێن: فریشتەکان کوڕ و کچی خوان بەم ڕستەیە خوا ئەفەرموێ و، فریشتەکانیش بەلایانەوە خراپ نییە کە بەندەی خوابن، چونکە ئەوان زۆرتر لە عیسا ئاگایان لەو شتانە هەیە لەبەر چاونین،

ئاگاداری تەختەی پـارێزراون (اللـوح الْمَحْفـوظْ)، هەشـیانە هـەڵگرتوی عەرشـن دوایـی فریشتەکان بەو هەموو زانیاری و ئاگادارییەوە بەندایێتی خوا بە خراپ نەزانن مەسیح چـۆن بەندایەتی خوا بە خراپ دائەنێ بۆ خۆی، با عیسا خـاوەنی هـەندێ زانیـاری تایبـەتی بـێ. بشزانێ رێگەیە تر نیە بۆ وەرگرتنی رزگاری لـە سزا بە جگـەی بـەندایێتی ئـەو ئایەتـە وەك دەرئەکەوێ وەڵامە بۆ گاورەکان کە ئەڵێن: عیسا کوڕی خوایە بـۆ بـت پەرسـتانیش کـە گومانیان وایە فریشتەکان کچی خوان.

﴿ وَمَن يَسْتَنْكِفْ عَنْ عِبادَتِهِ وَيَسْتَكْبِرْ فَسَيَحْشُرُهمْ إِليهِ جَميعاً ﴾ وەهەرکەسێ پەرستنی خوا بە خراپ دابنێ و خۆی بەگەورە بزانێ بەرانبەر بەخوا، دوایی هـەموویان کۆئەکاتـەوە بۆلای خۆی، هەتا ماف و سزای خۆیانیان بداتێ.

خوای مەزن باسی چۆنیەتی ئەو کەسانەی نەکردووە چۆنیـان سـزا ئـەدا خۆیـان لـەوە بەگەورەترو بە رێزتر دائەنێن کە پەرستی خـوا بکـەن و بـە بـەندەی خوابـن.بـەڵام باسـی پاداشتی باوەڕدارانی خرا پەرستان ئەکا بۆیە کەمجارو ئەفەرموێ:

﴿ فأما الذينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصالِحاتِ فَيُوَفِيهِمْ أجُورَهُمْ وَيَزيدُهم مِـنْ فَضْلِـهِ ﴾ دوایـی بەڵام کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێنـاوەو کـردەوە چاکـەکانیان کـردوە، دوایـی خـوا بـە تەواوی ئەبەخشێ بـەوان پاداشـتەکانیان و، خوازۆرتـر ئەبەخشـێ بـەوان لـەوەی بـەوانی بەخشیوە، لـە پاداشت لـە گەورەیی و میهرەبان خۆیەوە.

﴿ وَأما الذِينَ أسْتَنْكَفُوا وأسْتَبْكَرُوا فَيُعَذِبَـمْ عَذابـاً أَليمـاً ﴾ وەبـەڵام کەسـانێکی ئـەوتۆ پەرستی خوا بە چاك نازانن و خۆیان لـە ئاستی خوا بە گەورە دائەنێن، دوایی خـوا سـزایان ئەدا بە سزایێکی خاوەن ئازار.

خوای مەزن دوای باسی پاداشتی باوەڕ دارانی کرد باسی تۆڵـەو سـزای ئـەو کەسـانە ئەکا خۆیان بە بەرز دائەنێن دەربارەی پەرستی خوا. یانێ سزای ئەو کەسانە پـاش پاداشـتی باوەڕدارانە هەتا بۆ یەکەمجار چاویان بەو پاداشتە گەورەیە بکـەوێ و لـە دوایشـدا سـزای خۆیان ببینن، هەتا دەردەکەیان گرانترێ بۆ هەموو کاتێ.

﴿ وَلا يَجِدُونَ لَهُمْ مِنْ دونِ اللهِ وَلِياً وَلا نَصِيراً ﴾ وە دەستیان ناکەوێ بۆ خۆیان لە جگەی خوا سەردارو دۆستێ کارو فەرمانیان بگرێتە دەست بۆیان هەڵسوڕێنێ و یارمەتی دەریان نیە بیانپارێزێ لە سزای خواو ڕزگاریان بکا.

لەو ئایەتەی پێشوودا خوای مەزن بۆمانی ڕون کردەوە پێویستە خوا بە تاك و تەنها بپەرسترێ، کەسی تر شایانی پەرستن و گەورەیی نیە، باسی ئەو کەسانەیشی بۆ کردین لە سنوری ئایین دەرئەچن، بەندەکانی خوا ئەبەنە ڕیزی خوا لە پەرستن و ڕێزدا. لەمەو دواییش بە یارمەتی خوا بەسەرهاتی ئایین ڕۆژ لە دوای ڕۆژ و بیروباوەڕانی تر ئەکەین کە چۆن پەیدا بووەو گۆڕانی بەسەردا هاتووە بە درێژای تێپەڕبوونی ساڵ و ڕۆژ.

بەڕاستی بە درێژی کۆنایەتی ئادەمیزاد، هەروەها پەرستینیش بەو شێوەیە لەگەڵ ئایینی ئاییندا هاتوەتە بونەوە. ئەو پەرستنەش هەر جۆرێ بوبێ و لەسەر هەر شێوەیە بوبێ لە هەستی ئایینی چوێ نەبۆتەوەو هەر بەردەوام بووە لەگەڵ ئاییندا.

زانایانی خاوەن کۆڵینەوە لە بنجو بنەوانی ئایین ناسیدا. بیری جیاوازیان هەیە کام بیرو باوەڕ لە پێشەوە هاتوەتە بونەوە، بیروباوەڕە پوچ وئەفسانەییەکان یا بیرو باوەڕی یەکتاپەرستی و باوەڕهێنان بەخوایێکی تاك و تەنها. هەروەها بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە بیری جیاوازیان هەیە، ئایا هەستی ئایینی لە کۆن کۆنەوە لەگەڵ پەیدا بوونی ئادەمیزادا بۆوە، لەبەر ئەوەی هەندێ ڕوداوی سامناکیان تێبینی کردووە لە سروشتا کە ئەو سامە هەر چوارلای گرتوون و بونە هۆی ڕاچڵەکینی ئادەمیزاد، هەمووشیان بونەتە هۆی ڕاچڵەکین، بۆیە بەناچاری پەلاماری شتێکی نادیاری ئەدەن و ناوی ئەنێن ئایین، بۆنەهێشتنی ئەو ترس و سامە، وایش ئەبێ ئەو هەستە ئایینیە لە ڕێگەی ڕانموویی خواو بووبێ کە لە قوڵای دەرونیان و سروشتی پاکیان وریای کردبنەوە، دوایی پەرستنی خوایێکی تاك و تەنها دەستی پێ کردبێ لەشێوەی بەشێکی وادا کە بەڕاستی خوا نەخشەی سنورەکانی بۆ کێشابن بەهۆی ڕانموویی پێغەمەران و فروستادەکانی خواوە.

بۆ وەڵامی ئەو شتانە ئێمە لامان ڕاستبێ و دڵمان ئارام بگرێ بۆ لایی و بڕوامان پێ‌ی هەبێ ئەمەیە: باوەڕهێنان بە یەکێتی خواو هەستی ئایین پەیدابوون لەگەڵبوونی ئادەمیزادا بە هۆی ئەو شتەوە کە چەقیوە لە دەروندا لەسەر سروشی ئایین. بە ڕانموویی و ئاراستەکردنی ئەو کەسانە خوای مەزن ڕەوانەی کردوە بۆلایان، کردوونی بە ڕانموویی کەر هەتا دەستیان بگرن بە بۆنەی ئەو سروشەوە هەتا لەوان بخۆڕێ بۆ جێگە لێی خوڕاوکان و شوێنە ڕاستیەکان و بیانپارێزێ لە گومڕایی و لادان لە ڕێگەی ڕاست و دوریان خاتەوە لە دەشتی سەرگەردانی بیروباوەڕەکان و شوێنی هەڵخلیسکاو.

ئەو شتە ئێمە بزانین ئەمەیە ئەقڵ ڕانموییان بکا بۆلای ئەو شتە. کەواتە ئەو کاتە خوای مەزن ئادەمیزادی دروست کردووەو دیاری کردووە جێگە نیشینی خوابن، پێویستە کە خوا ڕانموویان بکاو شارەزاییان بکاو پێشەوەی خۆیان بۆ ڕوناك بکاتەوە بۆ ڕێگەی ژیانی ڕۆژانەیان، خوا توێشوداریان بکا بەو شتە چۆنیەتیان چاك بکاو ڕەوشتیان بۆ ڕێك بخاو بیرکردنەوەیان ئاراستە بکا بۆلای شتێ بیروباوەڕیان ڕێك و پێك بکاو پەرستنیان ڕاست بێ لەو دروشمانە بەجێی ئەهێنن بۆخوا، ئەو داراییە ئەیان نێرن بۆ هەندێ شوێن بۆ نزیکبونەوەیان لە خوای مەزن، هەروەها ئەو ڕانموویی و شارەزایی کردن و ئاراستە کردنانە ناگونجێن لەسەر دەستی کەسێ‌نەبێ خوا هەڵی بژاردون لە ئادەمیزادو کردوونی بە خاوەن و شایان بۆ هەڵگرتنی، ئەو پەیامانە و گەیاندنی ئەو شتانە ڕەواو قەدەغەن لە فەرمانی‌کانی خوا.

لەبەر ئەوانەی پێشوو ئێمە بڕوامان وایە تێك دانی بیروباوەڕو پەرستنی ڕواڵەت و سروشت و ڕێزگرتن لە بتان و نزیکبونەوە لەوان بە پاڕانەوەو زاری و پێش کەش کردنی دەردۆگێڕو دارایی بۆیان چەند کارێکن پەیدابوون لە دوای بیروباوەڕی یەکێتی و پەرستنی خوا بەڕاستی یەکەمین دروست کراوی باوکی ئادەمیزدا کە ئادەمە ئەو کەسەیە لە خۆی هاوڕێکەی هەموو ئادەمیزادی دروست کردووە. خوا کردویەتی بە فروستادە بۆ خێزان و

نەوەی نەوەکانی، خوا توێشوداری کردوون بە جۆرێ لە جۆرەکانی بە خورپەی دڵ (الوحی) هەتا ببێ بە چرایە، ڕانموینی وەرگرن لە ڕەوشت و باوەڕو پەرستندا، کوڕەکانی ئادەم و نەوەکانی ماوەیە لەکات لەسەر بیروباوەڕی ڕاستی ڕۆیشتن هەتا وورده وورده لە ڕوناکی ئەو چرایە دور کەوتنەوە بەسەر گەردانی کەوتنە گێژاوی سەر لێ شێوان. کەوتنە دوای بیروباوەڕی پوچ، بۆ وێنەی دروست کەری خۆیان بە گوێرەی گومانیان چەندین پەیکەرو وێنەیان بۆ تاشی بۆ مفەڕك و پیرۆزی، دوایی سەرباریان نا بە جۆرێ ڕێزو پەرستن بکەن بۆ وێنەکان بە گوێرەی هەوەسی خۆیان: نادیاری شوناسن (الکاهن) بردنیان بە ڕێگەی چەوت چەوێڵدا بە نەزا نین هەندێ جارو بەفێل و جادوگەری هەندێ جاری تر، بۆیان سازاندن چەندین جۆر لە پەرستن و دوور لە خوا، نەخشەیان بۆ ڕەخساندن کە ئەو پەیکەرانە خاوەنی توانای نادیارین، هەڵبژێراون بۆ ناسینی شتە نادیارەکان، ئەتوانن پەیوەندی بە خواکانەوە بکەن بەهۆی هەندێ شتەوە کە خۆیان بە بوختان ڕێکیان خستوون، داوایان وابوو ئەو پەیکەرانە ئەتوانن لەگەڵ خواکاندا گفتوگۆ بکەن و سودیان لێ وەربگرن، ڕێگە بگرن لە خراپەیان بە نوشتەی جۆربەجۆر و جادوگەری. بەڕاستی چوار لای خوایان داپرشیو بەو پیاوە نادیاری شناسانە بە گفتوگۆی پروپوچ و ڕزانەویان کە پلەی بەرزیان دابونێ پاش مردنیان بە گێل و گەوجی کردنیان بە پەرستراو، پەیکەریان بۆ ئەتاشین، بە دەردۆ گێڕو پاڕانەوە ئەچونە لای ئەو پەیکەرانە.

بۆ ڕاست کردنەوەی ئەو ڕێ ڕەوە پوچانەی ئادەمیزادی پاش ئادەم لە باوەڕو هەڵەی ڕەوشتیان خوای مەزن ناوبەناو پێغەمەران و فروستادەی ئەنارد بۆلایان لەو کۆمەڵانە زاوزێیان کردبوو لە منالەکانی ئادەم و ئەیان بردن بۆلای ڕانومایی و شارەزاکردنیان بۆلای ڕێگەی ڕاست، گومڕاییان نیشان ئەدان بۆ ئەوەی بیان گێڕنەوە بۆلای سەرچاوەی ڕاست و پاکی ئایینی خوا، بۆ ئەوەیش دوریان بخەنەوە لە پەرستنی بتەکان. ئەوا نەیان ئارەزۆیان لە ڕانمویی ببوایە ڕانموییان وەرئەگرت، هەندێ تریان کە کەڕ بوون لە ئاستی

بیستنی ڕاستی ئەوانە لەسەر یاخی بوونی خۆیان و لەنێو ئەوپەڕی خراپیدا ئەو پەردەیە بەرچاوی گرتبوون و مانەوە لەسەر خوا نەپەرستن.

بۆ وەرگرتنی ناوەڕۆکی ئەوانە لە پێشەوە باسکران تەماشای ئایەتی (٢١٣)لە سورەتی ئەلبەقەرەدا بکەن لەگەڵ ئایەتی (١٩) لە سورەتی (یونس) بۆئەوەی بە باشی تێبگەن بە چ شێوەیە کۆمەڵی ئادەمیزاد گۆڕان.

بەڕاستی ئێمە ئەگەر بە ووردی تەماشای مێژووی هەرە کۆنی گەلانی ڕابوردو بکەین بەبێ گومان دەستمان ئەکەوێ یەکێتی بوونی خوا پێش کەوتووە لەسەرهاوبەشدانان بۆخوا بۆ گفتوگۆی پڕوپوچ. بۆ نمونە ئاینی (بەرهەمیەکان) و نامەکەیشیان کە ناسراو بە (فیدا) لە کۆنترین نامەیە کە گەیشتبێ بە خوێندەواران و بە هەزاران پێش تەواراتە، لەو نامەیەدا باسی کراوە بە ناوی (براهاسباتی) مانای ئەو ڕستەیە یانی خاوەنی نوێژو کەسێ بە تەنها نوێژی بۆ بکرێ و ئەو کەسەیە ئاواتی ئادەمیزاد ئەهێنێتەدی و، وولامی پاڕانەوەیان ئەداتەوەو هەموو کارو باری ئاسمانەکان و زەوی هەڵئەسوڕێنێ. ئەوانە بوون مانای (براهاسباتی).

خوایش لای براهیمیەکانی خوایێکی تەنهاو تاکە، هەڵسوڕێنەری بونەوەرانە هاوبەشی بۆنەبووە. لە هەندێ نامە کۆنەکانیاندا هاتوە: کە سودی ئادەمیزاد لە ژیاندا ئەوەیە پەیوەندی بە خواوە بکەن و بچنەوە بۆلای و خۆیانی بۆفیداکاری بکەن و ڕێگەیە بۆ ئەوانە بیانەوێ بێ پەرستنی خوایە بە بەردەوامی و خۆیان خەریك بکەن بە ئاواتەکانی ژیانەوە بە فراوانیبۆ سودی پاشە ڕۆژ.

بەڵام بە درێژەی شەوو ڕۆژ بت پەرستی جێگەی ئایینی گرتوەو ئەوەی ڕاستی براهیمیە پێشوەکانی لەسەری بون لایاندا، دوایی هیندیەکان دەستیان دایە بت پەرستی وێنەی جۆراوجۆری بونەوەران، دوای ماوەیە (بوزا) هات بۆلایان بۆ گەڕانەوەی دەستوری ڕاستی ئەو ئایینە بەسەرخستنی هەندێ دەستوری ئەو ئایینە و کەم کردنەوەو لابردنی هەندێ تری،

(بوزا) وێنەی تازکەری ئەو ئایینە بوو. بەڵام بوزایش ئامۆژگارییەکەی پاش ماوەیە کرایە ئایینێ تری نازەی تایبەتی و سەربەخۆ. دواتر (بوزایان) کرد بە خواو پەرستیان، خەیرو نەزریان پێش کەش ئەکرد، لەبەردەم پەیکەرەکە یا دەستیان ئەکرد بە گریان و سۆزو پەنایان ئەبردە لای بۆ بەخشینی مەرامەکانیان و پێویستی و لابردنی ڕوداوی ناهەموار.

بەڵام لە بارەی میسریەکانەوە کە فیرعەون ماوەیەکردنی بە بەندەی خۆی: ئەوەی ڕاستی بێ پشکنین و هەڵدانەوەی کەلەپوری کۆنیان لەنێو زەویەکانیانا دەری خستووە: یەکێتی خوا پێش کەوتوتر بووە لەسەرهاوەبەش دانان بۆ خوا لای پێشوەکانیان، دەریشی خست کە (ئیدرس) باپیرەی پێنچەمی ئادەمیزاد دوای ئادەم لەلایەن خوای مەزنەوە نێردراوە بۆلایان بە ئاینێکی تازەو ڕاهوبی کەربۆیان، میسریەکان ناویان ئەبرد بە (هوریس) یابە (هورویس) بەڕاستی فەرمانی پێئەدان بە پەرستنی خوای تاك و تەنها و کەم کردنەوەی جیهان پەرستی و بەخۆشەویستی ئادەمیزاد و بە دادپەروەری لە کردەکانیانداو لە گفتوگۆیانداو بە چاکەکردن لەگەڵ یەکتری، بە نەخواردنەوەی مەیی و قەدەغە کردنی بەرازو نەخواردنی گۆشتەکەی، چاکەو خەیری بریتی کرد لەسەر بڕینی ئاژەڵ بۆ خواو بەخشینی پاقلە بە هەژاران.

هەروەها پشکنین و چاڵ ناسانی کەلەپوری زەوییەکان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە دانیشتوانی میسر ئەوانەیان نزیکبوون لە پێغەمەرانەوە خوایان بە تاك و بە تەنهای ناسیوەو پەرستنیان هەر بۆ خوا کردووە بە دەنگی نزم و بە ترسانەوە. بەڵام کاتێ دوور کەوتنەوە لە یاساو لە ئاراستەی ڕاستی پێغەمەران بت پەرستی و هاوبەشدانان بۆ خوا سوواری باوەڕیان بوو.داینی بە زەویدا، دوایی دەستیان کرد بە پەرستی هەندێ لە ئادەمیزاد، بارودۆخی چینیەکان وێنەی هیندی و میسریەکان بوون، ئەوانیش باوەڕیان بە بوونی خواو تەنهاو تاکی خوا هەبو، لایان وابوو کەس نازانێ وێنەی خوا چۆنەو چ شتێکە هەر خوا بە تەنها هەڵسوڕێنەری کاروباری زەوی و ئاسمانەکانە هەر ئەو خاوەنی زانین و زانستی بێ

وێنەیە، بۆ هەر جێگەیە بڕۆین خوا لەو جێگایەدایە بە دڵی پاکەوە خوایان پەرستووەو هەر لەو پاڕاونەتەوە بە خەیرو چاکە کردنەوە. لە ئامۆژگاری هەندێ لە پاشاکانیان بێژراوە: بەڕاستی خوا بەخشیویەتی بە هەموو ئادەمیزادو دڵ و دەروون هەرکاتێ بەڕاستی پەیڕەوی بکەن ئەیان پارێزێ و ئەیکێشێ بۆلای ڕێگەی ڕاست، خوا پیرۆزبایی ئەکا لەلەشی چاك و سزای خراپەکان ئەدا.

هەوەها چینیەکانیش وێنەی جگەی خۆیان بە درێژایی تێپەڕینی کات بەسەریانا لە بیروباوەڕی یەکێتی خواو پەرستنی بە تەنها لایاندأن هەندێ لە ڕواڵەتی دەرکەوتووی سروشت و خۆرو مانگ و ئەستێرەو ڕوبارەکانیان کردە پەرستراوی خۆیان و خۆیانیان لەوان نزیك ئەکردەوە بە جۆرێ لە پەرستن هەروەها کار بەدەستان و پیاوە ژیرەکان و مامۆستاکانیشیان کرد بە پەرستراو بۆ خۆیان. گەورە پیاوە زاناکەیان (کۆنفۆشیوش) کە پێنج سەدو پەنچا ساڵ بەر لەدایك بوونی عیسا هاتوەتە جیهانەوەو بەر لە مردنی (بوزا) بە (٩٣) ساڵ مرڤێکی یەك خوا پەرستبوو، باوەڕی بە خوای تاك و تەنها بووەو لای وابووە هەڵسوڕێنەری بونەوەرانەو پێویستە بە تەنها پەرستنی بۆ بکرێ. بەڵام کە ماوەیە بەسەرمردنیدا ڕۆیشت بیروباوەڕی پڕوپوچ هەرچوار لای لێ گرتن لە سنوری ڕێزی ئەو زانایە دەرچوون، هەتا وایان لێ هات کردیان بە پەرستراو بۆ خۆیان جگەی خوا.

کوڕان ئیسرائیلیش، باوەڕی یەکتا پەرستی خوایان لە باوکو باپیرەکانەوە بۆ مابوەوە، کاتێ لەوان دورکەوتنەوە لە ڕێگەی ئەوان لایاندا، خوای گەورە بە میهرەبانی خۆی (موسای) ناردوە بۆلایان بۆئەوەی تازە بکاتەوە بۆیان ئاینی پێغەمبەرەکانیان و ڕانموییی ئەوان، لە میسر بردینە دەرەوەو ڕوی پێ کردین بۆلای زەوییە بەڵێن پێدراوەکان، موسا بە فەرمانی خوا بۆ ماوەی (٤٠) ڕۆژ لێیان وون بوو لە دەشتی (سینادا) چوبوو بە سەردەمی ئەو کاتەی خوا بۆی دیاری کردبوون بۆ وەرگرتنی ئامۆژگاری و فەرمانەکانی (تەورات) لە خوای مەزن، لە ماوەی وون بوونی موسادا لە شخڵی زێڕی خۆیان گوێرەکەیەکیان

دروست کردبوو کردیان بە خوای خۆیان بۆ پەرستن، چونکە دەرونیـــان پـەیوەندی پـەیدا کردبوو بە بت پەرستنەوە لـە سەردەمی فیرعەونەکانداو دڵیان بۆی لێ ئەدا.

تاقمێ تریان لـەوەو پاش بڕیاریان داعوزەیر کوڕی خوایە، بەو بۆنەوە گومڕایـــی لـەسـەر گومڕایی ستەم کردن لـەسەر ستەم زۆری سەند بەسەریانا، کەرەسە پول و پارە پەرستی زاڵ بوو بەسەریانا و بوون بە بەندەی کاڵاو واڵای جیهان دوایـی کـە خراپـەیان پـەرەی سـەند خوای مەزن عیسای نارد بۆ ئەوەی دەستوری موسایان بیر بخاتەوە، تۆ پشوداری کردن بـە ئینجیل هەتا بەو بۆنەوە بیروباوەڕوەکەیان چا ك بکاتــە وە، بـا نگیـان بکـا بـۆ لای خـوا پەرستی بە تاك و بە تەنهایی، ئەو کەرەسە پەرستیە دڵی ڕەش کردبون لـەوانی دوربخاتــەوە، کەم کردنەوەی جیهان و هە ولّدا ن بۆی کەمتر بکاتەوە، دوای ناردنی عیسـا هـەندێکیان باوە ڕیان هێناو ڕانموییان وەرگرت، زۆربەی زۆریان گومڕایــی لـەسـەر گومڕایـی پشـتیان کردە عیسا. ماوەیە بەسەر ئەوانەدا باوەڕیان بە عیســا هێنـابوو تێپـەڕی، سـەرلـەنوێ بـت پەرستی سوواری سەر شانیان بویەوە، لـە هەموو شتێ خراپتر خوایـان کـرد بـە سـێ خـوا بڕیاریاندا کە عیسا سـێهەمی سـێ خوایـە، وێنـەو پەیکـەری عیسـا و مەریـەمیان لـەدارو بەردتاشی و هەڵیان واسیو ڕێزیان لێ گرتن، ئەچونە بەردەمیان و کڕنوشیان بۆ ئـەبردن بـە پاڕانەوەو نزاوە داوای مەبەستیان لێ ئەکردن بێنەدی بۆیان بە جۆرێکی دەرچوو لە یاسـای خوا کەشیش و پارساو زانایانی خۆیانیان ئەکرد بـە نوێنـەر لـە نێـوان خۆیـان و خـواداو کردنیان بە پەروەردگار.

عەرەبەکان یەکەمجار خوایان بەیەك دانابوو، لـەسەر ئایینی ئیبراهیم بــوون، بـە پوختـەیی خوای تاك و تەنهایان ئەپەرست، لـە هەموو تەنگ و چەڵەمەیەکدا هـەر پـەلاماری خوایـان ئەداو بەس. دوایی وورده وورده هاوبەشدانان بۆ خـوا سـەری پێوەنـان، هـەندێکیان خـوا پەرستیان پایەدار کرد، هەندێ تریان بوونە مانگ پەرست، ئەوانی تریان فریشـتە پەرسـت، زوربەشیان بونە بت پەرست. عەرەبەکان زاوزێیان کردو زۆربوون، پاش ئیسـماعیل چونـە

دەرەوەی مەکەو بە نێو دورگەی عەرەبدا بلاّوبوونەوە، هەرکاتێ لەمەکە بچونایەتە دەرەوە بۆ مفەڕکو پیرۆزی بەردێکی کەعبەیان لەگەڵ خۆیان ئەبردو ڕێزی ئەو بەردەیان ئەگرت، دوای بەوەیشەوە نەوەستان و ئەو بەردەیان ئەپەرست. بۆیە یەکەمین جار عەمری کوڕی لوحا لە شامەوە بتێکی هێنا بەناوی (هوبەیلەوە) بۆ کەعبەو پەرستیان و کردیان بە گەورەی بتەکان هەتا وایان لێ هات لەو مایەوە (٤٠٠) ساڵی خایاند هەتا کاتی هاتنی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بەسەدان بتیان لە کەعبەدا هەڵواسی، هەتا وای لێ هات هەموو هۆزێ بتی تایبەتی بۆخۆی بڕیارداو ڕێزی بتەکانی تری نێو کەعبەیان ئەگرت،

دوای ئەوە ڕوی سەر زەوی پڕبوو لە بت پەرستی، ستەم و خوێن ڕشتن و کردنی ئادەمیزاد بە بەندە لەلایەن کاربەدەستانەوە، کەس خاوەنی خۆیی و نامسی خۆی نەبوو، لەو کاتانەدا ئادەمیزاد پێویستی تەواوی پەیداکرد بۆ گەڕانەوەیان بۆلای ئاینی پێغەمەر پێشوەکان، خوای گەورە بە میهرەبانی خۆی و یارمەتی خۆی بۆ ئادەمیزاد ویستی نامەیێکی گشتی و شیاو بۆ هەموو کات و شوێنی هەتا هەتا ڕەوانە بکا بۆ سەر زەوی، هەتا بەو بۆنەوە ڕەوشتی بەرزو ڕێگەی ڕاست و دادپەروەری بگەڕێتەوە بۆلای کۆمەڵگای ئادەمیزاد، دوای بۆ ئەو مەبەستە فروستادەیێکی کۆتایی هاوەری هەموو پێغەمەرانی نارد بۆ ئادەمیزاد وەك موحەمەدی کوڕی عەبدولاّیێ، ئەو نامەیە پێ بەخشی و کردی بە فروستادەو پێغەمەری هەموو ئادەمیزادو کردی بە موژدەرو ترسێنەر بۆیان، نامەکەیشی کرد بە کۆتایی هاوەری هەموو نامەکان بە شێوەیە پێویستی ئادەمیزادی تێدابێ بۆ ژیانیان خاوەنی نەرمی و ڕوناکی و فراوانی دادپەروەری و ئاسایشبێ. بشێ بە یاسای هەتاهەتایی هەتا لەناوچونی بونەوەران.

بە ڕاستی ئایینی ئیسلام یەکەمین ئایینە بەر لە هەموو بیکردنەوە یەك و دوای هەمووشیان کە هەڵسابێ و دەستی کردبێ بە ڕاست کردنەوەی باوەڕ بە خواو بڕیاری جەنگی دابێ لەگەڵ هاوبەشدانەران بۆخوا، بە شێوەیە میانە جوێ و نەرمی و ئاسانی و

ڕاڕایی و بەزەیی تێدا نەبێ، جەنگێ بێ سستی تێدا دەرنەکەوێ و هیچ جۆرە نەرمی و ڕێکەوتنی لێ بەدی نەکرێ لەگەڵ ئەو کەسانە هاوبەشیان بۆ خوا دانابێ بێگومان ئاینی ئیسلام لەو جەنگی بت پەرستانەدا پلە بە پلە بۆی ئەچوو. بەڵکو بەبێ وەستان و پشو کوتوپڕ ئەو جەنگەی بەرپاکرد لە دژی بت پەرستان و،لەو ڕێگەدا بەسەدان قوربانی پێشکەش کرد، بەدەیان دەربەدەری و ئاوارەیی توشی پەیڕەوانی بوو، بە پێچەوانەی یاساو دەستوری پاشکۆێ کە پەیوەندی بە جۆری ژیان و هەڵسان و مامەڵە و خواردەمەنی دانیشتوانەوە هەبوو کە بۆ قەدەغە کردنیان و بەڕەوادانیان پلە بە پلە بۆی بچێ، هەروەها لەیەکەمین کاتی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایینە هەڵوێستی خۆی دیاری کرد بە دەنگی بەرز جاڕی بۆ داو پڕبەدەمی خۆی هاواری کرد کە لەم بونەدا خوایێکی تر جگەی خوای تاك و تەنها نیە، هەر بەدەستی ئەو کاروباری هەڵسوڕاندنی ئاسمانەکان و زەوی و هەموو بونەوەرانی تر بەڕێوە ئەچێ، وێنەی ئەو کەسەی تر نیە، داوای کۆمەکی لە کەسی تر ناکرێ بۆ لێ خۆشبون و پاداشت و گەڕانەوەی خەشم و سزای خوا لە جگەی خوا.

هەموو کارێ پەیوەستە بە پەیڕەوی کردنی فەرمانەکانی خواو پێغەمەرەوە، پێغەمەرش فەرمان لە خوا وەرئەگرێ و ئەو ئەیگەیەنێ بە ئادەمیزاد، نزیکبوونەوە لە خوا هەر بەهۆی ئەو شتانەوە کە خوا کردوونی بە دەستورو ڕونی کردونەتەوە، هەر ئەوانیشن ڕێگەی پەرستنی پاك و ڕون و ئاشکراو ڕوتبێ لە هاوبەشدانان دیاری ئەکەن .

پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بۆ ماوەی (١٣) ساڵ تەواو لە مەکەدا هەموو کۆشش و هەوڵی خۆی تەرخان کردبوو بۆ دەرهێنانی دەماری هاوبەشدانان بۆ خوا لەنێو ئەو کۆمەڵە نەفامەدا و دانانی باوەڕی یەك خوا پەرستی پاك لە جێگەی ئەوداو ڕواندنی یەکێتی خوا لە دڵی قوڕەیش و جگەی قوڕەیش و لە دڵی ئەو عەرەبانەدا ئەهاتن بۆ مەکە لەکاتی حەج کردندا و جگەی ئەو کاتەش لە هەموو کۆڕو کۆمەڵدا. ئەوپەڕی توانای خۆی بەکار ئەهێنا لەگەڵ هاوڕێکانیدا بۆ بێزکردنەوەو لەبەر چاوخستنی بت پەرستی و ئەستێرە پەرستی و

شتی تر، بۆ دانیشتوانی ڕون کردەوە کە ئەوانە داوی شەیتانن بـۆ ڕاوکردنـی ئـادەمیزاد و دورخستنەوەیان لـە خواو ڕژاندنی خەشمی خوابە سەریاناو تێگەیاندنیان ئـەو بتانـە پەیکـەرو سروشت و داروبەردی بێ گیان و بـێ هۆشـن و بـێ گۆشـن، بـۆ ئـەوەن ئـادەمیزاد دور بخەنەوە لەوەی نزیکبنـەوە لـەخوا پەرسـتی، ئـایینی ئیسـلام هـاتوە بـۆ ڕزگـاری کردنـی ئادەمیزادو مێشکیان بشۆرێتەوە لـە هەموو پڕوپوچ و ئەفسانەو چیرۆکی دەست هەڵبەسـت لە هەولدانی درۆزنەکان و لـە هەواڵی ڕوداوی لـەمەو پاشیان بە درۆ بە دانیشتوانی ئەڵێن. ئایینی ئیسلام هاتووە بۆ ئەوە لـە نینۆکی تیژی دڕندەیی پڕوپاگندە ویستان ڕزگاریان بکـاو بڕوایان بە خۆیان پەیدا بێ کە ئەو دەست بڕانە وایان خستۆتە مێشکیان ئەو بتـە وشـکانە خاوەنی گیانێکی نهێنین و تواناى ئەوەیان هەیە سود ببەخشن و ڕێگە بگرن لـە خراپە.

جێگەی سەرسوڕمان نی‌یە ئەوانەمان زانی!!. بـا ئەمانـەی خوارەوەیـش بزانـین خـوای گەورە هەڵواسینی هەموو پەیکەری قەدەغە کردوە بەهەر شێوەیە کە جێگەی ڕێزبـێ. وەك هەڵواسینی ناڵ وێنەی مانگ و ئەستێرە و بـەیداخ و وێنـەی دەسـت و تـیرێ ئاڕاسـتەی چاوێ کرابێ، ئەوانە دابنرێن بەسەرقاپی و سەربانی خانوەکان و سەردیوارەکاندا، چونکـە ئەوانە وەك ڕونە بۆ ڕێزو پیرۆزی و مفەڕك هەڵیان ئەواسن، لـەوانەیـە بـە ڕۆیشـتنی چـەند کاتـێ وای لـێبـێ و بزانـرێ خـاوەنی گۆڕانـی کاروبـارن بـۆلای ئـەو مەبەسـتەی بـۆی هەڵئەواسن، دوایی وای لێبێ موسڵمانان بگەڕێنەوە بەلای جۆرە بت پەرستیە ئەگەر نـەیان کەن بە بت، بیروباوەڕی نەفامی بەر لـە هاتنی ئیسلام دەست پێ بکاتەوە ڕاستەوخۆیا لـەژێر پەردەوەبێ.

هەروەها جێگەی سەرسوڕمان نی‌یە ئاینی ئیسلام بە هـەموو هـێزی خۆیـەوە قەدەغـەی کردووە لـە ئادەمیزاد هەموو هۆیەکی میانە جـۆی و نوێنـەری پیـاوانی ئـایینی و مفـەڕك و ڕێزی گۆڕی پیاوچاکانی قەدەغەکردووە، بڕیاری داوە بە پەرسـتی خـوای تـاك و تەنـها و پاڕانەوە هەر لـەخوا، نەك گۆڕو مفەڕك خوا پێویستی نیە بە هیچ شـتێ بـۆ میـانجی گـەری،

خوای مەزن لە دەماری گوێچکە نزیکترە، هەواڵدەری درۆزن و گیانی ئاسمانی نین و درۆن بە هەموو مەبەستێ و بۆ هیچ کۆمەکیە، ئاینی ئیسلام ڕونی کردۆتەوە کەلەنێو ئادەمیزادا کۆمەڵێکی تایبەتی نین کە هەر ئەوان کاری پێویستی و قەدەغە کراوو دەستوردانان بە دەست ئەوانبێ جگەی خواو گەیاندنی پێغەمەر﴿ ﷺ ﴾ ، هەر ئەوان پرس پێ کراوبن هەرگیز بەو شێوەیەو بەو مانایە تەماشای پیاوانی ئایینی ناکرێ.

بەڵام لەنێو ئیسلامدا زانایان هەن بە پایەی زانستی ئایینی ناویان دەرکردووە بەرێك خستنی کارەلقیەکان و جۆرێ مەرجی پەرستن و کارپێ کردن نەك بنچینە ئایینیەکان، هەریەکەیان بە گوێرەی پلەو پایەی زانیاری خۆیان دەستور لە قورئان و لە فەرمودەی پێغەمەر﴿ ﷺ ﴾ دەرئەهێنن، ناگەنە پلەیە لە زانینداو تێکەیشتندا کە سەربەخۆ مافی یاسا دانانیان هەبێ لە جگەی خوای مەزن. بەڵام بۆیان هەیە مافی ورد بوونەوەو خۆماندو کردن لەو شتانەدا دەقی ڕونی بۆنەبێ لە قورئانی پیرۆزو لە فەرمودەکانی پێغەمەر﴿ ﷺ ﴾ بەراوردیان بکەن لەگەڵ شتێ تری وا فەرمانەکەی و دیاریە بە بیری خۆیان دەست نیشانی بکەن بۆ بەرگری لە زیان و ئاسان کردنی ئاڵ و گۆڕکردنی بازرگانی و جۆری مامەڵەی ڕۆاژنە، ئەو یاسایە بە کۆششی بێ دەق دەرهاتبێ بە پێویست دانانرێ بۆ جگەی خاوەن کۆشش و ئەو کەسانەی بەلایانەوە وایە ڕاستە. بۆ زانایانی تری وا کە شارەزای مانای قورئان و فەرمودەی پێغەمەربن بۆیان هەیە بە گوێرەی زانیاری خۆیان دژی بڕیاری زاناکەی ترهەڵسن و بڕیارە دەربکەن بە پێچەوانەی بڕیاری پێشوو، ئەو یاسایانە بە کۆشش دەرهاتبێ وەك دەقی فەرمانی خوایە لەزۆر شوێندا بە مەرجێ ڕێك بکەوێ لەگەڵ یاسای ئاییندا. زانین و زانیاری بە تایبەتی لە ئیسلامدا پەیوەندی بە جۆرە بەرگ و پۆشاکی تایبەتیەوە نیە، بۆ هەموو کەس هەیە لە هەموو بەرگێکابێ لەسەرچاوەکانی ئایینی پیرۆزەوە بە گوێرەی کۆشش و زانیاری خۆی ئاوی زەلاڵی بێ خەوش هەڵگۆزێ لەو سەرچاوانەوە، بۆیشی هەیە بڕیاری خۆی بدا بۆ دەستورێ کە فێری بوە لە یاساو بڕیاری قورئان بە شێوەیەکی ڕاست و لەسەر چاوانەوە دەستور دەربهێنێ، ئیتر لە هەر بەرگ و لەهەر پۆشاکێکابێ.

زانایانی زوربەی ئێستا و لەوەو بەریش بە گشتی هەتا سەردەمی هاورێکانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بڕیاری خۆیانیانداوەو بەرگ و پۆشاکی جیاوازی تایبەتیان نەبووە، بە بەرگ و پۆشاکی تایبەتیەوە نە ناسراون، ئەگەر یەکێ لە زانایان لەگەڵ کۆمەڵێ لە موسڵماناو جگەی موسڵماناندا بووەستایە زانا کە بە بەرگ و ڕووالەت جویَ نەئەکرایەوە. بەڵکو بە دەربڕینی زانیاری خۆی دەرئەکەوت.

لەوانەیە پرسیار بکرێ: بەڕاستی جۆرێ لەبەشە نادیاری ناسان بە گوێرەی ناو کەوتونەتە ڕێگەو سەریان ناوە بە موسڵمانانەوە لێرەو لەوێ بە شێوەیەکی کەشیشانەیش نەبێ، بەڕاستی هەندێ لە ڕواڵەتی بت پەرستی سەری ناڵەباری خۆی دەرهێناوە لەنێو باوەڕی ئەو کەسانەوە پەیوەندیان بە هەندێ لە پیرانی ڕێگەی سۆفی و دەرویشانەوە هەیە، ئەوەتە ئەبینرێ لە هەندێ کەسەوە کە پەیوندیان بە هەندێ لەو پیرانەوە هەیە باوەڕیان وایە ئەو پیرانە چاکەو خراپەیان بە دەستەو وای دائەنێن لێ بوردنی، ئەوان لێ بوردنی خوایە و خەشمیان خەشمی خوایە، خۆیان لەو پیرانە نزیك ئەکەنەوە بە دیاری و پیتاك، خۆیان دەرئەخەن و ڕائەوەستن لەبەردەمیاندا بەکزولی و هەژاری و مل شۆڕی، بە هەموو ترس و بیمەوە دەستی ڕاستیان ئەخەنە سەر دەستی چەپیان وەك نوێژ بکەن ئەوەستن. سەرو ملیان شۆڕئەکەنەوە لەبەرانبەریاندا، وایش ئەبێ گۆرانی بە بالاٌیاندا هەڵئەدەن سوێند بەسەریان ئەخۆن بە وێنەی خوای گەورە، وایش ئەبێ بە درۆ سوێند ئەخۆن بەخواو بریتی بۆ ئەدەن بۆ شکاندنی سوێندەکەیان، بە پێچەوانەوە سوێند بە سەری پیر بەدرۆ ناخۆن، زۆر جاران ئەبینرێ قاچییان ماچ ئەکەن و پێلاٌوەکانیان ئەخەنە سەر چاوو سەریان، زۆر جاران گاڵتەو گەپ ئەکەن بە گەورەترین زانایانی ئایینی ئیسلام، زۆر کەسیان هەن ئازاری خۆیان ئەدەن هەتا پاشماوەی خواردنی پیریان بخۆن و بە مفەڕکی ئەزانن، هەندێ جار ئەچنە لایان و داوای ڕزگاربوونی نەخۆشەکانیان لێ ئەکەن، زۆر شتی تر لەوانەی پێشوو کەنایەنە ژمارە، ئەو جۆرە کارانە هەموویان بۆنی بت پەرستیان لێ دێ ئەگەر بت پەرستی نەبن. لەلای زۆر

کەس ئاشکراو ڕونە زوربەی زۆری ئەو پیرانە نەخوێنەوارو نەزانن لە کاروباری پێویستی ئایین و یاسای ئیسلامدا، بگرە مانای شایەتیمان و پێویستەکانی نوێژوو ژمارەی ئایین نازانن، بە گوێرەی دەستوری دیاری کراو نازانن نوێژەکانیان بکەن، هەندێ لەو پیرانە بە ئاشکرا نوێژ ناکەن و ئەڵێن: ئێمە لە شوێنی نادیاردا ئەیکەن، مەگەر کەمێکیان ئەگینا بە زانینی یاسای ئیسلام هەژارو نەزانن، هەموو ڕێزو چاکەیان ئەوەیە لەنێو سۆفی و دەروێشەکانیانا لەنەوەی پیاو چاکانن و بە میرات ئەو پیشە یان بۆ هاتوە لە باوك و باپیریانەوە، وایش ئەبێ کردەوەی ئەو پیرانە دژی یاسای ئیسلامن. پارەونان و خواردەمەنی قەدەغە کراوی زۆر زەبەنەی هەیە بە گوێرەی یاسای ئیسلام، هەڵەی زۆر لە کردەوەیانا دەرئەکەوێ، لە گفتوگۆیانا درۆی زۆر ئەکەن، هەموو ئاواتی ئەوەیە پلە و پایەو ڕێزو کۆشك و چەکی نارەوا کۆ بکاتەوە لەلای سۆفی و دەروێشەکانیاندا، دارایی و سامانی زۆر کۆبکەنەوەو بەبێ ترس و بە خراپی نازانن، چونکە نەوەی پیاو چاکانن بە تایبەتی عەلی کوڕی ئەبو تالیب، وێنەی جولەکەکان ئەیان ووت: ئێمە کوڕو خۆشەویستەکانی خواین.

هەروەها زۆر جارانیش ئەبینرێ پەنا ئەبرێ بۆلای گۆڕو بارەگای پیاوانی مردوو بە پەرستن و نزیك بونەوەی لە خوا ئەژمێرن، بەجۆرێ ڕێزیان لێ ئەگرن مرۆڤێ لە ئایین شارەزابێ شەرمی ئەبێتەوە لە ترسی خوا، ئەو ڕەوشتە زۆر بڵاوەی کردووە لەنێو موسڵمانانداا، ئەوانەیا بت پەرستیە یا جۆرێکە لە بت پەرستنی ئەبینرێ بە توپزی و ئازارو ئێشی زۆرەوە زوربەی کەس بەرەو گۆڕی هەندێ لە پیاوانی ئایینی ئەکەونە ڕێ، بە دەوری گۆڕەکانیانا ئەسوڕێنەوە، درەخت و بەردو خۆڵی گۆڕەکانیان ماچ ئەکەن و ئەیان خۆن، لەبەردەم گۆڕەکانیانا کڕنوش ئەبەن، وایش ئەبێ ڕو بە ڕوی گۆڕەکانیان نوێژ ئەکەن، ئەوانە وێنەی ئەو کەسانەن لەبەردەم بتەکاندا ئەوەستان و داوای ئەو شتانەیان لێ ئەکردن لەلای جگەی خواوە نەگونجاون.

هەندێ تریان لای کوڕەکانیان ئەمێنێتوە چەند ڕۆژێ و بە نزیك بونەوەی لە خوا دائەنێن، دەردۆگیر ئەبن بۆسەر گۆڕەکانیان و لەوێ ئەی بەخشنەوە. لەلای گۆڕەکانیان

ئاواتی وا ئەخوازن لەوان جگەی خوا کەس ناتوانێ ببیەخشێ، ئەو کەسانە وێنەی (بوزیەکانن) کە ئەچنە لای لێواری هەندێ ڕوبار پۆل پۆل و تاقم تاقم لە لێواری ئاوەکەیدا دائەنیشن و بە پیرۆزی ئەزانن، وەك ڕوباری (کەنج) لە هیندستان و، وا ئەزانن نزیك بونەوە لەو ڕوبارەو خۆشۆردن لەو ئاوە گوناه لائەباو ئەبێتە هۆی نەهێشتی هەڵەو خراپە.

بۆزانین: ئەو شتانەی باسمان کردن و زۆرتر لەوانەیش لەنێو هەندێ کۆمەڵانی ئیسلامدا ئەبینرێ. بەڵام ئەوانە کارناکەنە سەر بنچینەی پاکی یەك خوا پەرستی و سەرچاوەکانی لێڵ ناکا، ڕێگەکانی پەرستنی خوا وون ناکەن، چونکە دروشمی ڕاستی یەکێتی خواو چۆنیەتی پەرستنی ڕون و دروستن و نەخشەی بۆ دانراوە لەنامەی پیرۆزی خوادا بە جۆرێ ئاژاوەو جیاوازی وەرناگرێ، ڕونی ئەو نەخشەیە بەو جۆرە بەردەوامن ڕوناکی ئەو یاسایە لێڵ ناکرێن، ڕوباری بۆگەنی دوژمن کاری تێ ناکا. یاسا دەست کردی نەزانن ڕێگە بە ئاوی زوڵاڵی ئایینی ئیسلام ناگرێ، بەو مەرجەی قورئانی پیرۆز بەردوامبێ و تەماشابکرێ و بخوێنرێتەوەو پارێزراوبێ لە تێك چوون و دەست کاری بەبێ گومان و بەبێ پێچ و پەنا، چونکە خوای گەورە گرتویەتییە ئەستۆی بێ وێنەی خۆی مانەوەو دەست کاری نەکردنی قورئان و دروشمەکانی .

دووبارە سەرچاوەی ڕونی یاسای ئیسلام ڕون کراوەتەوە بەهۆی کردەوەو گوفتاری پێغەمەرەوە ﴿ ﷺ ﴾ بەو شێوەیە ئەوپەڕی دوربینی و تەتەڵەکردنیان لەلایەن خاوەنی نامەکانی فەرمودەی پێغەمەرەوە ﴿ﷺ﴾ وەك بوخاری و موسلم و تورموزی و جگەی ئەوانیشەوە کە وەریان گرتوون لە هاوڕێکانی پێغەمەرو مێژوو ناسانی خاوەن متمانە ئەو ڕاستیانەی بۆ سەلماندووین.

لە دوای هاوڕێکانی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ ئەو زانایانەی پاش ئەوان لەسەر پێی بوون بە ئەو پەڕی وورياییی ئەتەقینەوە بەدەم هەموو کەسێکا بیان ویستایە کە بیروباوەڕی ئیسلام بگۆڕن لە ڕێگەو شوێنی خۆیاو بیدەنە پاڵ بیروباوەڕی ئیسلام ئەو گۆڕانە نارەوایە، هەموو کاتێ

بەرەنگاری ئەو کەسانە بوون کە خاوەنی هەواو هەوەس و ئەنجام و مەبەستی جیهانی بوون، لەلایەن ڕێگە لادەرەکانی پیرەکانی دەرویش و سۆفی بۆیان دەرکەوتبێ، ئەو زانایانە فێڵ و فڕی ئەوانیان بۆ دەرئەخست و دانیشتوانیان بەبێ پشو شارەزای باوەڕی ڕاست و دروست ئەکردن، ڕویان وەرئەگێڕان بۆلای خواپەرستی،ڕویان وەرئەگێڕان بۆلای خواپەرستی ڕاستەقینەو بەوانیان ئەناسان کە پێویستە هەرڕو بۆلای خوا بکرێ لە هەموو ڕوداوێکا بە تەنها و بەس، نەك بۆلای جگەی خوا لە پیرو گۆڕەکان، خوا نوێنەری لە جگەی پێغەمەران نەبووە، دەستوری تایبەتی خۆی بەوان بەخشیوە، خوا لە هەموو کەس نزیکترە لەبەندەکانی خۆیەوە. ئەوانیش بە یەکسانی و بەبێ جیاوازی هەژاری لای خوان.لەبەر ئەو شتانەی باسمان کرد بۆمان دەرکەوت بیروباوەڕو بنچینەی دەستوری ئیسلام مەترسی لێ ناکرێ، ئەو دەست بڕانە ناتوانن سەر لە دانیشتوان تێك بدەن، جادوبازانی پیاوانی تەریقەت و سامان پەرستان، ناتوانن بە ناوی ئایینەوە لێرەو لەوێ زوربەی دانیشتوانی ژێرو هۆشدا بخەڵەتێنن، جگەی هەندێ لە نەزان و نەخوێنەواران نەبێ، ئەوانیش یا نەزانن یا مەبەستی تایبەتی خۆیان هەیە. بەڕاستی دروشم و یاسای ڕاستی ئیسلام بۆ جۆری پەرستنی خوا زۆر ڕون و ئاشکران، ئەو شتانە کە پەیڕەوانی پیرانی تەریقەت ئەیکەن لە تیربازی و مارگرتن پەیوەندیان بە ئایینەوە نیە دژی ئەون، درۆو دەست بڕین و فێڵی ئەو کەسانە بە ناوی ئایینەوە سامانی دانیشتوان بەمفتە ئەخۆن، پیاوانی ئایین ئەیان خەنە جێگەی پیس و فڕەیان ئەدەنە نێو تەنەکەی پۆخڵەواتەوە.

بۆ زانین: هیچ کەسێ نابێ گومان ببا کە من ئەمەوێ پلاڕو توانج بگرمە ئەو پیشە بە نرخەو ئەو ڕێگە خاوێنە لەو ڕێگەیە کە پیاوانی خاوەن ئایین و جیهان نەویستان گرتویانە و بەو پیشەیە وازیان لە جیهان پەرستی هێناوە، وە وا بزانرێ بمەوێ گاڵتەو گەپ بکەم بە پەیڕەوی پیاوانی خواناس و ڕاست گۆیانی تەریقەت کە لەگەڵ خواو هاو ئایینی خۆیانا ڕاستیان کردووە، لە هەوڵدابوون بۆ ڕوبێ کردنی ئادەمیزاد بۆ پەیڕەوی کردنی یاسای ئیسلام بە ئامۆژگاری و بەجۆرێ شارەزاکردنیان و پاك کردنەوەیان لە چڵك و چەپەڵی،

کردنیان بە پیاوی چاك بە هۆی ڕێڕەوی تایبەتی خۆیانەوە، بەبێ گومان هاوڕێتی پیاو چاکان لە زانایان و خوا پەرستان و جیهان نەویستان لە پیرو لە مامۆستایانی تەریقەت و گەورە پیاوانی ئایینی، گوێ گرتن لە ووتەو ئامۆژگاری و وانەیان جۆرە پەرستنێکی خوایە، بەو پیشانەیان نەرمی ئەخەنە دڵان و ژەنگ و چەپەڵی لە ئاوێنەی دەرونیان بەژیرانە پاك ئەکەنەوە، ئەبنە کۆسپ و بەرگری لەنێوان خواو بەندەی خوادا بۆ پەلامارنەدانی گوناهو خراپەکردن، پاڵیان پێوە ئەنێن بۆ مل کەچ کردنی بۆلای خواو جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خواو دورخستنەوەیان لە قەدەغەکراوەکان بەڕاستی پیرانی تەریقەت هەیانە زانای زۆر گەورەو خزمەت گوزاری ئایین کە پەیوەندی تەواویان هەبووە بە خوای مەزنەوە، بەبێ ڕیایی و خۆهەڵکێشان، بە جۆرە پەرستنێکی شیرین و خۆپارستن لە گوناه کردن و جیهان ویستان، بە دروستی بە پوختەیی ئایینیان ناسیوە، بەڕێگای یاسای ئیسلام و ئاییندا چوون و پەیڕەوی ئایینیان کردووە لە هەموو گفتوگۆو کردەوەیاندا. هەڵکەوتوە لە نێوان پیرانی تەریقەتا کەڵە پیاوان کە سودو چاکەیان زوربەی کۆمەڵی ئیسلامیان داپۆشیوە بەهۆی ئامۆژگاری ووانەی بە نرخیانەوە، هەندێ لەو پیرانەن: (جونەیدی بەغدادی.مەعروفی کەرخی. سلیمانی دارانی. فوزەیلی کوڕی عەیاز. عبدولقادری گەیلانی. سەید ئەحمەدی ڕەفاعی. حاجی کاك ئەحمەدی سلێمانی. شاهی نەقشبەند. مەولانا خالیدی کوردی.

جگەی ئەوانیش لە زانایانی خاوەن زانیاری و جیهان نەویست و چاکە پیشەو خۆپارێز، ناوی ئەو بەڕێزانە باسکراوەو نوسراوە بە چاکەو سوپاسەوە لە نامەی زۆری گەورە پیاواندا کە هەمیشە لە جەنگدا بوون لەگەڵ درۆزنان و پڕو پوچپەرستان و جادوگەران، خۆیانیان ماندو کردووە بۆچەسپاندنی پوختەی ئایین و گەڕانەوەی بۆلای بیروباوەڕی هاوڕێکانی پێغەمەرو پیاوە پێشوەکان، ئەوانیشن ئیبنو تەیمەو ئیبنو لجەزەری و جگەی ئەوانیش.

وێنەی ئەو کەسانە لە خاوەن تەریقەتەکان زۆر زۆر گەورە بوون و ئایینیان نەکردووە بە پەیژە بۆ سامان و پلەو پایەو جیهان، بەڵکو جیهانیان کردووە بە پەیژە بۆ گەیشتن بە

ئاواتی بەرزی پاشە ڕۆژ، لەبەر ئـەوە نەبیسـتراوە لـەوان کۆکردنـەوەی دارای لـە نێـوان پەیڕوەکانیان وەك زۆرتر لە بەناو پیرانی تەریقـەت لـەم سـەردەمەی ئێمـەدا کـە نـەزان و نەخوێنەوارن و سامانی زۆریان کۆکردۆتەوە.

بۆ ئاگاداری: تـرازوی جیاکردنـەوەی پیـاوانی چـاك و ڕاسـت گـو لـە خراپـەکان و درۆزنان ئەمەیە: کردەوە گوفتاریان ئەکێشرێ بە تەرازوی یاسـای قورئـان و فـەرموودەی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بەراوردی مەبەستیان ئەکرێ لە فرمانی جیهانیاندا، ئەگەر ئەوانت دەسـت کەوت کارو گوفتاریان و ڕوپێ کردنیان ڕێك و پێك بوو لەگەڵ ئەو شتانە یاسـا فـەرمانی پێداون لە قورئان و لــە فـەرمودەی پێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ بینران دوای ئـەو شـتانە نەکـەوتن پەیوەندیان بە جیهانەوە هەیەو چاویان لە سامانی دانیشتوانەوە نەبوو بــە خۆڕایـی بیخـۆن، قنیات بوون بەو ڕۆزییە بە ڕەوای خوا فەرمانی پێداون، ئاوڕیــان نەئەدایـەوە بـۆلای پلـەو پایەو جێگــەی بـەرزی جیـهان، نزیـك نەئەبوونـەوە لـەکار بەدەسـتان و دەسـتەڵاتدارانی ستەمکار بۆئەوەی جێگەی خۆیان بگرن. موسڵمانان بــە هـۆی ئەوانـەوە فـەڕو چاکـەیان توشبێ و لەستەمیان ڕزگاربن، زاناو داناو بوون بــە پلـەکانی ئـایین، ئاگـاداری زۆرتـری یاسای لقەکانی ئایین بوون، ڕاستیان لە دانیشتوان نەئەشاردەوە. خزمـەت کـارو خزمـەت گوزاری زانین و زانیاری بوون، ئەو کەسانە ئەگەر بەو جۆرانە بوون بەڕاستی خاوەنی ڕێزو گەورەین و شایانی مامۆستایی دۆستایەتین پێویستە بە چاکەو سوپاســەوە باسیان بکـرێ و ناویان ببرێ.

بەڵام ئەگەر بینران دژی یاســای دیـاری کـراوو دەسـتوری ئـایین بـوون لـە کـردارو گوفتاریاندا. تێبینی ئەکران باوەشیان ئەکرد بە سامانی جیهانداو هەوڵی زۆرتریشــیان ئـەدا بەهەر شێوەیە ببوایەو بۆیان بگونجایە بە چاك و بە خراپ بـۆ پـەیداکردنی دارایـی و پلــەو پایەی نارەوا، چاویان لە پول و پارەو پیتاکی دانیشتوانەوە بوو، خۆیان خۆشەویست ئەکرد لای خاوەن پلەو کاربەدەستانی جیهان، لە دەرگایاندا ئەکــەوتن و هــەڵیان ئەمشـان هـەتا بچنە لایان، ئەو کەسانە بەو جۆرە بوون دەست بڕو فێڵ بـازو جادوگـەرن، بازرگـانی بـە

ئاینەوە ئەکەن، ئاین ئەکەن بەرێگەو پەیژەو گەیشتنیان بە جیهان و کالاو والای نەماوە، جا بۆیە پێویستە ئەو کەسانە دوربین لێیان و بە گوێرەی توانا لەبەرچاوی دانیشتوانیان بخەین.

ئەو درۆو گومرایی و پەلاماردانەیان بۆ جیهان دەربخەن بۆ دانیشتوان، ئا لەو کاتانەدا ئەگەر بشبینرێن بفرن بۆ ئاسمان و ژەهری کوشندەیش بخۆن و مارو دووپشک بگرن و خۆیان بخەنە ئاگرەوە، پێویستە باوەڕیان پێ نەکرێ نە بە نهێنی و نە بە ئاشکراو بە جادوگەرو بێ باوەڕیان بزانین و بە چاکەیان نەدەینە پێنوس و بەڵگەی سەرچاوەکەیان و ڕاستی نین و جادو بوختانن، چونکە زۆرترو سەرسوڕینەتر لەوانەی ئەوان ئەیکەن لەگاو گوێرەکە پەرستانەوە کە بە هەزاران لە هیندوستاندا ناویان وەرگرتوو ئەبینرێ، بەچاو ئەبینرێ کە ئاگری تیژی ناهەمواریان بۆ تاوداون و ئەچنە ناوی لەم لاولەولاوە ئەچنە دەرەوە بەبێ ئازارو بە ساغی، ئەوە زرتر لە کاری بێگانەو دور لە سروشتیان لێ پەیدا ئەبێ، ئەقڵ و ژیری لەوانە ناگەن و سەرگەردانن لە هۆکانیان.

بۆیە پێویستە قورئان و فەرمودەی پێغەمەر بکەین بە تەرازوو لە یاسای خوا دەرنەچین باوەڕ بە یاسا بکەین، نەك بە جادوو فڕوفێڵ، ئیتر با ئێمە نەزانین چین و چۆن ئەکرێن.

بەڕاستی هەڵسان بەو کارانە لەهەر کەسەو بێ دژی دام و دەزگای باوی دەرکەوتوی ئادەمیزادن و لە سنورە دەق پێوەگرتنیان دەرچوون کە ئەقڵ هۆکانی بۆ نادۆزرێتەوە، هەرگیزاو هەرگیز نابنە بەڵگە لەسەر ترسان و نزیك بوونەوە لە خوا بەو مەرجە خاوەنەکانیان خۆ پارێز نەبن لە گوناهو لە بێ فەرمانی خوا. بەبێ گومان ئەو جۆرە کارانە پیشەیەکن خاوەنەکانیان فێری بوون و جۆرەکەی لە ئێمەوە پەنهانەو نهێنیەکە لە ئێمەوە نادیاریە.

کاتێ خوای مەزن بەڵگەی بۆ هەموو تاقمەکان لە دووڕووان و لەبێ باوەڕان و جولەکەو گاورو دیاری کرد و وەڵامی دانەوە، دوای ڕونەکاتە هەموو ئادەمیزاد بۆ ئەوەی بڕیار بدەن بە فروستادەی موحەمەد ﴿ ﷺ ﴾ ئەفەرموی:

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُم بُرْهَـٰنٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا ﴿١٧٤﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱعْتَصَمُوا۟ بِهِۦ فَسَيُدْخِلُهُمْ فِى رَحْمَةٍ مِّنْهُ وَفَضْلٍ وَيَهْدِيهِمْ إِلَيْهِ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿١٧٥﴾

﴿ يا ايُها الناس قَدْ جاءَكُمْ بُرْهانٌ مِنْ رَبِكُمْ ﴾ ئەی ئادەمیزاد بەڕاستی هاتووە بۆلای ئێوە بەڵگەیە لەلایەن پەروەردەکەری ئێوەوە کە بریتیە لە قورئـان و باوەڕ بە موحەمەدو ئایینی ئیسلام و ئەو بەڵگەیە پەك خەری هەموو کەسە، چەندین بەڵگەی تریش.

﴿ وَأَنْزَلنا إِلَيْكُمْ نُوْراً مُبيناً ﴾ وە ئێمە ناردومانتە خوارەوە بۆلای ئێوە ڕوناکیێکی ئاشکرا لە قورئان و لە کردەوەو فەرمودە و بێ دەنگی پێغەمبەر لەکاتی کردنـی کارێکـا . ئەوشتانە لەو ئایەتەدان بەڵگەی بێگومانن و تیغی بڕندەن بـۆ ئاشکراکردنی ڕاستی و ڕاوەستان و ڕووناکی گەشەدار بۆ ڕانموبی دروست ، چونکە ئەو شتانە بەپەیخا و بەسروشن ، بـۆ ئـەوە لە نێو ڕوناکی ئەواندا بڕوێن و ڕێگەی ڕاستمان لێ وون نـەبێ و لـەلای جگـەی خـواوە نەهاتوون ، بۆ سەلماندنی ئەو شتانە ئێمە بەراوردی قورئان ئەکەین لەگەڵ وانەکانی جگـەی قورئان لەنامە ئاینیەکانی تری پێشوو ، هەروەها بەراوردی مێژووی قورئان ئەکەین لەگـەڵ مێژوی نامەکانی تـر کـەچۆن و چیـان بەسـەر هـاتووە و چ شـتێکیان بەسـەردا تێپـەڕیوە بەدرێژایی خولەك و گەلانی ڕابوردوو ، دووبـارە بـە جۆرێکـی تایبـەتی لـەژمارەی زۆری ئینجیلەکان و وانەکانیان کەناویان دەرکردووە ئەکۆڵینەوە ، لەئەنجامدا بۆمان دەرئەکەوێ قورئانی پیرۆز لەو ڕۆژەوە هاتۆتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ هـەتا ئـەم سـەردەمەی

ئێمە هیچ گۆڕان و دەستکاری بەسەردا نەهاتوە بەدرێژایی ساڵ ، بۆ لەمەو دوایش گۆڕانی بەسەردا نایە ئەم قورئانەی ئێستا هەر ئەو قورئانەی پێشووە لای زانایە بوبێ یا لای پاشایە یا لای شوانێ یا لای بێ باوەڕێ بوبێ ، ئەوانەیش ئەوە ئەگەیەنن کە ئەو قورئانەی لای تخواوە هاتووەتە خوارەوە ویستی وایە نەگۆڕێ .

بەلام بەدرێژایی مێژوو گۆڕانی بەسەردا هاتووە ، بەدەیان ئینجیل نوسراوەتەوە بەدژی یەکتری ، لەیەکەم کاتی هاتنی عیسادا عیسایان بەئادەمیزاد داناوە لەزۆربەی ڕۆژانی خولەی یەکەمی زاینیدا ، بەلام لەدواییدا بەتایبەتی پاش خولی دووهەم ژمارەی ئینجیلی زۆر پەیدا بو، هەریەکەیان بەشێوەیە دژی یەکتری بوون ، گاورەکان لەبارەی عیساوە بیری جیاوازیان پەیدا کرد ، هەندێکیان لایان وابو عیسا خوایە ، هەندێ تریان لایان وابوو عیسا سێهەمی سێ خوایە .

ئەوانە و ژمارەی زۆری ئینجیل ئەوە ئەگەیەنن کە ئاینی عیسا دەستکاری کراوە بەدەستکاری کردنی ئینجیل ، بۆمان دەرئەکەوێ کەنامەی خوا نین و دەستکاری کراون لەلایەن کەشیشەکانەوە ، هەریەکەیان بەگوێرەی مەبەستی خۆیان دایان ناون .

سەرسوڕێنەری تر شتێ خوێندمەوە گفتوگۆی هەندێ لەموژدەدەران و گەڕۆکە ڕۆژئاواییەکانە : کە موحەمەد وانەکانی خۆی لەئینجیل و لەزاناکانی گاورەکانەوە وەرگرتووە ، ئێمە پرسیار لەو کەسانە ئەکەین : ئایا موحەمەد ئایەتی ( ١٧١ و ١٧٢) ی ئەم سورەتەی نیسائی لەگەڵ چەندین ئایەتی تری بێ باوەڕ کردنی گاورەکانی لەو کەسانەوە وەرگرتوە یان نە ؟ کەواتە ئەو بڕیاردانە لەخۆیانەوە لەسەر خۆیان و بێ باوەڕی خۆیان ئەکەوێ .

﴿ فأمّا الذين آمنوا بِاللهِ وآعتصموا بِهِ ﴾ دوایی ئەو کەسانە باوەڕیان هێناوە بەخوا و بەبەڵگەکانی و ، پەنایان بردووە بەخوا قەدەغە ئەکەن لەخوا شتی ناشایستە و خراپ و باوەڕیان بەردەوامە .

﴿ فَسَيُدخِلهم في رحمة منهُ وَفَضل ﴾ دوایی ئەو کەسانە ئەخاتە نێو میهرەبانی لەلایەن خۆیەوە و ئەیشیان خاتە نێو ڕێزگرتن و چاکەی خۆی لەڕۆژی دواییدا .

﴿ وَيَهدِيهِم إليهِ صِراطاً مستقيماً ﴾ وەخوا ڕانموویی ئەو کەسانە ئەکا بۆلای ڕێگەی ڕاستی لای خۆی و ئەو بەڵێنەی خوا بەوانی داوە بەوانی ببەخشێ .

بەکورتی ئەو کەسانە بڕوایان بەخوا هێنابێ و پەنایان بۆ لای ئەو بردبێ ، جگەی خوا بخەنە پشتی خۆیان لەنێو میهرەبانی و ڕێزگرتنی خوادان ، بەوانی ئەبەخشێ ڕانموویی بۆ لای ڕێگەی ڕاست و پاداشتی زۆر ، لەپاشە ڕۆژدا بەوانی ئەبەخشێ خۆشەویستی و خواردمەنی پاك لەبەهەشتی بەریندا .

خوای مەزن لەکۆتایی ئایەتی (١٢) ی ئەم سورەتەدا باسی ئەو کەسانەی بۆ کردین بمرن و کوڕ و کچ و باوك و نەوەی نێرینەیان نەبێ ، میراتبەرانی بریتین بن لەخوشکی دایکی یا برای دایکی یا هەردوو لایان ، لەم ئایەتەی دواییدا باسی ئەو کەسانەمان بۆ ئەکا بمرن و کوڕ و کچ و نەوەی نێرینە و باوکیان نەبێ ، میراتبەرانی بریتی بن لەخوشکی باوك و دایکی یا برای باوك و دایکی یا کۆبونەوەی هەردوو لایان ، یا خوشکی باوکی یا برای باوکی یا کۆبوونەوەی هەردووکیان ، یا دوو خوشکی باوك و دایکی یا دوو خوشکی باوکی بۆ ڕوون کردنەوەی میراتەکانیان خوا ئەفەرموێ :

يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي ٱلْكَلَٰلَةِ إِنِ ٱمْرُؤٌا۟ هَلَكَ لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَهُۥٓ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ وَإِن كَانُوٓا۟ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا۟ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿١٧٦﴾

﴿ يَستَفتونك قُلْ الله يفتيكم في الكلالـة ﴾ داوا ئەكـەن لـەتۆ بۆیـان ڕوون بكەیتـەوە چۆنێتی بەشكردنی میراتی ئەو كەسانە ئەمرن و كوڕ و كچ و نەوەی نێر و باوكیان نیە : تۆ لـەوەڵامیاندا بڵێ : خوا ڕوونی ئەكاتەوە بۆ ئێوە چۆنێتی بەشكردنی میراتی ئەو كەسـە بـەم جۆرەی خوارەوە :

﴿ إنَ أمْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ ﴾ ئەگەر پیاوێ مرد ئەو پیاوە نەیبوو منداڵ لە كوڕو كـچ و نەوەی نێرینە و باوك.

﴿ وَلَهُ أختٌ فَلَها نصف ما تَرَكَ ﴾ وەئەو پیاوە خوشكی هەبوو بـاوك و دایكـی بـن یـا باوكی، دوایی بۆ ئەو خوشكە هەیە نیوەی شتێ بە جێی هێشتوە لە سامان و دارایی.

﴿ وَهُوَ يَرِثُها إن لَمّ يَكُنْ لَها وَلَدٌ ﴾ وەئـەو پیـاوەیش مـیرات ئـەگرێ لـەو خوشـكەی ئەگەر مردو باوك و منالّی نەبوو، هەموو میراتی ئەو خوشكەی ئـەبا، ئەگـەر خوشـكەكەی منالّی نێرینەی هەبوو براكەی میرات نابا، ئەگەر منالّی مێینە بوو بەم جۆرەیە:

﴿ فإنْ كانَتا أثنَتَيْنِ فَلَهُما الْثُلْثانِ مِما تَـرَكَ ﴾ دوای ئەگـەر میراتبـەری ئـەو پیـاوە دوو خوشك بوون زۆرتر، دووایـی بـۆ ئـەوان هەیـە دوو سـێیەكی شـتێ ئـەو مرۆڤـە بـەجێ هێشتووە.

﴿ وَإنْ كانُوا إخْوَةً رجالاً وَنِساءً فَلِلذّكَرِ مِثْلُ حَظِ الأُنْثَيَيْنِ ﴾ وەئەگەر ئـــەو میراتبەرانـە براو خوشكبوون لـە پیاوان و ژنان، دوایی بۆ نێرینە هەیە بە ئەندازەی بەشی دووژن.

﴿ يُبَيِّنُ الله لَكُمْ أنَ تَضِلُوا وَالله بِكُلِ شَـيءٍ عَلِيـمٌ ﴾ خـوا ڕونـی ئەكاتـەوە بـۆ ئێـوە بەشكردنی میراتی كەسێ بمرێ و منالّ و باوكی نەبێ گۆمڕایی ئێوە دەربـارەی بەشـكردنی میرات بە گوێرەی سروشتی خۆیان نەوەك توشی خراپە بن و نەزانن چۆنی بـەش بكـەن و گوناهبارنین، وەخوا بە هەموو شتێ ئەزانێ لـە سودی هەردوو جیهانی بەندەكانی خۆی.

بە یاریدەی خوا كۆتایی هات – ٥ / ١ / ١٩٩٩ – زایینی

١٩ – مانگی شەوال – ١٤١٩ كۆچی

# ﴿ سورەتی ئەلمائیدە ﴾

لە مەدینە هاتۆتەوە خوارەوە، لە جگەی ئایەتی (٣) کە هاتوە خوارەوە لە عەرەفات لە کاتی حەجی ماڵ ئاوایی لە جیهان، لە کاتی گرتنی شاری مەکەی پیرۆز. ژمارەی ئایەتەکانی (١٢٠) ئایەتن.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَوْفُوا۟ بِٱلْعُقُودِ ۚ أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ
ٱلْأَنْعَٰمِ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ غَيْرَ مُحِلِّى ٱلصَّيْدِ وَأَنتُمْ حُرُمٌ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ
يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ ﴿١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُحِلُّوا۟ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ
وَلَا ٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ وَلَا ٱلْهَدْىَ وَلَا ٱلْقَلَٰٓئِدَ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلْبَيْتَ
ٱلْحَرَامَ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّن رَّبِّهِمْ وَرِضْوَٰنًا ۚ وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَٱصْطَادُوا۟ ۚ
وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ أَن صَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ
ٱلْحَرَامِ أَن تَعْتَدُوا۟ ۘ وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا۟
عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز دێــن و ئــەڕۆن لــە بــارەی بیروبــاوەڕو پەرســتن و دەســتورو ڕەوشت و سەرۆکایەتی جیهان و ئایین و فەرماندان و جەنگی بێ بــاوەڕان، ئــەم ئایەتانــەی دوای یەکێکن لەو ئایەتانە دانراون بۆ یاساو دەستور بۆ ئادەمیزاد. ئەفەرموی:

﴿ يا أيُها الذيْنَ آمَنُوْا أوفُوْا بِالْعُقُودِ ﴾ ئــەی کەســانێکی ئــەتۆ باوەڕتــان هێنــاوە، ئێــوە جێبەجێ بکەن ئەو پەیمانانەی ڕۆیشتوە لە نێوانتــان و پێویســتان کــردووە لەســەر خۆتــان بەخوایشتی خۆتان وە بە گوێرەی یاسای ئیسلامبێ، وەك بەستنی کڕیــن و فرۆشــتن، مــارە بڕینی ژنان، هاوبەشیتان لە مامەڵەداو سوێند خواردن، جگەی ئەوانیش لەو شــتانەی خــوا داواتان لێ ئەکا.

لەژێر ڕوناکی ئەو ڕستەیەدا ئەم پرسیاروو وولاّمانە جێگەی شیاوی خۆیانە:

١- ئەگەر پێویست کرا بە ڕۆژو بێ لە ڕۆژانی جەژنەکاندا، یا کەسێ پێویســتی کــرد لەسەر خۆی سەربڕینی منالێکی خــۆی، لای شــافعیەکان ئــەو پێویســت کردنانــە پوچــن، چونکە ئەوانە قەدەغەن لەلای حەنەفیەکان ئەو پێویست کردنانــە دائەمــەزرێن. بــەلاّم نــەك ڕۆژوی جەژن و سەبڕینی منالەکەی. بەڵکو ڕۆژێ لە ڕۆژانی تــرو ســەربڕینی گییــانداری جگە ئادەمیزاد.

٢- پەشیمان بوونەوە لە کڕین و لە فرۆشتن لە ماوەی جییا نەبوونەوەی بکڕو بفــرۆش لای شافعیەکان دروستە، لای حەنەفیەکان دروست نییە.

٣- تــەلاّقدانی سێبەســێ ڕەوایــە یانــە؟ لای شــافعیەکان ڕەوایـــە، لای حەنەفیـــەکان قەدەغەیە، بەلاّم لای هەردوولایان تەلاّقەکان ئەکەون، هەریەکەیان بەڵگەی تایبــەتی خــۆی هەیە.

ئەو ڕستەیە هەرچەندە زۆر کورتە. بەڵام سوودەکەی زۆر فراوانە، ئەو ڕستەیە پایەو بنچینەی کۆششی زانایانە، هەریەکەیان بە گوێرەی بەراوردی خۆیان یاساو دەستوری لێ دەرئەهێنن بۆ ڕێك خستنی چۆنیەتی مامەڵەو کارو باری ڕۆژانەی ئادەمیزاد بە گوێرەی ئەو مەرجانەی دیاری کراون، وەك ژیری و باڵغی مامەڵەکەران، جۆری ئەو شتانە مامەڵەی ئەچێتە سەرو شایانی ئەوەبن بکرڕێن، بەمەرجێ ئەو شتانە ڕەوانیان گۆڕن بە قەدەغەو ئەوانەی قەدەغەن نەیان کەن بە ڕەوا.

خوای مەزن بەو ڕستەیە بڕیاری خۆی پێویست کرد لەسەر باوەڕداران کە مل کەچی هەموو فەرماندانی خوابن کە بنچینەی باوەڕهێنانە. بۆ لەمەو دواییش بە درێژی باسی هەندێکیان ئەکاو ئەفەرموی:

﴿ أحِلَتْ لَكُمْ بَهِمَةُ الأنْعامِ ﴾ ڕەوا کراوە بۆ ئێوە بەسەزمانە چوار پێکان لە هوشترو بزن و مەڕو گا، ئیتر دێی بن یان کێوی، جگەی ئەوانیش لە گیانەوەرانی تری کێوی، وەك ئاسك و کەری کێوی و ئەوانەی تریش کە دیاری کراون لە نامە یاساکاندا.

لە باسی ماناکردنی ئایەتی (٤) ئەم سورەتەدا باسی جۆری سەربڕینی ئەو گیاندارانە ئەکەین بە درێژی.

دوای ئەوەی خوای مەزن باسی ڕەوایی ئەو بەسەزمانانەی کرد، لە دوایدا دوو جۆر لەو ڕەوایانە دەرئەکاو ئەفەرموێ:

﴿ إلاّ ما يُتْلى عَلَيْكُمْ ﴾ مەگەر شتێ ئەخوێنرێتەوە بەسەر ئێوەدا لەم سورەتە کە قەدەغەن ئەفەرموی: (لە ئایەتی (٣) دا (حُرِمَتْ عَلَيْكُمْ الْمَيْتَةُ). ئەو دوو شتانەیش ئەمانەن:

١- ﴿ غَيْرَ مُحِلِي الصَيْدِ وَأنْتُمْ حُرُمٌ ﴾ ئەو چوار پێیانە ڕەوان بۆ ئێوە لە کێوی و دێی نەك ئێوە بە ڕەوای دانێن نێچیرو، ئێوە نیازی خۆتانتان هێنابێ بۆ حەج و عەمرەکردن، ئەو نێچرانە لە کاتی چونە ناو حەج و عەمرەکردن قەدەغەن و گۆشتەکانیشیان قەدەغەیە خواردنیان. ئیتر چوار پێ بن یا باڵندە.

﴿ إن الله يَحْكُمُ ما يُرِيدُ ﴾ بەڕاستی خوا فەرمان ئەدا بەشتێ بیەوێ لە قەدەغـەکردن و لە ڕەواکردنی چوارپێ بەسەزمانەکان و بەڕەواداناني نێچیر هەندێ کات و قەدەغە کردنی لە هەندێ کاتی تردا.

کاتێ خوای مەزن قەدەغەی کرد نێچیر لـەکاتی چونـە نـاوی نیـازی کردنـی حـەج و عەمرە، لە دوایشدا ئەو قەدەغەکردنە سەختترو توندتر ئەکاو ئەفەرموێ:

﴿ يا ايُها الذِيْنَ أمَنُوا لا تُحِلُوْا شعاير الله ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە: ئێوە بەڕەوای دامەنێن نیشانەی ئایینەکانی خـوا، لـە سـنوری دیـاری کـراوی حـەج و عـەمرە دەرمەچن، بەهەرجۆرێ خوا فەرمانی پێداوە جێبەجێیان بکەن.

﴿ وَلا الشَهْرَ الْحَرامَ ﴾ وەبەڕەوای دامەنێن جەنگ کردن لـە مانگـە بـەڕێزەکاندا کـە چوار مانگن: زیلقەعدە، زیلحەجە، موحەڕەم، ڕەجەب.

﴿ وَلاَ الْهَدْيَ ﴾ وەبەڕەوای دامەنێن ئەو چوارپێیانە بە دیاری ئـەنێرین بـۆلای خانـەی خوا، ڕێگەیان پێ مەگرن و داگیریان مەکەن بابە ئاسانی بگەنە جێگەی خۆیان.

﴿ وَلاَ الْقَلائِدَ ﴾ وەبەڕەوای دامەنێن ئەو چوار پێیانـە دیـاری کـراون و گـەردن لفـێ کرابێتە ملیان لە ناڵ و بەردو درەخت و شتی تر هەتا بناسرێن کە دیارین بۆ خانـەی خـوا ڕێگە بەوانە مەگرن با بگەنە جێگەی خۆیان.

﴿ وَلاَ آمِيْنَ الْبَيْتَ الْحَرامَ ﴾ وەئێوە بە ڕەوای دامەنێن جـەنگ بکـەن لەگـەڵ کەسـێ نیازی خانەی ڕێزداری خوا بکا، ئیتر بۆ پەرستنی یا بۆ بازرگانی.

﴿ يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِنَ رَبِيهِمْ وَرِضْوانا ﴾ ئـەو کەسـانەی داوای خواردەمـەنی ئەکـەن لـە پەروەردەکەری خۆیان و داوای ڕەزامەندی ئەکەن لـە خـوا. نـاوەڕۆکی فـەرمودەی ئـەو ڕستانە هەموو ئادەمیزادی گرتوەتەوە لە باوەڕداران و لـە بـێ بـاوەڕان و هەریەکـەیان بـە گوێرەی مەبەستی خۆیان بەر لـەوەی فـەرمان وەربگـرێ بـۆ قەدەغـەکردنی چوونـی بـێ باوەڕان بۆ مەکە و بۆ بەجێ هێنانی حەج، بەر لە فەرماندان بە جەنگ کـردن لەگـەڵ بـێ باوەڕان.

﴿ وَإِذا حَلَلْتُمْ فاصْطادُوا ﴾ وەهەر کاتێ ئێوە لـە نیازی حـەج و عـەمرە دەرچـوون، دوایی ئێوە ڕاوی نێچیر بکەن و ڕاوکردنیـان بـۆ ئێـوە ڕەوا ئـەبێ لـە جگـەی شـارەوانی مەکەدا.

﴿ وَلا يَجْرِمَنُكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ أَنْ صَدُوكُمْ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرامِ أَنْ تَعْتَدُوا ﴾ وەسـواری ئێوە نەبێ ڕق و دوژمنایێتی تاقمێ، بێ باوەڕانی قوڕەشی کە ڕێگـەیان گرتبـوو لەسـەردانی مزگەوتی ڕێزدار بۆ تەواف کردنی، هانی ئێوە نەدا کە ئێوە دەست درێـژی بۆسـەر ئـەوان ئێوە بتانەوێ تۆڵەی خۆتانیان لێ بکەنەوەو ئازاریان بدەن، ئەوەبو لـە ساڵی حودەیبیە شـەش ساڵ دوای ساڵی کۆچی بێ باوەڕان نەیان هێشت پێغەمەر بۆ تەوافی کەعبە بچێ.

پرسیار/ ئایا خوا نەیفەرمووە: هەرکەسێ دەست درێژی کـردە سـەرتان، دوای ئێـوەش دوەست درێژی بکەنە سەر ئەوان بە ئەندازەی دەست درێژییەکە؟، هـۆی چ شـتێکە لـێرە قەدەغەی کردووە؟.

وەڵام/ ئەو ئایەتە هاتوەتە خوارەوە لە بارەی تۆڵە کردنەوە لەچەند جێگەیـەکی تایبـەتی کە لـە جەنگدا کەسێ لـەبێ باوەڕان موسڵمانێ بکوژێ یا ئەندامێکی لەناو بردبێ، ئەو کاتە سەربەسەر بەبێ زۆرتر تۆڵەی ئەکرێتە. نەك بۆ ڕێگەگرتنە لە پەرستن یا بازرگانی ئەو کاتـە نابێ ڕێگە لـەبێ باوەڕان بگیرێ. بەڵکو تۆڵـەیان لێ ئەکرێتەوە بە سزایەتر.

بەکورتی تۆڵەکردنەوە وائەبێ بە وێنەی تۆڵـەیە ئەبێ، وایش ئەبێ بـە شـتێ تـری جگـە ئەوئەبێ لە هەموو کاتێکا پێویستە تۆڵەکردنەوە هەر لـەبەر سەرکەوتنی ڕاستی بێ، نەك بـۆ تۆڵە کردنەوە بێ بە تەنها. بۆ ئەو مەبەستە خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَتَعاوَنُوا عَلَى الْبِرِ وَالْتَقوى ﴾ وەئێوە یارمـەتی و کۆمـەکی یـەکتری بکـەن لەسـەر چاکەکردن و لـەسەر لێ بوردن لە یەکتری و چاوپۆشی کردن لـە یـەکتری، لـە پـەیڕەوی خواو پێغەمەر دەرمەچن.

﴿ وَلا تَعاوَنُوا عَلَى الإِثْمِ وَالْعِدْوانْ ﴾ وەئێوە یارمەتی یەکتر مەدەن لـەسەر گوناە کـردن و بـێ فـەرمانی خـواو ڕابواردنـی جیـهان و لـە سەردەسـت درێـژی کـردن و دژایـەتی فورمانەکانی خوا.

﴿ وَأتَّقُوا اللهَ إنَّ اللهَ شَدِيدُ الْعِقابِ ﴾ وەئێوە لـە خـوا بترسـن لـە پـەیڕەوی نـەکردنی فەرمانەکانی خوا. بەڕاستی زۆر سەختە سزادانی خواو تۆ لەسەندنی خوا.

٢- هەموو خواردن و خواردنەوەیە ڕەوایـە مەگـەر دەقـی یاسـا هاتبێتـە خـوارەوە بـۆ قەدەغەکردنی شتێ بە تایبەتی. لە ئایەتی (١)ی ئەم سورەتەداباسـی قەدەغـەکردنی هـەندێ شت کرا، لەم باسەی دووهەمدا ئەمانەی خوارەوەش قەدەغە ئەکرێن.

حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحْمُ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ وَٱلْمُنْخَنِقَةُ وَٱلْمَوْقُوذَةُ وَٱلْمُتَرَدِّيَةُ وَٱلنَّطِيحَةُ وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُوا۟ بِٱلْأَزْلَٰمِ ذَٰلِكُمْ فِسْقٌ ٱلْيَوْمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن دِينِكُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا فَمَنِ ٱضْطُرَّ فِى مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٣)

﴿ حُرِمَتْ عَلَيْكُمْ ﴾ قەدەغە کراوە لەسەر ئێوە ئەم (١٠) شتانەی خوارەوە:

١- ﴿ الميتة ﴾ خـواردن و بـەکارهێنانی مرداربـو مرداربـو گیاندارانـێ بـە گوێـرەی دەستوری ئیسلام سەر نەبڕابن.

بۆ زانین: پێویستە سەربڕینی ئەو گیاندارانەی گۆشتیان ئەخورێ بەشتێکی تیژ وەك ئاسن و مس و زێڕو درەخت و بەرد. بەڵام نەك بە نینۆك و ددان و ئێسك. مەرجە بڕینی هـەموو

قورگ و سورێژ بە تەواوی و بچوکترین بازنەیە لە قورك بەسەری سەربڕاوەکەوە بمێنێتەوە بەلای شافعیەکان و مالیکیەکانەوە. بەلای شافعییەکانەوە وا چاکە ڕوبەڕووانگەبێ و ناوی خوای لەسەر ببرێ و سڵەوات لەسەر پێغەمەر بدرێ لەکاتی سەربڕیندا. بەلای مالیکیەکانەوە پێویستە ناوی خوا ببرێ و نیازی سەربڕین بکرێ. بەلای شافعییەکانەوە واچاکە بڕینی هەردوو شادەماری ئەم لاولای ملی سەر براوەکە. بەلای مالیکیەکانەوە پێویسە بڕینیان. بەلای حەنەفیەکانەوە پێویستە بڕینی قورگ و سورێژەو یەك دانە لە دووشادەمارەکان بەلای حنبەلیەکانەوە پێویست نی‌یە بڕینی هەموو قورگ و سورێژە، لەمەو دوا باسی ئەکرێتەوە. بەلای یاسای ئیسلامەوە کاتێ ڕەوایە خواردنی ئەو گیاندارانەی سەر ئەبرڕێن ئەو کەسەی سەریان ئەبڕێ پێویستە موسڵمان بێ یا خاوەن نامەکانبن، ئیترمناڵبن یا ژنبن، بەو مەرجەی مناڵەکە چاك و خراپ جوێ بکاتەوە. لەمەودوا لە باسی مانای ئایەتی (٤)دا بەدرێژی باس ئەکرێن ماسی و کولە سەبڕینیان پێویست نیە، ئەو پێچوەی لە سکی دایکە سەبڕاوەکەیەتی دواتر پێویست نی‌یە سەربڕینی پێچوەکە. ئەو گیاندارانەی توانای سەربڕینیان بۆنەبێ وەك بەسەر کێوێکەوە بن یا لە نێو چاڵێکابن بە نییازی سەربڕین شتێکی تیژیان ئاڕاستە بکرێ و بمرن ڕەوایە خواردنیان، هەروەها گیانداری کێوی سەگێکی ڕاوکەر یا باڵندەیە بیان کوژن یا شتێکی ئاڕاستە بکرێ و بمرن خواردنیان ڕەوایە.

هۆی قەدەغەکردنی مرداربوو لەبەر ئەمەیە: خوێن زۆر ناسك و نەرمە، دوایی هەر کاتێ گیاندار لە خۆیەوە بمرێ خوێنەکەی ئەمێنێتەوە لەنێو دەمارەکانداو خراپ ئەبێ و نەخۆشی و زیانی زۆری لێ پەیدا ئەبێ. باسکردنی ئەو شتانەی ڕابوردون لێرە بۆ ئەوەیە مرداربوون.

٢- ﴿ وَالدَمُ ﴾ وە قەدەغە کراوە لەسەر ئێوە خوێنی ڕەوان کە بە توندی دێتە دەرێ و جوێ ئەبێتەوە لە گۆشت. بەڵام خوێنی وەستاو وێنە سپڵ و جگەر خواردنیان دروستە، ئەو خوێنەیش ئەمێنێتەوە بەسەر ئێسك و گۆشتەوە خواردنی دروستە.

٣- ﴿ وَلَحْمُ الْخِنْزِيْرَ ﴾ وەقەدەغە کراوە لەسەر ئێوە خواردنی گۆشتی بەرازو بەکارهێنانی هەموو ئەندامەکانی بۆ هەر شتێ بێ، پیسەکەی بە دەباغ کردن پاك نابێتەوە. بەڵام پێسەی جگەی بەراز بە دەباغ کردن پاك ئەبێتەوە. موسڵمانان بە تێکڕایی پێك هاتوون بەبێ جیاوازی لەسەر قەدەغەی گۆشتی بەراز، چونکە بەراز چاو برسی ترینی گیانەوەرانەو سڵ لە خواردنی هیچ شتێ ناکاتەوە، زۆرترین و خۆشترین خواردەمەنی بەراز شتە پیسەکانە. کەواتە خواردنی گۆشتی بەراز ئەبێتە هۆی پەیداکردنی ڕەوشت و خوی پیس لە دەرونی بخۆرەکانیا، بە تایبەتی کرمی تەنها (الدورة الوحیدة) وێنەی خواردنی گیانەوەرانی نەخۆش نەخۆشی لەلەشدا پەیدا ئەکەن. زانا کارامەکان ڕونیان کردۆتەوە کە خواردنی گۆشتی بەراز ئەبێتە هۆی پەیداکردنی جۆرەها کرمی کوشندە لە لەشی بخورانیدا، چەوری و ئەندامەکانی وەك گۆشتەکەی قەدەغەن، زانایان ئەڵێن میکرۆبە کوشندەکانی نێو گۆشتی بەراز بەهۆی بەرزترین پلەی گەرمی ناکوژرێن و لەناوناچن.

٤- ﴿ وَما أهِلَ لِغَيْرِ اللهِ بِهِ ﴾ وەقەدەغە کراوە لەسەر ئێوە خواردنی گۆشتێ دەنگ بەرز بکرێتە لە کاتی سەر بڕیندا بۆ جگەی خوا، واتە ببێژرێ بەناوی فلان یا بە ناوی فلان مرۆڤەوە ئەم گیاندارە سەر ئەبڕم.

٥- ﴿ وَالْمُنْخَنِقَةُ ﴾ وەقەدەغە کراوە لەسەر ئێوە خواردنی گۆشتی گیاندارێ خنکێنرابێ بە دەست یا بەهەر شتێ تر بێ، وەئەو گیاندارە بەمردارۆ بوو دائەنرێ.

٦- ﴿ وَالْمَوْقُوذَةُ ﴾ وەقەدەغەکراوە لەسەر ئێوە کۆشتی گیاندارێ بکوژرێ بە لێدانی بە هەر شتێ بێ هەتا ئەمرێ، بە مردابوو دائەنرێ.

٧- ﴿ وَالْمُتَرَدِّيَةُ ﴾ وەقەدەغەکراوە لەسەر ئێوە کۆشتی گیاندارێ بکەوێتە خوارەوە لە جێگایەکی بەرزەوەو بمرێ، یا بکەوێتە نێو چاڵێك و بمرێ، ئەوانە مرداربون. ئەگەر تیرێ بهاوێژرێ بۆلای گیاندارێ لەسەر کێوێ و بکەوێتە خوارو بمرێ خواردنی قەدەغەیە، چونکە نازانرێ بەو تیرە کوژراوە یا بەکەوتنە خوارەوە .

٨- ﴿ وَالنَّطِيحَةُ ﴾ وەقەدەغەکراوە لەسەر ئێوە کۆشتی گیاندارێ قۆچ و لقەی لێ بدرێ و بمرێ، بە مردارەوەبوو دائەنرێ.

٩- ﴿ وَما أَكَلَ السَبَعُ ﴾ وەقەدەغەکراوە لەسەر ئێوە گۆشتی گیانداریٚ دڕندە بریندارى کردبیٚ و بمریٚ بەو برینەیا دڕوندەیە گییانداریٚکی کوستبیٚ و بمریٚ و پاش مادەی گۆشتکەی خواردنَی قەدەغەیە.

﴿ إلاّ ما ذَكَيْتُمْ ﴾ مەگەر گیانداریٚ لە بڕگەکانی پێنچ بە دواوە ئێوە سەرتان بڕیبن و گیانیان تێدا مابیٚ، ئەوانە ئەو کاتە خواردنیان قەدەغەنین، نیشانەی گییان پیٚ مانیان بە مانە دەرئەکەویٚ: چاویانٚ یا ئەندامیٚ تریان بجوڵێن لە کاتی سەربڕیندا.

١٠- ﴿ وَما ذُبِحَ عَلَى النُصُبِ ﴾ وەقەدەغەکراوە لەسەر ئێوە گۆشتی گیانداریٚ سەربڕیٚ بەسەر ئەو بەردانەدا دانراونٚ لە دەوری خانەی خواردان و ووابزانریٚ پەرستنی خوایەو خوێنەکەیان ئەڕژان بەسەر ئەو بەردانەدا.

بۆ زانین: ئەوەی شایانی باسبیٚ خوادەمەنی‌یە قەدەغەکراوەکان هەر ئەو (١٠) بەشانە نین. بەڵکو قەدەغە کراوی تر زۆرن وەك خواردنی گۆشتی سەگ و گورگ و چەقەڵ و شێر و پڵنگ و فیل و گییانەوەرانی دڕندەی ترو هەموو باڵندەی شکارکەر، وەك بازو هەڵۆو قەدەغەکردنی ئەوانە لە فەرموودەکانی پێغەمەرەوە وەرگیراوە.

لای مالیکیەکان جگە لەو (١٠) شتانە خواردنی گۆشتی هیچ گییانداریٚ تر قەدەغە نیە دوای ئەوەی خوای مەزن باسی قەدەغەکردنی ئەو (١٠) شتانەی بۆ کردین، باسی قەدەغەکراوی تریان بۆ ئەکا و ئەفەرمویٚ:

﴿ وَان تَسْتَقْسِمُوا بِالأَزْلامِ ﴾ وەقەدەغە کراوە لەسەر ئێوە کە داوای ڕون کردنەوەی بەشێك و شتێکی نادیاری بکەن بە هۆی چەندین پارچە درەختیٚ لە وێنەی تیردا تاشرابوون.. ناوەڕۆکی ئەو رستەیە لەوەوە هاتووە عەرەبەکان نیازیان بکردایە کارێکی گرنگیان بکردایە، وەك بڕیاردان بۆ جەنگ و هێنانی ژن و چونیان بۆ کاروان و بازرگانی و ڕووداوی ترسیٚ داری بچوکی سەرتێژیان هەبوو: لەسەر یەکەمیان نوسرابوو پەروەردگاری من فەرمانی پێداوم. لەسەر دووهەمیان نوسرابوو پەروەردگارم قەدەغەی

کردووە لەمن. لەسەر سێهەمییان نوسرابوبێ ئاگایە. دوایـی ئـەو تیرانـەیان دائەپۆشـی بـە شتێ، دەستیان ئەبرد یەکێکیان ئەهێنایە دەروە ئەگەر یەکەمیان بووایە ئەچون بە سـەردەمی کارەکەیانەوە. ئەگەر دووهەمیان بهاتایەتە دەرەوە وازیان لە نیازی خۆیان ئەهێناو نەئـەچون بۆ کردنێ. ئەگەر سێهەمیان بهاتایەتە دەرەوە جارێکی تر یا زۆرتـر ئـەو کارەیـان کـردەوە هەتا یەکەم یا دووهەم ئەهاتە دەرەوە. قەدەغەکردنی ئەو کارە لەبەر ئەوەبوو کاری نادیاری خوانەبێ کەسی تر نازانێ چ جای داری ڕەقی وشکی بێ گیان.

﴿ ذٰلِكُمْ فِسْقٌ ﴾ ئەو شتانەی قەدەغە کرابوون لەسەرتان کردن و خواردنیان لادانە لـە یاساو فەرمانی خواو گوناهی گەورەن.

پرسیار/ ئەگەر داواکردن و زانینی شتی نادیاری بەهۆی هەر بەڵگەیەکەوە قەدەغە بـێ، ئەبێ مانا لێکدانەوەی خەو یا خستنە دڵەوەی شتێ بۆ نـاو دڵـی مـرۆڤ لەلایـەن خـواوە قەدەغەو بێ باوەڕی بێ؟

وەڵام/ زانینی شتێ بەهۆی مانا لێکدانەوەی خەو، یا بـەهۆی خسـتنە دڵـەوە (الألهـام) قەدەغەو بێ باوەڕی نین، ئەوانە جۆرە زانیاریەکن خوا ئەیبەخشێ بە هـەندێ کـەس. بـەڵام داواکردنی زانینی شتی نادیاری بـە هـۆی ئـەو تیرانـەوە گومـانی ڕوتـن و پـەیوەندیان بـە زانیاریەوە نیە. خوای مەزن کە باسی ژمارەی قەدەغەکراوەکان و ڕەواکانی بۆ کردین، لـە کۆتاییدا فەرموی:

ئەو قەدەغەکراوانە کردن و خواردنیان لادانن لە ئایین و گونـاهی گـەورەن، لـە پاشـا هانی باوەڕداران ئەدا بۆ دەست گرتن بە دەستوری تەواوی ئایین و ئەفەرموێ:

﴿ الْيَوْمَ يَئِسَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ دِينِكُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِ ﴾ ئەمڕۆ بێ ئومێـد بـوون کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە بە ئایینی ئێوە، بەتەمابوون لەمەوبەر ئایینەکەتان کۆتـایی پێ بێت و نەمێنێ و بگۆڕێ و ئێوە وەرگەڕێن لە ئایینی ئیسـلام. بـەڵام بۆیـان دەرکـەوت باوەڕی ڕاست چەسپاوە لە دەرونی موسڵماناندا و ئایینی ئیسلام ڕێگەی خـۆی گرتـووە،

پەرەی سەندوە لە زۆربەی ڕوی زەویدا ڕۆژبەڕۆژ بەرەو زۆرتر ئەڕوا. کەواتە مەبەست لە ئەمڕۆ لەو ڕستەیەدا ڕۆژێکی تایبەتی نیە. بەڵکو ئەو ڕۆژە بەردەوامە هەتا هەتایە، دوایی ئێوە لەو بێ باوەڕانە مەترسن، ڕۆژگارتان لە سودی خۆتانەو، هەر لە من بترسن و دەستەڵاتی من بەهێزە، نێچیرەکانم لاوازە هەڵمەتم تیژەو گرتوخانەم دورو درێژەو کۆتایی نایە.

بەڕاستی ئایینی ئیسلام وەك مێژوو تاقیکردنەوەکان بۆمان دەرئەخەن هێزێکی وانەبووە زاڵ بێ و خۆی بسەپێنێ بە تۆپزی و بەزۆر بەسەر هەموو دانیشتوانی ڕوی زەویدا. بەڵام هێزێکی خۆڕاگر بووە بەرانبەر بە دوژمانانی خۆی و توانیویەتی خۆی بپارێزێ لەنەمان بەسەدان ساڵ، خۆڕاگرتنی ئایینی ئیسلام لەکاتی لاوازی موسڵماناندا جێگەی سەر سوڕمانە، هەروەك سەرکەوتنیشی جێگەی سەرسوڕمانە لەکاتی هێزو هەڵمەتیا. هێرشی خاچ پەرستان و تەتەرو گێرە شێوێنی ڕافزیەکان و تابوری پێنجەمی نێو موسڵمانان و کاربەدەستانی خۆفرۆشیان و خۆڕاگرتنی ژمارەیەکی کەم لە بەردەمیاناو بەسەر گرتنەوە سام و شکۆی بەڕێز پاڵەوانی کورد سەلاحەدینی ئەیوبی و سەربازە کوردەکانی بەرانبەر بە خاچ پەرستان و ڕاوەستانیان بەرانبەر بە پیلانی ناوخۆ، پەلاماری هەندێ لەنەوەکانی جنگیزخان دوای موسڵمان بونیان بۆسەر هێرشی هۆلاکۆو ڕافزیەکان و سەرلەنوێ هاتنەوەی ئایینی پاکی ئیسلام بۆسەر زەوی وەك جاران، ئەوانە هەموویان جێگەی سەر سوڕمانن بۆ خۆڕاگرتنی ئایینی ئیسلام لەکاتی لاوازیدا.

هێرشی فراوانی ڕۆژئاوایی و شیوعیەکان لەسەردەمی نزیکەی ساڵی (١٨٠٠) زایینی هەتا ئەم سەردەمەی ئێستا بەبێ ووچان، ناردنی هەزاران زانای شەیتان بۆ نێو موسڵمانان بۆ لادانیان لە ئایین و بەو هەمووە سامان و چەکەیانەوە بۆ سەر وولاتی ئیسلام بۆ بنەبڕکردنی ناوی ئیسلام بە یارمەتی کاربەدەستانی بە ناو موسڵمان و بەردەوامی ئەو هێرشە ناڕەوایە هەتا ئەم سەردەمەی ئێمەی (١٩٩٩) زایینی و خۆڕاگراتنی بیروباوەڕی

ئیسلام زۆرتر جێگەی سەرسوڕمانە بەو هەمووە لاوازی و بێ چەکیەوە هەن و خاوەنی سامان و زانیاری و ڕامیاری نین، بە تایبەتی کاربەدەستانی بەناو موسڵمان بە گشتی کە دژی یەکترین هەریەکەیان بۆ چەسپاندنی کورسی خۆیان دوژمنایێتی ئایین ئەکەن بۆ گەورەیی خۆیان.

بەڕاستی ئایینی ئیسلامیش ڕێگەی خۆی گرتووەتە بەرو بڵاوبۆتەوە بەبێ جەنگ و لەگەڵ دژایێتی کاربەدەستانی بەناو موسڵمان بۆ چەسپاندنی یاسای ئیسلام و بێ ڕامیاری و نەزانینی زوربەی موسڵمانانی ئایین پەروەرو ڕاست. سوپاس بۆ خوا بەبێ تەخت و کڵاوی پاشایێتی زوربەی ڕوی زەوی داپۆشراوە بە ئایین و مامۆستاو زانای زۆری پەیدا کردووە، بە یارمەتی خوا ئایینی ئیسلام ئەکەن بە پێشەوای هەموو ڕوی سەر زەوی.

بۆ نمونە: زۆرتر لە سەد ملیۆن موسڵمان پەیدابوون لە وڵاتانی دوور، بێ ئەوەی نیشتمانێکی ڕامیاریان هەبێ، هەروەها بەبێ جەنگ ژمارەی زۆریان پەیدا کردووە لە یابان و چین و سۆمەترەو فلیبین و بەریتانیا و ئەڵمان و یۆگۆسلافیا و وڵاتی تریش، ئەوانەیش هۆی ئەوەیە ئایینی ئیسلام ئاسانە و دوورە لە ئەفسانەو پڕوپوچ، دانیشتوانی ئەو جێگایانە ژیرو بەبیرن.

﴿ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ ﴾ ئەمڕۆ لەمەودواییش تەواوم کردووە بۆ ئێوە ئاینەکەتان بە جۆرێ شایستەو شایانە بۆ هەموو کات و جێگەیە هەتا ڕۆژی دوایی، ناتەواوی تێدانیە هەموو فەرمانە پێویست کراوەکان و چاکەکان و قەدەغەکراوەکان و کارە ڕەواکانی تێدا ڕوون کراوەتەوە. لەم ڕۆژە بەدواوە ترسی بت پەرستانم لەسەر هەڵگرتن، لەمەو پاش نابێ بت پەرستان حەج بکەن لەگەڵتان، ئایینی ئیسلام تازە هەڵناگیرێ و لەناوناچێ، بیروباوەڕی خۆی لە نێو ئادەمیزادا بڵاوئەبێتەوە. بەسەر هەموو ئاینەکاندا ڕون کراوەتەوە، بڕیارم داوە باوەڕتان بە هەموو پێغەمەران و نامەکانی خواتان هەبێ. لەمەو پاش ئاسودەبن لە باوەڕهێنانتانا بەبێ ترس، لەلایەکەوە بێ هێزی ڕوی تێ بکا، لەلایە ترەوە سەر هەڵ ئەدا بە هێزترو بە ئاسانتر.

﴿ وَأَتمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي ﴾ وەمن تەواوم کرد بەسەر ئێوەدا چاکەی خۆم بە ڕانمویی کردنتان و بە تەواوکردنی یاسای ئایینتان و مەکەتان داگیرکرد بە یارمەتی دانی خۆم، پاك کرایەوە لە بت پەرستی.

﴿ وَرَضِيتُ لَكُمْ الأِسْلامَ دِيناً ﴾وەمن هەلّم بژارد بۆ ئێوە ئیسلام بە ئایین بۆتان و پێم چاکە ئاینتانبێ، هەرگیز لێی لانەدەن، پاکترو پوختەترینی هەموو ئاینەکانە، کردومە بە یاسا بۆ پەرستیی نی خۆم لە هەمو ژیانی ڕۆژانەتانا و بۆ ئێوەش هەتا هەتایە.

خوای مەزن فەرمودەی خۆی ڕوبێ ئەکاتەوە بۆلای ئەو شتانەی قەدەغەکرابوون و ئەفەرموێ:

﴿ فَمَنِ أضْطُرَ فِي فَحَمَصَةِ غَيْرُ مُعَجانِفٍ لأِثْمِ ﴾ دوای هەرکەسی داماوی ڕوی تێ کرد بەهۆی برسێتی کە ببێتە هۆی نەمان و مردنی، چاری نەماو ئەبوایە ئەو شتانەی قەدەغەن بیان خوا بە جۆرێ لانەدا بۆلای گوناە و لەوە دەرچێ زۆرە خۆری بکا، ئەندازەیە بخوا پێی نەمرێ. ئەو کاتە بۆ ئەو کەسە هەیە لەو قەدەغەکراوانەی پێشوو بخوا، ناچاری پالّی پێوە بنێ، نەك بۆ ڕابواردن و کاتی هەرزانی، وەك هەندێ کەسی سەر لێ شێواوی بەناو موسڵمان گۆشتی بەراز ئەخۆن. ئەو کەسانە ئەگەر بەڕەوای دابنێن ئەو خواردنە ئەبنە بێ باوەڕو لە ڕیزی ئیسلام دەرئەچن.

﴿ فَأنِ اللهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ دوای بە ڕاستی خوا لێ خۆشبوونی زۆرە بۆ ئەو کەسانە بە داماوی و ناچاری ئەو قەدەغە کراوانە ئەخۆن، میهرەبانە بۆ بەندەکانی خۆی کە ئەو شتە قەدەغەکراوانەیان بۆڕەوا ئەکا لەکاتی ناچاریدا.

کاتێ خوای مەزن باسی ئەو شتانەی کرد خواردن و کردنیان قەدەغەن لەگەڵ ئەوانەیشدا ڕەوای کردبون، دوایی باسی هەندێ لەو شتانەمان بۆ ئەکا کە پێغەمەر پرسیاری لێ ئەکرێ و وەڵامی ئەداتەوەو ئەفەرموێ:

يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمْ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَـٰتُ وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ ٱلْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ ٱللَّهُ فَكُلُوا۟ مِمَّآ أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ وَٱذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ



﴿ يَسْئلونَكَ ماذا أحِلَّ لَهُمْ قُلْ أحِلَّ لَكُمُ الطَيباتُ ﴾ پرسیار ئەكەن لەتۆ چ شتێ ڕەوایە بۆ ئەوان لە خواردمەنی؟ تۆ بلێ لە وەڵامی ئەواندا؟ ڕەوكراوە بۆ ئێوە خواردن و خواردنەوەی ئەو شتانەی پاك و خاوێنن و دەرونێ خاوەنی ڕەوشتێكی پاكبێ پێزیان لێ نەكاتەوەو یاسای قەدەغەی نەكردبێ، بۆ ئەوەی بەر لەوەی نزیكی بكەونەوە بزانن كام خواردەمەنی ڕەوایە. كەواتە ئەو شتانەی بێزیان لێ بكرێتەوە قەدەغەن وەك مردارەوەبوو خوێن و گۆشتی بەرازو ئەو شتانە سروشتی پاك بێزی لێ ئەكاتەوەو ئەوانەیش كەسەرئەبڕێن بۆ بتەكان بە گوێرەی یاسا سەرنابرڕێن.

﴿ وَما عَلَمْتُمْ مِنَ الْجَوارِحِ مُكَلِّبِينَ ﴾ وەڕەوا كراوە بۆ ئێوە نێچیرو كوژراوی شتێكی ئەوتۆ ئێوە فێری ڕاوتان كردووە لە شكاركەران، ئیتر چوار پێ بن یا باڵندە، وەك سەگ و تانجی و هەڵۆو بازو جگەی ئەوانیش لە كاتێكا ئێوە سەگ و ئەوانەی ترتان فێری ڕاوكردبێ، بەجۆرێ ئێوە ئەتانەوێ بڕۆن و بێنەوە، نەك لەخۆیانەوە نێچیر بگرن یا گۆشتەكەی بخۆن.

﴿ تُعَلِمُونَهُمْ مِما عَلَمَكُمْ الله فَكُلُوا مِما أمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ ﴾ ئێوە ئەو شكاركەرانە فێر بكەن لەشتێ خوا فێری ئێوەی كردووە داینـاوە لە مێشكتانا وەرتان گرتووە بەهۆی

ئەقڵتانەوە بۆ فێرکردنیان بەو جۆرە فێرکردنانە یاسا ڕونی کردۆتـەوە، دوایـی ئێـوە بخۆن هەندێ لەو نێچیرانە شکارکەرەکان گرتویانن بۆ ئێوە، یانێ لەوانە هیـچ شتێ نـەخۆن بـۆ خۆیانیان گرتبێ.

﴿ وَأذْكُرُوا أسْمَ اللهِ عَلَيْهِ وَأتَقُوا اللهَ إنَ اللهَ سَرِيْعُ الْحِساب ﴾ وە ئێوە ناوی خـوا ببـەن لەسـە ر ئـەو شـتەی ئـەوان گرتویانـە لـەکاتی بـەرەڵاکردنی شـکارکەرەکان و لـەکاتی گرتنیداو، ئێوە لـە خوابترسن و ناوی خوا ببەن و خۆتان بپارێزن لـە خواردنی ئەو شـتانەی قەدەغە کراون لەم کاتەدا کە هەموو شتێکتان بۆ ڕون کراوەتەوە. بەڕاسـتی خـوا زۆر بـە پەلەو گورجی پرسیار لـە ئێوە ئەکاو پاداشتی چاکەو خراپەتان ئەداتەوە گەورەو بچوکیان.

مەرجەکانی فێرکردنی خاوەن شکارەکان بۆ شکارکەرەکانیان چوار شتن:

١- پێویستە ئەو شکارکەرە فـێری ڕاوو نێچـیرگرتن کرابـن، بـەجۆرێ خاوەنـەکانیان ئەیانەوێ. یانێ کە فەرمانی پێدان بڕۆن بۆلای نێچـیر بـڕۆن، ئەگـەر بـانگی لێ کـردن بـۆ گەڕانەوە بگەڕێتەوە.

٢- هەر کاتێ نێچیرەکەی گرت نەیخوا، ئەگەر خواردی بۆخـۆی گرتـووە نـەك بـۆ خاوەنەکەی. کەواتە خواردنی قەدەغەیە.

٣- پێویستە خاوەنەی بە نیازی ڕاوەوە بەرەڵای کردبێ، ئەگـەر لـە خۆیـەوە ڕۆیشـتو نێچری گرت و هێنایەوە بە مردویی خواردنی قەدەغەیە.

٤- پێویستە ئەو مەرجانەی پێشوو لەو شکارگەرانەوە بێتەدی چەند جارێ بـە جـۆرێ ببن بە سروشت بۆیان.

هـەموو زانایـانی ئیسـلام بڕیاریـانداوە ئەگـەر ئـەو مەرجانـە نەهاتنـەدی خواردنـی گیراوەکانیان ڕەوانیە مەگەر نێچیرە گیراوەکان زیندوبن و سەربڕێن، پێویستە ڕاوچیـەکان موسڵمانبن یا خاوەن نامەکانبن وەك گاورو جولەکە. نەگ ئاگر پەرست و بـێ بـاوەڕان و ئایینەکانی تر. زانایان جگە حەنبەلیەکان لایان وایە واچاکـە نـاوی خـوا بـبرێ لـە کـاتی بەرەڵاکردنی شکارکەران و سەبڕینی گیانداران. بەڵام لای حەنبەلیـەکان پێویسـتە نـاوی خوا ببرێ.

مەرجەکانی سەربڕینی گیانداران بریتین لەم شتانە:

١- بڕینی قورگی گیاندارەکە کە جێکە چونە خوارەوە هاتنەدەرەوەی هەناسەیە بەو مەرجە کەمترین بازنەیە لە قورگ بچێ بەلای سەری گیانەوەرەکەوە.

٢- بڕینی سورێژە کە شوێنی چونە خوارەوەی خواردن و خواردنەوەیە، بەو مەرجەی بۆ قورگ باسکرا، پێویستە بڕینی هەردوولایان بەیەکەوبێ.

٣ - بڕینی هەردوو شادەماری ئەم لاو ئەولای ملی گییاندارەکە، بڕینی ئەو دوو شادەمارانەە لای شافیعەکان مەرج نیە، بەڵام واچاکە ببڕێن، هەروەها ناوی خواربردن مەرج نیە بۆ ڕەوابونی خواردنی گوشتەکانیان.بەڵام لای حەنبەلیەکان مەرجە بەلای جگەی ئەوانەوە وا چاکە ناوی ببرێ لە کاتی سەربڕیندا.. ئەو گیاندارانە ئەندامێکیان نەمابوو کە بەبێ ئەو ئەندامە نەژین، وەك وورگ و مێشك و لای مالیکی و حەنبەلیەکان خواردنیان قەدەغەیە.

تێبینی: باسکردنی ڕاو بە شکارەکان و مەرجەکانی و باسی مەرجی سەربڕینی گییانداران لە باسی ماناکردنی ئایەتی (٣)ی ئەم سورەتەدا کراوەو جێگەی شایانە، هەرچەندە دووپات کراوەتەوە. بەڵام بێ سوود نیە باسیان لە هەردوولادا.

پاش ئەوەی خوای مەزن باسی ئەو خواردەمەنیانەی کرد ڕەوایە خواردنیان، باسی خواردەمەنی ڕەواترمان بۆ ئەکا لەگەڵ ڕەوایی مارەکردنی هەندێ لە ژنان و ئەفەرموێ:

ٱلۡيَوۡمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حِلّٞ لَّكُمۡ وَطَعَامُكُمۡ حِلّٞ لَّهُمۡۖ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحۡصِنِينَ غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِيٓ أَخۡدَانٖۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلۡإِيمَٰنِ فَقَدۡ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٥﴾

﴿ الْيَوْمَ أُحِلَّتْ لَكُمُ الطَّيِّباتُ ﴾ ئەمڕۆ ڕەوا کراوە بۆ ئێوە هەموو خواردەمنیە پاکەکان مەگەر بە دەقێکی یاسا یابەراوردی زانایان قەدەغە کرابێ. دووپات کردنەوەی ئەو ڕستەیە بۆ بەهێزکردنی ناوەڕۆکەکەیەتی.

﴿ وَطَعامُ الذِيْنَ أُوْتُوا الْكِتابَ حِلٌ لَكُمْ ﴾ وە خواردەمەنی کەسانێکی ئەو بەخشراوە بەوان نامەی خوا، وەك جولەکەو گاورەکان ڕەوان بۆ ئێوە خواردنیان، ئیتر گۆشتی گیاندارە سەربڕاوەکانیانبن یا جگەی ئەوبێ. بەمەرجێ بە گوێرەی یاسا ئیسلام سەبڕابن و ڕەوابن لە هەموو ڕوێکەوە.

﴿ وَطَعامُكُمْ حِلٌ لَهُمْ ﴾ وەخواردەمەنی ئێوەیش ڕەوایە بۆ خاوەن نامەکان. یانێ دروستە بۆ ئێوە خواردەمەنی خۆتان بفرۆشن بەوان و مامەڵەیان لەگەڵ بکەن.

﴿ وَالْمُحْصَناتُ مِنَ الْمُؤْمِناتِ ﴾ وەڕەوایە بۆ ئێوە مارە برینی ژنانی داوێن پاك و سەربەست لە ژنانی باوەڕداران. یانێ چاك وایی ئەوانە بخوازن و مانای وانیە ژنانی داوێن پیس و کارەکەرەکان قەدەغەبێ مارەکردنیان، بە مەرجێ کارەکان باوەڕداربن.

﴿ وَالْمُحْصَناتِ مِنَ الذِيْنَ أُوتُوا الْكِتابَ مِنْ قَبْلِكُمْ ﴾ وەڕەوایە بۆ ئێوە مارەکردنی سەربەست و داوێن پاك لە کەسانێکی ئەوتۆ نامەیان پێ بەخشراوە بەر لە ئێوە، وەك گاورو جولەکەکان. کارکەری کۆیلەی بێ باوەڕی خاوەن نامە مارەکردنی دروست نیە لای شافعییەکان، بەلای حەنەفیەکانەوە ڕەوایە مارەکردنیان.

﴿ إذا آتَيْتُمُوهُنَ أُجُورَهُنَ مُحْصِنِينَ غَيْرُ مُسافِحِينَ وَلا مُتخِذِي أخْذان ﴾ هەرکاتێ ئێوە بەخشیبێتان بەوان مارەییەکان و مارەتان کردبن بە گوێرەی یاسا ئێوە داوێن پاکبن جگەی ئەوانەتان داوێن پیسبن و مارەتان نەکردبن و، جگەی ئەوانەتان وەرتان گرتبێ چەندین دۆستی لە پەنهەنیدا داوێن پیسیان لەگەڵ بکەن، ئەوانە بۆ ئێوە ڕەوا نین باکرێیان بدەنێ بۆ کردنی داوێن پیسی.ئەو ڕستانەی پێشوو بەڵگەی تەواون لەسەر ئەوەی ئەو مارەییە پێویستە بەرامبەر بە مارەکردنی ئەو ژنانەبێ مارەکرابن بە گوێرەی یاسای ئیسلام. نەك بەرامبەر بە داوێن پیسی هەموو زانایان بڕیاریانداوە بە گوێرەی بەراوردی خۆیان (القیاس) قەدەغەیە لەسەر موسڵمانان مارەکردنی ژنانی بێ ئایین و ئاگر پەرست و بت پەرستان.

دوای ئەوەی خوای مەزن باسی هەندێ لە کارە ناڕەواکـان و کـارە ڕەواکـانی کـرد، باسی ئەوەیشمان بۆ ئەکا ئەو کەسەی فەرمودەکانی بیست و پەرستنی بـۆ کـرد بەڕاسـتی خاوەنی باوەڕەو کردەوەکانی لێ وەرئەگیرێ و پاداشتی ئەدرێتەوە لەلایەن خوای مەزنـەوە، ئەو کەسەیش بێ باوەڕەو بە دەستوری خوا هەڵناسێ زەرۆمەندە ، خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَمَنْ يَكْفُرْ بالإيمانِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلَهُ ﴾ وەهەرکەسێ باوەڕنەهێنێ بە دەستوری خواو بە هەموو قەدەغە کراوەکان و کارەڕەواکان، دوایی بە ڕاستی پوچ بوونەوە پاداشـتەکانی لـە جیهاندا.

﴿ وَهُوَ فِي الأخِرَةِ مَنَ الْخاسِرِينَ ﴾ وەئـەو کەسـە لـە دوارۆژدا لـە زەرەرمەندەکانـەو بەهەشتی لە کیسی خۆی داوە.

کاتێ خوای مەزن لەمەوبەر فەرمانی دا بەجێبەجێ کردنی بەڵێنەکانی خۆی کە یەکێکە لەو بەڵێنانە کردنی نوێژ کە مەرجە بـۆ کردنـی دەسـت نوێـژ شـۆردن، لەمـەودوا باسـی چۆنیەتی دەست نوێژو مەرجەکانی ئەکاو ئەفەرموێ:

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُوا۟ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ وَٱمْسَحُوا۟ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ ۚ وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَٱطَّهَّرُوا۟ ۚ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَـٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً فَتَيَمَّمُوا۟ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُوا۟ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُ ۚ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ

لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٦﴾ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمِيثَٰقَهُ ٱلَّذِى وَاثَقَكُم بِهِۦٓ إِذْ قُلْتُمْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٧﴾

﴿ يا أيها الذينَ أمَنُوا إذا قُمتُمْ إلى الصَلاةِ ﴾ ئەی کەسانێکە ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە هەرکاتێ هەڵسان بۆ لای نوێژ کردن و دەست نوێژتان نەبوو.

﴿ فأغْسِلُوا وَجُوُهَكُمْ وَأيْدِيَكُمْ إلى الْمَرافِقِ ﴾ دوای بشۆرن ڕومەتەکانتان.. سنوری ڕومەت بە درێژی دەست پێ ئەکا لە شوێنی سەوز ەبوونی موی سەر بە زۆری هەتا کۆتایی چەناگە، بە پانی نێوانی هەردوو گوێچکەیەوە، ئێوە بشۆرن دەستەکانتان لەگەڵ ئانیشکەکانتان.

﴿ وَأمْسَحُوا بِرُؤُسَكُمْ ﴾ وەئێوە دەستە تەڕ بهێنن بەسەری خۆتانا، کەمترین ئەندازەی سەر دێتە جێبەمەرجێ کەمتر نەبێ لەسێ موو لە ئاستی سەردا. بەلای حەنەفیەکانەوە ئەبێ کەمتر نەبێ لە چواریەکی سەر.

﴿ وَأرْجُلكُمْ إلى الكَعْبَيْنِ ﴾ وە ئێوە بشۆرن پێکانتان لەگەڵ قاپەکانتانا.

پێویستەکانی دەست نوێژ شەش شتن:

١- نییاز (النیە) یانێ لەیەکەم کاتی گەیشتنی ئاو بە کەمترین بەشێ لە ڕومەت بلێ: نییاز ئەکەم خۆم لەبێ دەست نوێژی پاك ئەکەمەوە، یالەسەر خۆم نوێژ ڕەوا ئەکەم. نییازیش بە دڵە، واچاکە بە زمانیش بیلێ.

٢- شۆردنی ڕومەت بە تەواوی بە پێست و موەوە، دوای نییاز هێنان (٣) شۆردنی هەردوو دەست بەهەردوو ئانیشکەوە دوای بە تەواوی شۆردنی ڕومەت:

٤- دەست هێنان بەسەرکەمترین بەشی سەر، دوای شۆردنی هەردوو دەست.

٥- شۆردنی هەردوو پێ بە قاپەکانیانەوە، پاش دەستی تەڕهێنان بەسەر هەندێ لە سەردا.

٦- ئەو پێنج شتانەی پێشوویەك لە دوای یەکبن بەو جۆرەی باسکران (الترتیب).

٧- زانایان بیریان جیاوازە لە بارەی ئەو ڕستەیە، زۆربەی زانایان ئەڵێن: پێویست هەردوو پێی بشۆرین ئەوەیش بیروبۆچونی هەرچوار پێشەواکانە. حەسەن بەسری و موحەممەدی کوڕی جەریری تەبەری لایان وایە مرۆڤ ئارەزوی هەیە ئەتوانێ بیشۆرێ و ئەتوانێ مەسح بکا. ئینوعەباس و قەتادەو ئەنەس و عەکرەمەو شەعبی لایان وایە ئەبێ مەسیح بکرێ.

سونەتەکانی دەست نوێژ کە چاك وایە بکرێن و پێویست نین (١١) شتن:

١- ووتنی (بسم الله الرحمن الرحیم) لەیەکەم کاتی دەست پێ کردنی بە دەست نوێژ گرتن.

٢- شۆردنی هەردوو لەپ بە ناوەوەو بە دەرەیانەوە لەگەڵ جوژگەکان، پاش ووتنی ناوی خواو بەر لەوەی دەست بکرێ بە شۆردنی دەست نوێژ.

٣- ئاو بەدەمادان دوای شۆردنی هەردوو لەپ (٤) ئاو بە لووتادان دوای دەم شۆردن (٥) دەستی تەڕهێنان بەهەمو سەردا (٦) دەستی تەڕهێنان بەنێو هەردووکونی گوێچکەکاندا بە ئاوێکی تازە (٧) دەست خستنە نێو ڕیشی پڕەوە (٨) دەست خستنە نێوە هەموو پەنجەکانی دەست و قاچ (٩) شۆردنی ئەندامەکانی لای ڕاست بەر لەلای چەپ (١٠) شۆردنی هەموو ئەندامەکانی سێجارسێجار (١١) شۆردنی ئەندامەکان بەبێ وەستان لە نێوانیانا.

﴿ وَإِنْ كُنتُمْ جُنُباً فَاطَّهَرُوا ﴾ وەئەگەر ئێوە لەشتان پیسبوو، دوای ئێوە خۆتان پاك بکەنەوەو لەش پیسی خۆتان دەربکەن. پێویستە لەکاتی لەش پیسی دەرکردندا و خۆشۆردن سێ شت: (١) نییازی لەش پیسی دەرکردن. واتە بلێ: نییازمە لەش پیسی خۆم دەرئەکەم. (٢) لابردنی هەموو پیسی بەسەر لەشەوە ئەگەر هەبوو بەر لە خۆشۆردنی لەش.

٣- گەیاندنی ئاو بە هەمو لەشدا بە گۆشت و مووەوە، چاك وایە بەر لە خۆشۆردن دەست نوێژ بشۆرێ، دەست بهێنرێ بەسەر هەموو لەشدا، بەبێ وەستان لە هەموو لەشی بشۆرێ.

لای ڕاست بەر لەلای چەپ بشۆرێ. لەش پیسی پەیدا ئەبێ بە هاتنە خوارەوەی شاوەت، یا بەیەکگەیشتنی خەتەنەی ژن و پیاو.

﴿ وَإِنْ كُنتُمْ مَرْضى أو عَلَى سَفَرٍ ﴾ وەئەگەر ئێوە نەخۆشبوون و ترستان هەبوو لەناو بچن، یا نەخۆشیەکەتان زۆرتر ببێ ئەگەر ئاو بەکار بهێنن، یا ئێوە لەگەشت و گوزاردابوون و لە کارواندا بوون، ماوەکەی کەمبێ یا زۆر.

﴿ أوْ جاءَ أحَدٌ مِنكُمْ من الْغائِطِ أوْ لا مَستُمُ النِساءَ ﴾ یا یەکێ لە ئێوە هاتە دەرەوە لە ئاودەست خانە شتێکتان لە پێشەوە یا لە پاشەوە دانابوو، یا ئێوە دەستتان دابوو لە ژنانی بێگانە، دەست لێدراو دەست لێدەر وەك یەك وان بۆ شکاندنی دەست نوێژ.

﴿ فَلَمْ تَجِدُوا ماءً فَتَيَمَمُوا صَعيداً طَيِباً ﴾ دوایی ئێوە ئاوتان دەست نەکەوتبوو، یا ئاوتان هەبوو بەلاّم لە پێویستی خواردنەوەی خۆتان وولاّغەکەتان زۆرتر نەبووە، دوایی ئێوە نییازی هەلگرتنی خاکێکی پاك بکەن لە زەویدا و خاوەنی تۆزبێ و جگەی گەچ و لمی تێکەڵ نەبوبێ.

﴿ فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأيْدِيْكُمْ مِنهُ ﴾ دوای ئێوە دەستی تۆزاوی بهێنن بە ڕومەت و بە دەستەکانتانا لەو خاکە تۆزاویە.. مانای ئەو ئایەتە لە ئایەتی (٣)ی سورەتی نیسائدا

بەدرێژی باسی کراوە بە هەموو مەرجەکانی تەیەممەوە، لێرەدا دووپات کراوەتەوە هەتا پەیوەندی پەیدا بکات بە هەموو بەشەکانی خۆ پاك کردنەوەو لەبێ دەست نوێژی و لەش پیسی... لای حەنەفیەکان تەیمم دروستە بە هەموو شتێ لە ڕەگەزی زەویی، ئیتر با بەردێکی لوسی بێ تۆزبێ.

﴿ ما يُرِيدُ اللهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُمْ مِنْ حَرَجٍ وَلَكِنْ يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ ﴾ خوا نایەوێ بە هۆی فەرمان دان بە تەیمم و دەست نوێژ گرتن و لەش پیسی دەرکردن بۆ ئەوە بیدا بەسەر ئێوەدا هیچ جۆرە تەنگ پێ هەڵچنینتان و ئازاردانتان و، بەڵام خوا ئەیەوێ ئەوانە بکەن بۆ ئەوەی ئێوە پاك بکاتەوە لە پیس و پۆخڵی و لە گوناه.

﴿ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ وەبۆ ئەوە خوا تەواو بکا بەسەر ئێوەدا چاکەو میهرەبان خۆی بەرەوا کردنی تەیمم کردن لەو کاتانەی پێشودا، بۆ ئەوەی ئێوە سوپاسی خوا بکەن لەسەر ئەو چاکانەی خوا بەخشیونی بە ئێوەو پاداشتان بداتەوە.

ئادەمیزاد فەرمانێکی وای نەدراوە بەسەردا توشی ئازاریان بکا لە هیچ ڕویەکەوە.هەر فەرمانێ درابێ بەسەریانا فەرو چاکەی زۆری تێدایە، هەرشتێکی قەدەغە کردبێ خراپە و زیانی تێدایە، ئەگەر خراپە و چاکەیان وەك یەك وابوون کامەیان سودی زۆرتربێ ئەوەیان ئەکرێ، ئەگەر یەکێکیان زۆرتر بوو ئەوەیان ئەکرێ و واز لەوی تریان ئەهێنرێ، بۆیە خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ وَاذْكُرُوا نِعْمَةَ اللهِ عَلَيْكُمْ وَمِيثَاقَهُ الذي واثَقَكُمْ بِهِ ﴾ وەئێوە بیری چاکەی خوا بکەن بەسەرتانەوە، بە تایبەتی بەخشینی ئایینی ئیسلام بە ئێوەو، بیری ئەو پەیمانەی ئەوتۆی خوا بکەنەوە خوا فەرمانی داوە بە ئێوە بەوەرگرتنی ئەو پەیمانە.

﴿ إذْ قُلْتُمْ سَمِعْنا وَأَطَعْنا ﴾ لەو کاتەدا ئێوە ووتان بە پێغەمبەر﴿ ﷺ﴾ ئێمە بیستمان ئەو شتانەی تۆ فەرمانی پێ ئەدەی لە فەرمودەکانی خوا، ئێمە پەیڕەوی فەرمانی ئەکەین لە هەموو کاتێکا گرانبن لای ئێمە یا سوکبن لەکاتی هەرزانی و گرانیدا.

﴿ وَأتقُوا اللهَ إنَ اللهَ عَلِيمٌ بذاتِ الصُدُور ﴾ وەئێوە لە خوا بترسن و سوپاسی خوا بکەن و ئەو بەڵێنەی داوتانە بە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لە ڕۆژی پەیماندانتان مەیشکێنن (المبایعە) بەڕاستی خوا ئەزانێ بە نهێنیەکانی دڵتان و پاداشتی شاراوەکان ئەداتەوە چ جای ئاشکراکان ئەبێ بزانین و داواکاری خوا هەر چەندە زۆرن. هەموویان لە (٢) دوو شتا هاتوتە جێ، ئەم ئایەتەی دوای باسیان ئەکاو ئەفەرموێ:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعۡدِلُواْۚ ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿٨﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴿٩﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ﴿١٠﴾

﴿ يا أيُها الذيْنَ أمَنُوا كُونُوا قَوامِينَ للهِ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتـان هێنـاوە ئێـوە ڕاوەستن لەبەر خوا بە ڕاستی بە نییازی پاکـەوە لـە هـەموو گوفتـارو کردارتانـاو هـەموو فەرمانەکانی جێبەجێ بکەن و خۆتان دوربخەنـەوە لـەبێ فـەرمانی خـوا، ئەگـەر خـاوەنی باوەڕن.

بەدرێژی باسی کراوە بە هەموو مەرجەکانی تەیەمومەوە، لێرەدا دووپات کراوەتەوە هەتا پەیوەندی پەیدا بکات بە هەموو بەشەکانی خۆ پاك کردنەوەو لەبێ دەست نوێژی و لەش پیسی... لای حەنەفیەکان تەیەموم دروستە بە هەموو شتێ لە ڕەگەزی زەویی، ئیتر با بەردێکی لوسی بێ تۆزبێ.

﴿ ما یُرِیدُ اللهُ لِیَجْعَلَ عَلَیْکُمْ مِنْ حَرَجٍ وَلَکِنْ یُرِیدُ لِیُطَهِّرَکُمْ ﴾ خوا نایەوێ بە هۆی فەرمان دان بە تەیەموم و دەست نوێژ گرتن و لەش پیسی دەرکردن بۆ ئەوە بیدا بەسەر ئێوەدا هیچ جۆرە تەنگ پێ هەڵچنینتان و ئازاردانتان و، بەڵام خوا ئەیەوێ ئەوانە بکەن بۆ ئەوەی ئێوە پاك بکاتەوە لە پیس و پۆخلّی و لە گوناە.

﴿ وَلِیُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَیْکُمْ لَعَلَّکُمْ تَشْکُرُونَ ﴾ وەبۆ ئەوە خوا تەواو بکا بەسەر ئێوەدا چاکەو میهرەبان خۆی بەڕەوا کردنی تەیەموم کردن لەو کاتانەی پێشودا، بۆ ئەوەی ئێوە سوپاسی خوا بکەن لەسەر ئەو چاکانەی خوا بەخشیونی بە ئێوەو پاداشتان بداتەوە.

ئادەمیزاد فەرمانێکی وای نەدراوە بەسەردا توشی ئازاریان بکا لە هیچ ڕویەکەوە.هەر فەرمانێ درابێ بەسەریانا فەڕو چاکەی زۆری تێدایە، هەرشتێکی قەدەغە کردبێ خراپە و زیانی تێدایە، ئەگەر خراپە و چاکەیان وەك یەك وابوون کامەیان سودی زۆرتربێ ئەوەیان ئەکرێ، ئەگەر یەکێکیان زۆرتر بوو ئەوەیان ئەکرێ و واز لەوی تریان ئەهێنرێ، بۆیە خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ وَاذْکُرُوا نِعْمَةَ اللهِ عَلَیْکُمْ وَمِیثَاقَهُ الَّذِي وَاثَقَکُمْ بِهِ ﴾ وەئێوە بیری چاکەی خوا بکەن بەسەرتانەوە، بە تایبەتی بەخشینی ئایینی ئیسلام بە ئێوەو، بیری ئەو پەیمانەی ئەوتۆی خوا بکەنەوە خوا فەرمانی داوە بە ئێوە بەوەرگرتنی ئەو پەیمانە.

﴿ إِذْ قُلْتُمْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ﴾ لەو کاتەدا ئێوە ووتان بە پێغەمبەر﴿ ﷺ﴾ ئێمە بیستمان ئەو شتانەی تۆ فەرمانی پێ ئەدەی لە فەرمودەکانی خوا، ئێمە پەیڕەوی فەرمانی ئەکەین لە هەموو کاتێکا گرانبن لای ئێمە یا سوکبن لەکاتی هەرزانی و گرانیدا.

﴿ وَأَتَقُوا اللهَ إنَ اللهَ عَلِيمٌ بذاتِ الصُدُور ﴾ وەئێوە لە خوا بترسن و سوپاسی خوا بکەن و ئەو بەڵێنەی داوتانە بە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لە ڕۆژی پەیماندانتان مەیشکێنن (المبایعه) بەڕاستی خوا ئەزانێ بە نهێنیەکانی دڵتان و پاداشتی شاراوەکان ئەداتەوە چ جای ئاشکراکان ئەبێ بزانین و داواکاری خوا هەر چەندە زۆرن. هەموویان لە (٢) دوو شتا هاتوتە جێ، ئەم ئایەتەی دوای باسیان ئەکاو ئەفەرموێ:

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ ۚ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ ۙ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٩﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَآ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٠﴾

﴿ يا أَيُها الذيْنَ أمَنُوا كُونُوا قَوامِينَ للهِ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتـان هێنـاوە ئێـوە ڕاوەستن لەبەر خوا بە ڕاستی بە نییازی پاکـەوە لـە هـەموو گوفتـارو کردارتانـاو هـەموو فەرمانەکانی جێبەجێ بکەن و خۆتان دوربخەنـــەوە لـەبێ فـەرمانی خـوا، ئەگـەر خـاوەنی باوەڕن.

﴿ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ ﴾ ئێوە شایەتی بدەن بە دادپەروەری لــە هــەموو کــارو کردەوەتانــا بەبێ جیاوازی لـە نێوان خزم و بێگانە و باوەڕدارو بێ باوەڕ دوست و دوژمنتانــا. کەواتـە ئەگەر ئێوە زانان زانیاری بەکاربهێنن بۆ بنەبڕکردنی لاوازی دانیشتوان و دوواکــەوتنیان و پەرە پێدانی هۆیەکانی هێزو پێش کەوتن. ئەگەر ئــایندارن داوای دابــەزینی ووشــەی خــوا بکەن و چاکە بکەن لـەگەڵ ئادەمیزادو بەرەنگاری کەسانێ بکەن لە ڕێگەی خوا لائــەدەن لە هەمویانا جێگەداری خوابن لـەڕوی زەویدا.

ئەگەر نەزان و نەخوێنەوارن وەڵامی زاناکان و ئاین پەروەران بدەنەوەو لایەن گریان بن و یارمەتیان بدەن ئەگەر ئەتانەوێ لـەگەڵ ڕاستی و دادپەروەریدابن..

یانێ دادپەروەری ئەبێ بەو جۆرەبێ کە خوا لـەم ئایتەدا چــەندین ئایــەتی تــردا فــەرمانی پێداوە، دادپەروەری بەو جۆرە ئاوات و مەبەستی هەموو ئادەمیزادە، ژیانیــان بــەبێ ئەوانـە نایەتەدی. بەڕاستی جەماوەری ئـادەمیزاد بــەبێ زانیــاری و نــەخوێندن ئــەژین.بــەڵام بــەبێ دادپەروەری ناژین باوەکو هەموو ئەندامەکانیان زانــاو بلیمــەت و خــاوەنی بــەڵێن نامــەی بەرزین لـەڕوی زەویدا. بــەبێ دادپــەروەری زانیــاری ئــازاری زۆرتــرە لــە ســودی. بــەڵام دادپەروەری هەموو سودەو زیبانی لێ پەیدا نابێ.

﴿ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلَّا تَعْدِلُوا ﴾ ومپــاڵ نــەنێ بــە ئێــوەوە هانتــان بــدا دوژمنایێتی و ڕقی کۆنی تاقمێ لـەســەر ئــەوەی کــە ئێــوە دادپــەروەری نەکــەن و بتانــەوێ تۆڵەیان لێ بکەنەوە.

مەبەست لـەو تاقمە ئەو کەسانەن دوژمنی دادپەروەرین و ڕێگە بە هەموو هەوڵێ ئەگرن کە سەربەستی ئادەمیزادی تێدابێ و لاوازی و دوواکەوتنی تێدابێ. بەڕاستی خــوا فــەرمانی داوە بە ئێمە بەرەو پێش بڕۆین و نەوەستین لـە دابــەزینی دادپــەروەری و کەوتنــە گــەڕ بــۆ پەرەپێدانی خۆشی و ژیانی ئاسودەیی بۆ دانیشتوانی ڕوی زەوی، بەبێ ئەوەی بیر لــە ڕق و دوژمنایەتی کۆن و کینەی هیچ تاقمێ بکەینەوە، پێویستە ئێمە لـەگەڵپۆلی ڕاستیدابین. ئیــتر باسەگی نهێن گر بۆخۆی بووەڕێ.

﴿ إعْدِ لَوُا هُوَ أقْرَبَ لِلتقْوى وأتَقُوا اللهَ إنَ اللهَ خَبيرٌ بِما تَعْمَلُونَ ﴾ ئێوە دادپەروەربن لەگەڵ دوژمندا، دادپەروەری لە هەمو شتێ نزیکترە بۆ ترسان لە خواو لە خۆپاراستن لە گوناە و، ئێوە لەخوا بترسن و ستەم مەکەن. بە ڕاستی خوا ئەو پەڕی ئاگادارە بەشتێ ئێوە بیکەن لە دادپەروەری و لە ستەم کردن، پاداشت و تۆڵەی هەموو شتێ ئەداتەوە.

﴿ وَعَدَ اللهُ الذيْنَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصّالِحاتِ لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأجْرُ عَظِيمٌ ﴾ خوا بەڵێنی داوە بە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە بەبێ خەوش و بەبێ دوڕوی و، کردەوە چاکەکانیان کردوە، بۆ ئەو کەسانە هەیە لێی خۆشبونی خواو پاداشتی زۆر گەورە.

﴿ وَالذيْنَ كَفَرُوا وَكَذّبُوا بِآتِنا أوُلَئِكَ أصْحابُ الْجَحِيمِ ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە، وەبەدرۆیان خستۆتەوە ئایەتەکانی قورئانی ئێمە و ئەوەی موحەمەد هێناویەتی و بڕوایان بە یەکێتی خوا نیە، ئەو کەسانە دانیشتووی درزەخن و هاوڕێی ئاگرن و شایستە ئەوەن.

بت پەرستان لەیەکەم کاتی هاتنی ئایینی ئیسلامدازۆردارو ستەمکارو بەهێزبوون، ئەیان ویست هەمرو کاتێ ئازارو کوشتن و لاوازی برێژن بەسەر موسڵماناندا، خوای مەزن نەی هێشت بە ئاواتی خۆیان بگەن هەتا موسڵمانان هێزیان پەیدا کردو شکۆیان پەرەی سەند، بۆیە خوا ڕونەکاتە موسڵمانان و ئەفەرموێ:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ هَمَّ قَوْمٌ أَن يَبْسُطُوٓا۟ إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ فَكَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾

﴿ يا ايُها الذيْنَ أمَنُوا أذْكُرُوا نْعَمَةَ اللهِ عَلَيْكُمْ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە بیری چاکەی خوا بکەن بەسەرتانەوە کە پالّی نا بەدوژمنانەوە ئێوەی پاراست لە فێڵی ئەوان.

﴿ إذْهَمَ قَوْمٌ أنْ يَبْسِطُوْا إلَيْكُمْ أيْدِيَهُمْ ﴾ کاتێ نیازیان کردبوو تاقمێ لە بت پەرستان کە دەستی خۆیان درێژ ئەکەن بۆلای ئێوەو هەڵمەتتان بدەنێ و ئیسلام بنەبڕبکەن و ئێوە بکوژن و سزاتان بدەن و ئاوارەتان بکەن، دوایی بڕیاری جەنگیانداوو لەشکریان ئامادەکرد.

﴿ فَكَفَ أيْدِيَهُمْ عَنْكُمْ ﴾ دوایی خوا دەستی ئەوانی لە ئێوە گێڕایەوە، ئێوە سەرکەوتن بەسەر ئەو بێ باوەڕانەدا، ئێوە لە دوایی لاوزای هێزتان پەیداکرد، ئێوە بوون بەسەرداروو بە سەرۆك پاش ئەوەی ژێر دەستەبوون، چ چاکەیە بێ لەوە گەورەترە کە سەربەستی و سەرکەوتن دەست بکەوێ بەسەر دوژمناندا.

پاش ئەوی خوەا باسی ئەو چاکە گەورەیە کرد بەخشیوی بە موسڵمانان ڕویان تێ ئەکاو ئەفەرموێ:

﴿ وَأتَقُوا اللهَ وَعَلَى اللهِ فَلْيَتَوَكَلِ الْمُؤمِنُونَ ﴾ وەئێوە لە خوا بترسن و بێ سوپاسی خوا مەکەن و هەر لەسەر خوا دوایی ئەبێ پشت ببەستن باوەڕداران هەرخوا بکەن بە بەڕێوەبەری خۆیان، هەر خوا چاکە بۆ ئێوە ئەسازێنێ و لە خراپە ئەتانپارێزێ، هەرگیز پشت بە خۆتان مەبەستن، خوا هێزتان پێ ئەبەخشێ و تاقیتان ئەکاتەوە، پێویستە ئەو هێزە بەکار بهێنن بۆ چەسپاننی ڕاستی نەك بۆ بوژانەوەی خراپە و دوژمنایێتی، بۆ بلاّوکردنەوەی ئاسایش و دادپەروەری نەك بۆ چەوسانەوەی هەژاران و پیلان دروست کردن بۆیان و بیان کەن بەژێر دەستە، بەو جۆرەی بت پەرستان بەکاریان ئەهێنا لەگەڵ ئێوە.

زۆر کەس هەن داوای دادپەروەری و مافی مرۆڤ ئەکەن و لافی چاکە لێ ئەدەن لەکاتی لاوازی و بێ دەستەلاّتیدا کەچی لە کاتی دەستەلاّتدا لە خۆیان ئەگۆڕێن، بەڕاستی باوەڕداری پوختە ئەوەیە لە خوا بترسێ و سوپاسی خوا بکا لەکاتی دەستەلاّت و هێزدا زۆرتر لەکاتی لاوازیدا، یا هیچ نەبێ لەخۆی نەگۆڕێ. بەلاّم ئەو کەسانە بە زمان باوەڕ ئەهێنن نەك بە دڵی پێچەوانەی ئەوانن.

خوای مەزن لە قورئانی پیرۆزدا باسی باوەڕداران و بت پەرستانی کرد بە گشتی و باسی بت پەرستانی قورەیش کرد بە تایبەتی کە چۆن ئازاری پێغەمەریان ئەداو ئەیان ویست بیکوژن. هەروەها باسی دووڕوانیشی کرد کە لە ژێرەوە دوژمنی کەسکونی موسڵمانان بوون، باسی جولەکەوگاورەکانیشی کرد. بەڵام باسی جولەکەکان ئەکا زۆرتر لە هەموویان چونکە ئەوان زۆرتر دژی ڕاستین و ڕقیانە لە مرۆڤایتی. بۆ باسی هەندێ تر لە کردەوەی نالەباری گاورو جوەکان و شکاندنی بەڵێنەکان ئەکاو ئەفەرموێ:

وَلَقَدْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَبَعَثْنَا مِنْهُمُ ٱثْنَيْ عَشَرَ نَقِيبًا ۖ وَقَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مَعَكُمْ ۖ لَئِنْ أَقَمْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَيْتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ وَءَامَنتُم بِرُسُلِي وَعَزَّرْتُمُوهُمْ وَأَقْرَضْتُمُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَلَأُدْخِلَنَّكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ فَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٢﴾ فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ لَعَنَّٰهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَٰسِيَةً ۖ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ ۙ وَنَسُوا۟ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ ۚ وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَآئِنَةٍ مِّنْهُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۖ

فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱصْفَحْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣﴾ وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّا نَصَـٰرَىٰٓ أَخَذْنَا مِيثَـٰقَهُمْ فَنَسُوا۟ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَاوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ وَسَوْفَ يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴿١٤﴾

﴿ وَلَقَدْ خَذَ اللهُ مِثاقَ بَنِي إسْرائيلَ ﴾ وەبەڕاستی خوا وەری گرتبوو پەیمان لـە کوڕانـی ئیسرائیل کە خوا بپەرستن و هاوبەشی بۆ دانەنێن و کار بە ناوەڕۆکی تەورات بکەن.

﴿ وَبَعَثْنا مِنهُمْ أنثى عَشَرَ نَقيباً قالَ اللهُ إني مَعَكُمْ ﴾ وەئێمە ڕەوانەمان کرد لـە کوڕانـی ئیسرائیل دووازدە کەس کە بەوان سپێرابوو بەڕێوەبردنی کاروبـاروو بـەڕێوەبردنی سـودو قازانجیان و بڕۆن بۆ ئەریحاو هەواڵی دانیشـتوانی ئـەوێ بزانـن و، خـوا فـەرموی بـەوان. بەڕاستی من لـەگەڵ ئێوەم یاریدەتان ئەدەم. ئەو دووازدە کەسانە بریتی بـوون هەریەکـەیان نوێنەری هۆزێ بن لـە دووازدە نەوەی کوڕانی یەعقوب یا دووازدە پێغەمەربن خوای مەزن ڕونی نەکردۆتەوە، بۆیە وا چاکە ئێمە هیچ شتێ نەڵێین:

ئەو ڕستەیە لـەوەوە هاتووە کاتێ بەنی ئیسرائیلی لـە میسرهاتنە دەرەوەو ڕزگاریان بـوو لە چەوسانەوەی فیرعەون و قیبتیەکان، خـوا بـەڵێنی دا بـە موسـا زەوی پـیرۆزی ئیلـپـاو ئەریحاو هەموو وولاّتی شام ببەخشێ بە بەنی ئیسرائیلی، لـەو شـوێنانەدا ئـەو کاتـە پـاش مـاوەی گـەلی عادلـەو شـارانەدا بـوون، زۆر جەربـەزەو ئـازابوون و زەبـەلاح و بـالاّ بەرزبوون.خـوای مـەزن فـەرمانی دا بـە موسـا دووازدە کـار گوزاریـان لاّ هـەڵبژێرێ و ڕەوانەیان بکا بۆلای دانیشتوانی ئەو شارانە هەواڵی چۆنیـەتی ئـەوان بزانـن و بگەڕێنـەوە بۆلای موسا.

کاتێ گەیشتنە خاکەکەیان و چاویان کەوت بە دانیشتوانیان تەماشایان کرد پیاوەکانیان زۆر بەسام تێ سپێراوە زەبەلاحن، سەریان سورماو زۆریان لێ ترسان، کاتێ گەڕانەوە بۆلای کوڕانی ئیسرائیل و ئەو هەولاّنەیان بۆ گێڕانەوە ئەوانیش بێ فەرمانی موسایان کردو هێزی ئەژنۆیان شکاو ترسی زۆریان لێ پەیدابوو، ووتیان بە مووسا خۆت و خواکەت جەنگیان لەگەڵ بکەن و ئێمە جەنگیان لەگەڵ ناکەین.

خوای مەزن بەڵێنی لە بەنی ئیسرائیل وەرگرتبوو بە پێنج فەرمانی خوا هەڵسن، بە هەڵسانی ئەو پێنج شتانە خوا پاداشتیان ئەداتەوە بە دوو شتی بەنرخ، ئەوانەیش ئەو پێنج فەرمانەی خوان و ئەفەرموێ:

١- ﴿ لَئِنْ أَقَمْتُمُ الصَلاة ﴾ بەڕاستی ئەگەر ئێوە نوێژەکان بکەن و ڕایان وەستێنن بەو جۆرەی خوا فەرمانیان پێ ئەدا.

٢- ﴿ وَأتَيْتُمَ الزَكاة ﴾ وەئێوە زەکاتەکانتان ببەخشن بە هەژاران بە گوێرەی یاسای خوا.

٣- ﴿ وَأمَنْتُمْ بِرُسُلِي ﴾ وەئێوە باوەڕ بهێنن بە فروستادەکانی من بەو یاسایەوە ئەوان بۆیان هاتووە لەلایەن خواوە.

٤- ﴿ وَعَزَرْ تُمُوهُمْ ﴾ وە ئێوە یارمەتی ئەو فروستادانەی من بدەن و پشتیان بگرن و ڕێزی فەرمودەکانیان بگرن بۆ چەسپاندنی فەرمانەکانی خوا.

٥- ﴿ وَأقْرَضْتُمُ اللهَ قَرْضاً حَسَناً ﴾ وەئێوە دارایی خۆتان ببەخشن لە ڕێگەی چەسپاندنی ئایینی خوادا. یانێ ئەو بەخشینە بەخوا وێنەی قەرزەو خوا پاداشتەکەی لایەو ئەیداتەوە بە ئێوە ئەو بەخشین و قەرزە بە جۆرێکی شیرین و بە نیازی پاکەوە بەبێ خۆهەڵکێشان و سودبێ. باسکردنی قەرزدان لە دوای زەکات لەبەر ئەمەیە: قەرزدان لە یاسای ئەو سەردەمەدا پێویستبووە لەسەریان بە وێنەی زەکات یا لەبەر ئەمەیە قەرزدان پاداشتی گەورەیە لای خوا با پێویستیش نەبێ.

لە بریتی بەجێ هێنانی ئەو پێنج شتانە خوای مەزن ئەم دوو پاداشتە گەوانەیان ئەداتێ:

١- ﴿ لأكَفِّرَنَّ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ ﴾ بەڕاستی من دائەپۆشم چەندین خراپەی ئێوەو لە ئێوە خۆش ئەبم.

٢-﴿ وَلأُدْخِلَنَّكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ ﴾ وەمن بەڕاستی ئێوە ئەخەمە نێو چەندین بەهەشت بڕوا بەژێردرەختەکانیداو بەم لای‌لای کۆشکەکانی چەندین ڕوباری ئاوی شیرین. دوای ئەوەی کە خوا باسی ئەو بەڵێنانەو پاداشتی ئەوانی کرد، ڕوئەکاتە بەنی ئیسرائیلی و

﴿ فَمَنْ كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ مِنْكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ ﴾ دوای هەرکەسێ لە ئێوە بێ باوەڕ ببێ پاش ئەو پەیمانانە، دوایی ئەو کەسە بە ڕاستی لایداوە لە ڕێگەی ڕاست و لە پرۆگرامی دروست و توشی ئەو کەسە ئەبێ سزاو بێ نرخی بێ ئەندازە..

پاش ئەوەی خوا باسی ئەو یاسایانەی کرد دڵخۆشی پێغەمەر ئەداتەوەو ئەفەرموێ:

﴿ فَبِمَا نَقْضِهِمْ مِيثَاقَهُمْ لَعَنَّاهُمْ ﴾ دوایی بەهۆی شکاندنی ئەوان پەیمانەکانی خۆیان ئێمە ئەوانمان دورخستۆتەوە لە بەزەیی خۆمان و بێ بەشمان کردن لە میهرەبانی خۆمان.

﴿ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَاسِيَةً ﴾ وەئێمە دڵی ئەوانمان گێڕا بە وشك و بەڕەق و بەزەیی تێدانیەو نەرمی ڕوی تێ ناکاو لەکردنی کار خراپ سڵ ناکەنەوە.

پرسیار/ چۆن خوای مەزن ووشکردن و ڕەق کردنی ئەو دڵانەی ئەوان ئەداتە پاڵ خۆی؟ ئەگەر وابێ ئەبێ پرسیاریان لێ ناکرێ چونکە لە خواوە بووە نەك لە خۆیانەو؟.

وەڵام/ بەڕاستی خوای مەزن ڕێگەی چاکەی بۆ ڕون کردونەتەوە، فەرمانی داوە بەو ڕێگەدا بڕۆن، ڕێگە خراپەیشی بۆ ڕون کردونەتەوەو قەدەغەی کردوە لەوان، پەیمان لێ وەرگرتوون و ئەوانیش بڕیاریانداوە چاکە بکەن و خراپە نەکەن. دوایی پەیمانەکەیان شکاندن و بەردەوامیشبوون لەسەر یاخی بوون، خوایش کاری خۆیانی بە خۆیان سپارد، زۆر ڕوونە خوا زۆریان لێ ناکا چاکە بکەن، خراپەی خۆیان بوەتە هۆی ووشکبوون و ڕەقبونی دڵیان.

﴿ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَنْ مَوَاضِعِهِ وَنَسُوا حَظّاً مِما ذُكِرُوا بِهِ ﴾ ئـەگۆڕن مانـاو ووشـەی تەورات لـە جێگەکانی خۆیان لای ئەبەن، بە تایبەتی ناونیشانی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ و، لـەبیری خۆیانیان بردۆتەوە بەشێکی بە نرخ لـە شتێ ئامۆژگاری ئەوانی پـێ کرابـوو بـەو شـتە لـە تەوراتا، هەرشتێ دژی هەوەسی خۆیان بووایە ئەیان گۆڕی. جولـەکـەکانی ئێـستا لاسـایی ئەوانـەی پێشـویان ئەکەنەوەلەشـکاندنی بڕیـاری نەتـەوە یـەك گرتووەکـان و ئەنجومـەنی ئاسایش.

جولـەکەکان لـەو کاتەدا بە باوەڕنەکردن بە پێغەمبەر وازیـان نـەدەهێنا. بـەڵکو لـەگـەڵ دوژمنانی پێغەبەردا ڕێك کەوتن بە پەنهانی و پیلانیان بۆ دروست کرد، خـوای مـەزن بـۆ پێغەمبەری ڕون کردەوە فەرموی.

﴿ ولاتزال تطلع على خائنة منهم إلا قليلاً منهم ﴾ وە تۆ لاناچی ئاگادار ئـەبی بەسـەر ناڕاستی و گوناهی زۆربەی ئەوان مەگەر کەمێ لـەو جولـەکانە کە خراپە ناکـەن و بـاوەڕ ئەهێنن بە ڕاستی و وەك عبدولای کورشـی سـەلام و هاورێکـانی.. یـانی تـۆ موحەمـەد توشی خراپەی زۆر بوویت لـە جولـەکەکانەوە لەمەوبەر ، لـە مەودووایش زۆر تر خراپـەی ئەوانت توش ئەبی، هەر چەندە چاکەیان لـەگەڵ بکرێ چاکە و خراپەی ئەوان یەکسانە.

لـەگەڵ ئەو هەمووە خراپەیاندا خوا فـەرمان ئـەدا بـە پێغەمبـەر﴿ ﷺ ﴾ کە بەرانبـەر ئـەو خراپانەی ئەواندا ئەو هەر چاکەیان لـەگەڵ بکاو ئەفەرموێ:

﴿ فاعف عنهم واصفح ان الله يحب المحسنين ﴾ دوایی تۆ ببورە لـەوان ئەگـەر پەشـیمان بونەوە، وە واز لـەتاوانەکان بهێنەو چاکەیان لـەگەڵ بکە، ئەگەر پەیمانیاندا سەرانەیان لێـی وەربگرە.بە ڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆش ئەوێ چاکە کەرن و خاوەنی چاکەن.

پرسیار/ ئایا دوایی خوای مەزن باسی جولـەکەکانی کرد بە خراپترین شێوە و چاکەیان لێ ناوەشێتەوە چۆن فەرمان ئەدا بەلێی بوردنی ئەوان و چاکە کردن لـەگەڵیان. ئایا ئەوان مانای لێی بوردن و چاکە ئەزانن و مارو دووپشك لێی بوردن و چاکە بۆیان دورستە؟

وەڵام/ ڕاناوی ووشەی (عنهم) ئەگەڕێتەوە لۆ لای ئەو کەسەکەمانەی باوەڕیان هێنـاوە لـە جولـەکەکان بە پوختەیی، ڕونیش کرایە وە لـەکاتی ماناکردنیدا، یا ئەو ئایەتـە ماناکـەی

گۆڕاوە بەناوەڕۆکی ئایەتی ( وقاتلوا الذین لایؤمنـون بـالله ولا بـالیوم الاخـر) وە ئێـوە جەنگ بکەن لەگەڵ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕنەیەرن بە خواو بە ڕۆژی دوایی.. ئەو ئایەتەی ئێرە هاتوەتە خوارەوە دووای ئـەوەی موسـوڵمانان هێزیـان پـەیدا کـردوە، لـە زیـان و و دژایێتی جولـەکە و جگە ئەوانیش ناترسن.

دووای ئـەوەی خـوای مـەزن باسـی بـەڵێن شـکاندنی جولـەکـەکان و گۆڕینـی فـەرموودەکانی تـەوراتی کـرد لەلایـەن جولەکەکانـەوە ، باسـی چۆنێتـی کـردەوەی گاورەکانیشمان بۆ ئەگا بە جۆری کە ئەوانیش لە جولەکەکان کەمتر نین لـە شکاندنی پەیمان و بەڵێنداو ئەفەرموی:

﴿ ومن الذین قالوا إنا نصاری أخذنا میثاقهم ﴾ وەهەندێ لەو کەسانەی ئەوتۆ ئـەیان ووت: بەڕاستی ئێمە یاریدەرانی عیساین، یادانیشتووی گونـدی نەسـراین ئێمـە وەرمـان وەرگرتووە پەیمان لـەوان ، وێنەی جولەکەکان کە بڕوایان هەبێ یـەو شـتانەی عیسـا لـە ئینجیلدا باسی کردوە بۆیان کە ئەڵێ بەڕاستی بڕوام بە فروستادەی کەسێ هەیە لە دوای من دێت و ناوی ئەحمەدە، بڕوام بە یەکێتی خوا هەیە.

﴿ فنسوا حظاً مما ذکروا به ﴾ دوایی ئەو گاورانە وازیان لەبەشێکی زۆر لـەو شتە هێنـا ئامۆژگاری ئەوان کرا بو بە شتە، فەرمانیان پێدرابوو بڵاوی بکەنەوە کـە باسـی یـەکێتی خواو پێغەمبەرایەتی موحەمەدە ﴿ ﷺ ﴾ دوایی گۆڕیان بە وێنەی جولەکەکان بەهێز تریـن بەڵگە لـەسەر گۆڕینی ئینجیل و دەست کاری کردنی ئەمەیە کە بەڕاستی سـەرۆکەکانی کلیساو مێژووی زانایانی مێژوو ناس بۆ چۆنێتی ئەو چوار ئینجیلە کە جێگەی متمانەی گاورەکانە لە خولەی چووارەمی زایینیدا کۆکراونەتەوە کەلە ناوەڕۆکە کانیاندا شتی وا هەیە دژی یەکترین ، خۆیان لە نێو خۆیان ئاژاوەو ناکۆکیان لێ پەیدا بـوە کـە نوسـخەی ڕاستی یەکەم لە ئینجیل چـی بەسـەرهات، هـەروەها نـاکۆکن چ کـاتێ ئـەو ئینجیلانـە نوسراو نەتەوە، ئینجیلە پێشوەکەی یەکەم چ کەسـێ نوسـیوێتیەوە؟ بـە چ زمـانێ بـوە؟ نامەی (الدائرة والمعارف الفرنسیة الکبری) باسی ئاژاوەکەی کردوە.

ئەوانەو ژمارەی زۆری ئینجیل بەڵگەی گەورەن لەسەر ئەوەی کە نامەی خوانین و دەست کردی قەشەکانن، پێویستە نامەی خوا هەر و جیاوازی تێدا نەبێ. تەفسیری (منار) لەو باسانەدا بە چاکی باسی کردوە ٧- ﴿ فأغربنا بينهم العداوة والنعضاء ﴾ دوایی ئێمە لە تۆڵەی شکاندنی ئەو پەیمانە ئێمە خستومانەتە نێوانیان دوژمنایەتی خۆیان و، خستومانەتە نێوانیان کینەو ڕق لە یەکتری، بەردەوامن لەسەریان جوێ نابێتەوە وەلێیانە .

﴿ إلى يوم القيامةِ ﴾ هەتا ڕۆژی هەڵسانەوەیان لە گۆڕەکانیان.. ئەو دوژمنایەتی و کینەیە لە نێوان جولەکەکان و لەنێوان گاورەکانا هەیە بە تایبەتی و لە نێو گاورەکاندا بە گشتی بەردەوامە، هەریەکە لەتاقمەکانی گاورەکانن لەنێو یەکتریدا لە کۆنەوە پەرەی سەندوەو هەتا ئێستا بەبێ ووچان. بەڵام بە زۆری ئەو دوژمنایەتیی و کینەیە لە نێو تاقمی گاورەکاندا پەیدا بوە، مێژووی کۆن و تازە پاڵ پشتی ڕاستین بۆ دەرکەوتنی فەرمودەی خوا.

بەڕاستی ڕژاندنی خوێنی یەکتر بە درێژایی مێژو هەبوە، ئیتر بەهۆی ناکۆکی ئایینەوە بێ یا بەهۆی بەدەست هێنانی سەرۆکایەتیی و ڕامیاری و ئابوری و کۆمەڵایەتیەوە بێ بە درێژایی سەدان ساڵ ئارامی نەگرتووە، ئاگری جەنگ و برینی ئاژاوەیان نەکوژراوەتەوەو سارێژ نەبوون، بە تایبەتی جەنگی گشتی نێوان گاورەکان ساڵانی (١٩١٧) ە و(١٩٣٩) لەنێوان بەریتانیا و ئەمەریکا لەگەڵ ئەڵمانیادا گەورەترین بەڵگەیە بۆ ئەو مەبەستە ئەگەر بە ڕووالەت هەندێ جار بەکەمی یەکبن لەبەر ئەوەیە گەلایەنی بێ هێز و بچووك بچەوسێنەوە، بە تایبەتی‌لە دژی موسڵمانان.

ئەو ڕوداوانەی لەلایەکەوە، لەلایترەوە لە کۆنەوە دوژمنایەتی گاورکان دەستی پێ‌کردوە لە دوای ماوەیەکی کەم باش هاتنە خوارەوەی ئایینی عیسا لە نێوان تاقمە بیروباوەڕ جوێی کانی گاورەکان لەنێوان یەعقوبیەکان و مەلکانیەکان و نەستوریەکان هەروەها لەنێوان پرۆستانت و ئەرسۆزکس گەورەترین نیشانەی فەرموودەی خوان.

﴿ وسوف ینبئهم الله بماكانوا یصنَعون ﴾ وە دوابی لە ڕۆژی دواییدا خوا هەواڵ ئەدا بە شتێ لە جیهاندا ئەیكەن و سزای وەرئەگرن. دوای ئەوەی خوای مەزن باسی جولەكەكان و گاورەكانی كرد بە شكاندنی پەیمان و واز هێنانیان لەفەرمانی خوا فەرمانیش ئەدا بەموسوڵمانان بكەونە گفتوگۆ لەگەڵ خاوەن نامەكان بە شیرنتیرن گفتوگۆ، دوایان لێی بكەن زۆر بە هیزی یانە كە باوەڕبهێنن بە خواو بە ئایینی ئیسلام و پێغەمەر﴿ ﷺ ﴾ ئەفەرموێ:

یَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ
قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ كَثِيرٗا مِّمَّا
كُنتُمۡ تُخۡفُونَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَعۡفُواْ عَن
كَثِيرٖۚ قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ
مُّبِينٞ ﴿١٥﴾ يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ
سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى
سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى
ٱلنُّورِ بِإِذۡنِهِۦ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ
﴿١٦﴾

﴿ یاأهْلَ الکِتابَ قَدْ جاءَکُمْ رَسُوْلُنا ﴾ ئەی خاوەن نامەکان بەڕاستی هاتوە بۆ لای ئێوە فروستادەی ئێمە موحەمەد ﴿ ﷺ ﴾.

﴿ یُبَیِّنْ لَکُمْ کَثیراَ مِما کُنْتُمْ تَخفون مَنَ الکِتابِ ﴾ ڕوونی ئەکاتەوە بۆ ئێوە زۆر لە شتێ ئێوە ئەیشارنەوە لەنامەی خوادا کە تەورات وئینجیلە. گاورەکان یەکێتی خوایان پەنهاندا و کەبنچینەی ئایینە، جولەکەکان ئەیان شاردەوە پرسیاری پاشە ڕۆژو سزای دوایی و یاسای قەدەغە کردنی خواردنی سودو بەردەبارانی داوێن پیسان لەگەڵ جگەی مێردی خۆیان هەردوو لایان بەیەکەوە دایان ئەپۆشی ناردن و شێوازی پێغەمبەر﴿ ﷺ ﴾ لە تەورات و ئینجیلدا.

﴿ ویعفو عن کثیر ﴾ وە خوا واز ئەهێنێ لە زۆرێ لەو شتەی ئێوە ئەیشارنەوە خوا هەواڵی پێ نادا کاتێ فەرمانی ئایینی پێوە نەبەستراێ سوود بەخش نین.

هە واڵدانی پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ بەو شتانەی ئەوان پەنهانیانداوە بەڵگەی یڕوندەن لەسەر پێغەمبەرایەتی ئەو هەواڵە پەك خەرانە یەکێکە لە کارە پەك خەرەکانی قورئان.

ئەوانە کومانیان تێدا نی‌یە کە لەکاری پەك خەرن، چونکە پێغەمبەر نەخوێندەوار بووە، هیچ کەسێکیش لەناوەرۆکی نامەکان ئاگاداری نەکردووە.

پرسیار/ بۆچی پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ هەواڵی بە هەندێ لەو شاراوانەی داوە بە تەنها. نەك بە هەموویان وەلام مەبەست لەو هەواڵدانە ئەوەیە بزانرێ کە پێغەمبەر﴿ ﷺ ﴾ زانایەو ئاگاداری ئەو شتە یە پنهانیانداوە، ئەو مەبەستە بە هەندێکیان پێك دێ، هەر وەك بە هەموویان پێك دێ، کە خاوەن نامەکان بۆیان دەرکەوت هەندێکیان ئەزانێ بۆیان ڕون ئەبێتەوە هەمویان ئەزانێ.

﴿ قَدْ جاءَکُمْ مِنْ اللهِ نُورو کتاب مبین ﴾ بەڕاستی هاتووە بۆ لای ئێوە لەلایەن خواو ڕووناکییە کە موحەمەدە، چونکە ڕاغویی بێ ئەکری بە وێنە روناکی کە ڕێگەی پێ ئەدۆزرێتەوەو، هاتوە بۆ لای ئێوە نامەیە ڕون کەرەوەی هەمو شتێکە و لابەری هەمو تاریکیەکەو بێگومان ئاینی ئیسلام مرۆڤ ئەبا بۆ لای هەموو ڕوناکیە.

﴿ یهدی به الله من اتبع رضوانه ﴾ خوا بەو نامەیەو بەو ڕوناکیە ڕانموویی ئەگا کەسێ پەیڕەوی ڕەزامەندی خوا بکا بە وەرگرتنی ئایینی ئیسلام. ئەو کەسەی ئارەزووی ڕەزامەندی و پێ خۆشبوونی خوابکا بە وەرگرتنی ئایینی ئیسلام. ئەو کەسەی ئارەزووی ڕەزامەندی و پێخۆشبوونی خوا بکا بەهۆی ئەو ئایین و نامەیەوە، دوای ڕاستی بکەوێ لەبەر خوا ئەو کەسە بە بێ گومان بە ئاواتی خۆی گەیشتووە کە ڕانموویی بونە بۆ لای ڕەزامەندی خوا بەسێ شت کە بریتین لەمانەی خوارەوە.

١-﴿ سبل السلام ﴾ ڕێگەکانی ڕزگاری و ئاسودەیی لەسزاو لە هەمو گیروگرفتی ناهەموار ڕوبکاتە مرۆڤ، مەبەست لەئاسودەیی و لە ئاشتی لەو ئایەتەداتە تەنها داواکردنی ئاشتی نیە بۆ پاراستنی و سامانی گەلان، وێنەی مەبەستی هەندێ کەس ئێستا داوای ئەکەن بەلکو بریتیە لە ئاشتی و بە تەواوی بێ کەم وکوڕی بۆ هەموو گەلان و ئەندامان و بۆ شارو خێزانێ، واز بهێنرێ لەوان و پەروەردەیان نەکەن بەپەروەردەی خراپ، دەست درێژی نەکرێتە سەرسامان و نیشتمانیان، ئاشتێکی وابێ ئەقلیان بپارێزێ لە چاوچنۆکی و کینە وفیێڵ و پیلان.

٢-﴿ ویخرجهم من الظلمات الی النور ﴾ وە ئەو کەسانەی پەیڕەوی ڕەزایێتی خوا بکەن خوا دەریان ئەکا لە چەندین تارێکی بت پەرستی و بێ باوەڕی بۆ لای ڕوناکی خوا پەرستی و ڕزگار کردنیان لە کۆت و پێونی جگەی خواپەرستی.

٣-﴿ ویهدیهم الی صراط مستقیم ﴾ وە خوا ڕانموویان ئەکا بۆ لای ڕێگەی ڕاست کەنزیکترین ڕێگەی میهرەبانی خوایە، ژیانی هەردوو جیهانیان ئەگێڕی بە خۆشی و ئاسایش. نەك بەسزاو دەردی سەری.

پاش ئەوانە هەموو ئایا ئەو کەسانە خۆیان ناو ناوە بە یاریدەرانی ئاشتی، یا جگەی ئەوانیش کە داوای گەشەکردنی بەر هەمو گوزەرانی خۆش ئەکەن بۆ دانیشتوانی ڕوی زەوی، یا ئەو کەسانەو جگەی ئەوانیش ڕێگەیەکی ڕاست و شایان تریان هەیە لە ڕێگەی ئیسلام و دیاریان کردوە، یا ئەو کەسانە بەندەکانی خوایان خۆشتر ئەوێن لە خوا، یا

زاناترن لە خوا بەو شتانە ڕەوشتیان ڕاست بکاتەوە یا تێکیان بدەن بەرەو خراپە، لە وولامی ئەو پرسیارانەدا ئەبێژرێ بێگومان ئەو پرسیارانە جێگەی خۆیانین خوا لە هەموویان میهرەبانترو ڕاست کۆترەو، قورئانیش چاکترین یاسایە.

یا لەئیسلامداو لە ڕەوشتی دیاری کراوی ئیسلامدا، یالە تاکە یاساییکی ئیسلامدا هەیە شتێکی وا دژی ئاشتی و بەرهەم پەیداکردن و بەشکردنی بەرهەمبێ بەسەر ئادەمیزادا، یا دژی داد پەروەری و سوودی کۆمەڵبێ؟ بە ڕاستی لەوولامی هەموویانا ئەبێژرێ قورئانی پیرۆزە یەکەمجار داوای کردووە و جاڕی داوە بۆ گوزەرانی خۆش و ڕێزی هەموو ئادەمیزاد.

گومانی تێدا نیە هەر بەبێ لایەن بە ڕاستی و بەداد پەروەری لەیاسای بکۆڵێنەوە ئەبێ باوەڕ بهێنن بە ئیسلام و سەری بۆ دانەوێنن.

خوای مەزن دوای ئەو باسانەی پێشو باسی ئەو شتانەمان بۆ ئەکاکەگاورەکان ئەڵێن لە بارەی عیساو بۆی بڕیار ئەدەن و ئەفەرفەرموێ:

لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ۚ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا إِنْ أَرَادَ أَن يُهْلِكَ ٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ۗ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٧﴾ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ۚ قُلْ

فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ يَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ ﴿١٨﴾ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ قَدْ جَاءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ عَلَىٰ فَتْرَةٍ مِّنَ الرُّسُلِ أَن تَقُولُوا مَا جَاءَنَا مِن بَشِيرٍ وَلَا نَذِيرٍ فَقَدْ جَاءَكُم بَشِيرٌ وَنَذِيرٌ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٩﴾

﴿لقد كفر الذين قالوا إن الله هو المسيح ابن مريم﴾ بە ڕاستی بێ باوەڕبوون کەسانێکی ئەوتۆ ووتیان: هەر خوا مەسیحی کوڕی مەریەمە.

بێگومان ئەزانین یاسای دەست کردبە گوێرەی کات و شوێن ئەگۆڕرێ. بەڵام بنچینەکانی ئایین و یاسای قورئان بە گوێرەی کات و جێگە ناگۆڕرێن، ئەو گۆڕانەی لای زانایانی ژیر نەگونجاوە، کەچی ئەو گۆڕانە بۆ بنچینەکانی ئایین بۆ یاسای ئایین پەیدا بووە لەبیر وباوەڕی گاورەکاندا. ئەوەی ڕاستی بێ بیروباوەڕی عیسا یەکەمین کاتی هاتنە خوارەوەی لەسەر یەکێتی خوابە پوختەیی دانراوە، بەو جۆرە مایەوە ماوەیێکی کورت لەلای تاقمێ لە گاورەکان وێنەی تاقمێ پۆلیسی مەشاتی و تاقمی ئەربوس. قورئانی پیرۆز بە ئاشکرای بڕیاری لەسەر ئەوداوە کە عیسا بە بیروباوەری یەکێتی خواوە هاتوە، ئەو بیروباوەڕی یەکێتی خوایە بەردەوام بو لای زۆربەی گاورەکان هەتا ساڵی (٣٢٥) زایینی کە گاورەکان کۆڕێکیان گرت لە (نیقیە) ٤٨,٠٠٠ کەس بو شداریان تێدا کرد، بڕیاریاندا لەو کوڕەدا بە خوایێتی عیساو هەر کەسێ بڵێ عیسا ئادەمیزادە بەبێ باوەڕ

ئەژمێرێ ، ئەو هەمو نامانەی کەباسی نا خوایێتی عیسای تێدا بوو سوتاندنیان، قوستەنتینی پاشای ڕۆمان ئەو بڕیارەی (نیقیەی) بەتۆپزی سەپاند بەسەر دانیشتوواندا، عیسایان گیرا بە خوا، پاش ئەوەی بە ئادەمیزادیان دانابو.. بەڕاستی ووتەی زانای گەورەی چینیی (لین یوتاغ) رونی کردەوە کە (ئیغریقیەکان) خواکانی خۆیانیان گیڕاوە بە وێنەی پیاوان. بەڵام مەسیحیەکان پیاوانیان بە وێنەی خواکانیان داناوە.. ئەوەی شایانی باسێ ژمارەی کۆڕگای گاورەکان سێ بەشن: (المجامع).

١-کۆڕگای (مەسکۆنیە) لەو کۆڕەدا هەمو پیاوانی کلیسای هەموو جێگەیە بەشدارن لەو کۆڕەدا، هەر فەرمان و بڕیاری ئەو کۆڕە دەری بکا نابێ بەرپێچ بدرێتەوە.

٢-کۆڕگای نەتەوەیی (ملیة) یانێ بە تایبەتی نەتەوەیە بەشداری تێدا ئەکەن بە تەنها.

٣-کۆڕگای هەرێمی (الاقلیمیة) بە تایبەتی هەرێمی بەشداری تێدا ئەکەن جگەی هەرێمەکانی تر .

٣-بەو باسانەی رابردون ڕون ئە بێتەوە بڕوا بون بە خوایێتی عیسا پەیدا بوە بەر لە هاتنە خوارەوەی قوورئان لە نزیکەی (٣٠٠) ساڵ.

کەواتە ئەو زانایانە کە مانای ئەو رستانەی پێشویان کردون و خۆیانیان ماندو کردوە کە گاورەکان راستەوخۆ بڕیارن نەداوە بە خوایێتی عیسا. بەڵکو ئەڵێن خوا چووتە رۆحی عیساو بوون بەیەك خوا لە جێگەی خوایا نیە، چونکە هیچ هۆیی نیە بۆ لادان لە مانای دەرکەوتوی ئەو رستانە کە راستەوخۆ ئە فەرموێ عسیا یان بە خودا داناوە، جگەی ئەوانەی پێشویش بەڵگەی تر ئەمەیە: کە گاورەکان خۆیان بە ئاشکرایی ئەڵێن لەو نامەیەدا عیسا خوایە، ئەوەتە کەشیش (بوطر) نامەیەکی داناوە بە ناوی (الأصول والفروع) ئەڵێ لەو نامەیەدا: لە باوەڕی خوایێتیدا سێ کەس هەن (الاقانیم الثلاث) بۆ هەر یەکەیان پیشەیێکی تایبەتی هەیە لە هەڵسوڕاندنی بونەرەوەراندا.

ئەگەر پرسیار بکرێ و بیبژرێ: بەراستی گاورەکان باوەڕیان بەسێ خوایی و یەك خواپەرستی هەییە (التثلیث والوحدانیة) لەیەك کاتدا ، چونکە ئەوان ئەڵێن: بە ناوی باوك

و کوڕ روحو القدس کەیەك خوان. (بسم الأب والأبن وروح القدس إلها واحـدا)، دوایـی چۆن ئەگونجێ یەك شت یەکیشبێ و سیانیشبێ ؟.

گاوەرکان خۆیان وەڵامی خۆیان ئەدەنەوە بۆ ئەو پرسـیارە: ئـەڵێن: بەراسـتی بـڕوا بـوون لەسەرەوەی ئەقڵە وە ئەوان منالەکانیان پەروەردە ئەکەن لەسەر ئەو بڕوایە بە منالـەکانیان ئەڵێن: ئەگەر ئەو راستیە ئێستا نەزانی، دووایی ئێـوە لـە ڕۆژی دواییـدا ئـەیزانن.. بـەلام موسوڵمانان باوەڕ ئەهێنن بە باوەڕهێنانی بێگومان کە هەر شتێ عەقڵ بریـاری لەسـەر بـدا ئایینیش بڕیاری لەسەر ئەدا، هەر شتێ ئەقڵ نەی گونجێنێ ئایین فڕەی ئـەدا، ئەگێڕنـەوە لـە پێغەمبەری خۆمانەوە فەرمووی: ئەقڵ بنجینەی ئـایینی منـە. وەپیـاوێ پرسـیاری کـرد لـە پێغەمبەر﴿ ﷺ﴾ چاکە و گوناە کامەن؟ پێغەمبەر فەرمووی : داوای رونکردنەوەی بکە لـە دڵی خۆت هەر شتێ دڵت ئارامی بێ بکرێ ئەوە چاکە، گونـاە ئەوەیـە بـەدەرونا ئـەڕواو هاتوچۆ ئەکاو ناوەستێ لە دڵدا بە جۆرێ ئارام بگرێ ولات گرانە دانیشتووان ئاگـاداری بن.

دووای ئەوانەی پێشوو خـوای مـەزن بەڵگـە دا ئـەنێ لەسـەر بـیرو بـاوەڕی پوچـی گاورەکان.

﴿ قل فمن يملك من الله شيئاً ان اراد ان يهلك المسيح ابن مريم وأمـه ومـن في الارض جميعاً﴾

تۆ بڵێ: دوواییی چ کەسێکە قەدەغە بکا لە تۆ؟ ناوویستی خواو خـاوەنی چ شـتێکە ئەگەر خوابیەوی کە لەناو بباو بمرێنێ عیسا کوڕی مەریەم و دایکی و کەسێ لە زەویـدان هەموویان بە گشتی یانێ عیساو دایکی عیسا شایستەی مردنن وەك بونەوەرانی سەر زەوی ئیتر چۆن ئەبێ عیسا خوابێ.

پرسیار/ بۆ گاورەکان هەیە بڵێن: خوا تەواناى لـە نـاوبردنی عیسـای نیـە، عیسـایش تەوانای لەناوبردنی خوای نیە،چونکە هەردووکیان خوان.

وەلاّم/ مەسیحیەکان هەمویان پێك هاتوون بەیەك دەنــگ لەسـەر ئـەوەی جولـەکـەکان مەسیحیان هەلّواسی و ئاریاندا و کوشیتیان و نایانە گــۆڕەوە، هـەمو ئینجیلـە بـاوەڕ پـێ کراوەکانیان ئەو باسەیان دەربڕیوە بە ئاشکرایی بۆ نموونە:

ئینجیلی مەتیٚ لە ئیسحاقی (٣٧) ژمارەی (٥٠)، ئینجیلــی لۆقالــە ئیسـحاحی (٣٣) بڕگەی (٤٦) ئینجیلی یوحەنا لە ئیسـحاحی (١٩) ژمـارەی (٣٣-٣٤) هەریەکـەیان بـە جۆرێکی دلّ تەزێن باسی ئەو ڕوداوا نەیان کـردوە، هـەمویان بڕیـاری کوشـتنی عیسـایان ئاشکراکردوە، کەواتە جولـەکەکان بتوانن مەسیح بکوژن و ڕێگـەیانلیٚی نـەگیریٚ، چاکـتر خوای مەزن ، توانای لە ناو بردنی عیسا و دایکی عیسا هەیە.

﴿ ولله ملك السماوات والأرض ومابينهما ﴾ وەبۆ خـوا هەیـە خاوەنیـەتی و پاشـایەتی ئاسمانەکان و زەوی و شتیٚ لـەنێو ئەواندایە ، کاتی مەسیح بە خێو کراوی خوا بیٚ قەدەغەیە و ناگونجیٚ خوا بیٚ یا کوڕی خوابیٚ، پێویستە دروست کـراوی خوابـیٚ، کەسـیٚ نـەکونجیٚ خاوەنی خۆی بیٚ چۆن ئەبیٚ خوابیٚ.

﴿ يخلق مايشاء والله على كل شيء قدير﴾ خوا دروست ئەکا هەر شتیٚ ئارەزۆی بکـا، جاری وا هەیە لـە هیچەوە دروستی ئەکا ، وایش ئەبیٚ بەبیٚ باوك ودایك وەك ئادەم، جاری وایش ئەبیٚ بەبیٚ باوك وەك مەسیح. کەواتە پەیدا بونی عیسا بەبیٚ باوك نمونـەی ئـەوە نیـە مەسیح خوابیٚ، ئەگــەر وابـیٚ ئەبوایـە ئـادەم و ئاسمانـەکان و زەوی چاکـتر خوابنـو خـوا دەستەلاّتی هەیە بەسەر هەموشتێکا، هیچ شتیٚ ڕێگەی پیٚ ناگریٚ وبۆ هیچ کەس نیە خراپە لیٚی بکریٚ.

﴿ وقالت اليهود والنصارى نحن ابناء الله وأجباؤه ﴾وە جولـەکان و گاورەکـان ئـەیان ووت:

ئێمە کوڕان و خۆشەویستانی خوایـن و ئێمـە لـە خـواوە نزیکـین وەك کـوڕی خـۆی تەماشامان ئەکا، چونکە عوزەیرو عیسا کـوڕی خـوان، ئێمـەیش خـزم وکـەس و کـاری

ئەوانین، ناچێتەوە ئەقڵەوە خوا سزامان بدا. بەڵام بۆ خۆیان ناما قوڵی ئەکەن، ئەوەی شایانی باسبێ باوك و باپیر سودێ نابەخشن بە هیچ کەسێ، بەپەرستن و ترس و باوەڕ رێز بۆ ئادەمیزاد دائەنرێ کەواتە ئەو گومانەی ئەی ریسن کە جولەکەو گاور نەبێ کەس ناچێتە بەهەشتەوە زۆر پوچ و ناپەسەندە. لەئایەتی (١١١)ەی سورەتی ئەلبەقەرەدا بەدرێژی ئەو باسە رۆیشتووە.

جولەکە گاورەکان نابێ خۆیان هەلکێشن، پێویستە لە یاخی بوون بگەرێنەوە، ئەوەی ئەوان ئەیلێن بوختان و درۆن، بۆ دەم کوت کردن و بۆڕدانیان خوا ئەفەرموێ:

﴿ قل فلم یعن بکم بذنوبکم ﴾ تۆ بڵێ ڕاستە ئەو گومانەی ئێوە، دوایی لەبەر چ شتێ سزای ئێوە ئەدا بەهۆی گوناهەکانتانەوە ، ئەگەر کەسێ ئەو پلەیە هەبێ بە گوێرەی گومانی خۆتان ئەبوایە خوای مەزن نەسزای ئێوەی بدایەو نەشتێکی وای لەگەڵ بکردبایە شیاوی سزادانبێ.

زۆر ئاشکرایە خوا سزای ئێوە ئەدابەکوشتن و بەدیل کردن، هەندێکتانی کرد بە مەیمون، خۆپشتیان.

ئەلێن: سزامان ئەدرێ چەند ڕۆژێکی دیاری کراو، ئەوەیش دژی گومانی خۆتانە.

پرسیار: ئەو رستەیە ناگونجێ بکرێ بە وەڵام دانەوەی جولەکەو گاورەکان بۆگومانی ئەوان کە ئەوان کوڕان و خۆشەویستانی خوان، کاتێ بەڵگەیە ئەبێ بە وولام بۆ ئەوان کە پیان ووتایە خوا سزای ئێمە نادا لە پاشە ڕۆژدا، هەر کاتێ لای ئەوان نەبێ لەسەر سزادانیان لە پاشە ڕۆژدا دوایی بەڵگەی بینراویش نابێ لەسەر سزادانیان لەم ڕۆژەیشدا؟

وەڵام/ مەبەست لە سزادان شتێکە سزای جیهان و پاشە ڕۆژ بگرێتەوە، خوای مەزن سزای جولەکانی دا لە جیهاندا لەسەر دەستی فیرعەون و بەختە نەسر ڕۆمان و جگەی ئەوان بەڵام سزای گاورەکان خراپترو گران تر بو، چونکە لە جیهاندا سزایاندرا بە جەنك کردنی هەندێکیان لەگەڵ هەندێ تر یاناو ئازاردانیان بۆ یەکتری.

بەڵام بەڵگە لەسەر سزادانیان لە ڕۆژی دوواییدا خوا ئاماژەی بۆ ئەکاو ئەفەرمویێ.

﴿ بل أنتم بشر ﴾ بەڵکو ئێوە ئادەمیزادن جیاوازیتان نی‌یە لە جگەی خۆتان لــە هیــچ شتێکا.

هەمووتان نەوەی ئادەمن و ئادەمیش لە خاك دروست کراوە.

﴿ يغفر لمن يشاء ويعذب من يشاء ﴾ خوا خۆش ئەبێ لە کەســێ ئـارەزووی هـەبێ و سزای کەسێ ئەدا ئارەزووی هــەبێ، لێـی خـۆش بوونـی خـواو سزادانی خـوا بـەهۆی کردەوەی ئادەمیزادەوەیە.

دوای ئەو باسانەی رابوردن ئەبێ بزانین هیچ کەسێ ڕزگاری نابێ لەدەست توانـای خوا، ئادەمیزاد هەمویان دروست کراوی خوان، وەك ئەفەرمویێ:

﴿ ولله ملك السماوات والأرض ومـا بينـهما وإليـه المصـير ﴾ وەبـۆ خوایـە خـاوەنێتی وەپاشـایێتی ئاسمانـەکان و زەویـی وشـتێ لـە نێـوان ئەواندەیـە، خـوا دروسـت کـەری هەموبونەوەرانە هەرکەسێ بەهەر جۆرێ بێ دووره لەوەوە کـوڕی خـواو خۆشەویسـتی خوا بێ بەو جۆرەی ئێوە گومان ئەبەن، بەو بۆنەوە ئەبێ خاوەن نامەکان بزانن کە خراپتر و بێز لێی کراوەی بەندەی خوان و لـە هەموان زۆتر سزایان ئەدرێ، چونکـە بوختـان و درۆ هەڵئەبەستن کە گومانیان وایە کوڕو خۆشەویستی خــوان و، بـۆ لای خوایـە چارەنووسـی بەندەکانی خوا لە ڕۆژی دوواییــدا، دوایـی پاداشـتیان ئەداتـەوە بـە گوێـرەی کـردەوەی خۆیان.

بۆ جارێ تر خوا ڕو ئەکاتە خاوەن نامەکان بە میهرەبانیـەوە، سـرنجیان ڕائەکێشـێ بـۆ دەم کوت کردن و بۆ ڕوانیان بەهۆی ناردنی پێغەمبەرەوە ﴿ ﷺ ﴾ ڕێگەی بیانویان لێی ئەبەستێ و ئەفەرمویێ:

﴿ يا أهل الكتاب جاءكم رسولنا يبين لكم على فترة من الرسل ﴾ ئەی خاوەن نامـەکان بە ڕاستی هاتوە بۆ لای ئێوە فروستادەی ئێمە کە موحەممەدە بۆ ئێوە ڕێگەی ڕاســت هــەمو

یاساو فەرمانەکان خواو بە موژدان و ترساندنتان لەسەر بچڕان و ڕەوانە نەکردی پێغەمبەران و نەهاتنی سروش بۆ ماوەیە، ئادەمیزاد لەوماوەیەدا پێویستی زۆریان هەبو بۆ ناردنی پێغەمبەران ڕانموویی کردنیان چونکە هەموو ڕێگەی چاك و دادپەروەرییان لێ وونبووە، بۆیە فروستادەی خۆمانمان ، بۆ ناردن هەتا بیانوتان نەمێنێ. خوا ئەفەرموێ.

﴿ ان تقولوا ماجاءنا من بشير ولا نذير ﴾لە ترسی گفتوگۆی ئێوە بلێن: نەهاتووە بۆ لای ئێمە هیچ موژدەر و هیچ ترسێنەرێ بەبەهەشت بە دۆزەخ.

﴿ فقد جاءكم بشير ونذير ﴾ دوایی هات بۆ لای ئێوە موژدە بەبەهەشت و ترسێنەر بە دۆزەخ و بە پاداشت و بەتۆڵەی کاری چاك و خراپ.

﴿ والله على كل شيء قدير ﴾ وە خوا توانای بەسەر هەموو شتێکا هەیە، بە تایبەتی یارمەتی دانی موحەممەدو بەرزکردنەوەی ئایینی ئیسلام، بەلوت سۆڵانەوەی خاوەن نامەکان بۆ زانین: زانایان لە ماوەی نەهاتنی سروش بیریان جیاوازە: هەندێکیان ئەڵێن: ماوەی نێو عیساو موحەممەد ﴿ ﷺ ﴾ (٦٠٠) ساڵە.

هەندێ تریان ئەڵێن: ماوەی نێوانیان (٥٦٩) ساڵە. بەڵام ئەو ماوەیە لای زانایانی ئەم سەردەمە (٥٧١) ساڵیان دیاری کردوە بۆ نێوانیان.. هەندێ لە زانایان لایان وایە لە نێوان عیساو و پێغەمبەردا خوا چوار پێغەمبەری ڕەوانەکردوە کە ئایەتی (وأرسلنا إليهم أثنين فكذبهما فعززنا هما يثالث) ئاماژە ئەکات بە سێیانیان، ئەبو سولەیمانی دیمەشقی ئەڵێ چوارەمیان (خالیدی کوڕی سەنانە) کە پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ ئەفەرموێ: خالید پێغەمبەرە.

خوای مەزن دوای ئەو باسانەی پیشو بۆمان ڕون ئەکاتەوە هەڵوێستی جولەکەکان لەگەڵ موسادا، بەو بۆنەوە دڵخۆشی پێغەمبەر ئەداتەوە و ئەفەرموێ:

وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَـٰقَوْمِ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا

وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمۡ يُؤۡتِ أَحَدٗا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٠﴾ يَٰقَوۡمِ ٱدۡخُلُواْ
ٱلۡأَرۡضَ ٱلۡمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِي كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَرۡتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدۡبَارِكُمۡ
فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ﴿٢١﴾ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ فِيهَا قَوۡمٗا جَبَّارِينَ
وَإِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَا حَتَّىٰ يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا فَإِن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا
فَإِنَّا دَٰخِلُونَ ﴿٢٢﴾ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ
أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمَا ٱدۡخُلُواْ عَلَيۡهِمُ ٱلۡبَابَ فَإِذَا دَخَلۡتُمُوهُ
فَإِنَّكُمۡ غَٰلِبُونَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٢٣﴾
قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَآ أَبَدٗا مَّا دَامُواْ فِيهَا فَٱذۡهَبۡ
أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ﴿٢٤﴾ قَالَ رَبِّ
إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ إِلَّا نَفۡسِي وَأَخِي فَٱفۡرُقۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ ٱلۡقَوۡمِ
ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيۡهِمۡ أَرۡبَعِينَ سَنَةٗ
يَتِيهُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ فَلَا تَأۡسَ عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ
﴿٢٦﴾

﴿ وإذ قال موسى لقومه يا قوم اذكروا نعمة الله عليكم ﴾ وە تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە موسا ووتی بە تاقمەکانی خۆی ئەی خزمانی من: ئێوە بیری چاکەی خوا بکەنەوە بەسەر تانەوەیە.

﴿ إذ جعل فيكم أنبياء وجعلكم ملوكاً ﴾ لەبەر ئەوەی خوا دروستی کردوە لەناو ئێوەدا چەندین پێغەمبەر بە جگەی ئێوەی نەداوەو هەواڵی نادیاریان بە ئێوە ئەدا، بەهۆی ئەوانەوە سەرکەوتن بەسەر دوژمنانی خۆتانا، هەمو یاسای خوایی بۆتانی ڕون کردەوەو ئێوەی گیرا بە چەندین پاشا سەربەخۆبن خۆتان فەرمانی خۆتان ببەن بەڕێوە، لە پێشا بەندەو چەوساوەی فیرعەون بون، سامانی زۆری داوە پێتان بەرلەوە هەژار بوون.

﴿ وآتاكم مالم يؤت احدا من العالمين ﴾ وە خوابە خشیبووی بە ئێوە شتێ نەی بەخشیبو بەهیچ کەسێ لەبوونەوەران و ئادەمیزاد، بەبێ جەنگ دوژمنەکانی ئێوەی لەناو برد، بەبێ چاندن و درەو گەزۆو شێلاقەی بۆ ناردنە خوارەوە، بەبێ چاڵ و هەڵکەندن لەبەردیلوس ئاوی بۆ ئێوە دەرهێنا، بەبێ ئازار و کۆڵەکە هەوری بۆ ئێوە کرد بە سێبەر.

دوای ئەوەی کە موسا باسی ئەو چاکانەی خوای بۆ کردن، فەرمانیان پێدرا بە داگیرکردنی فەلەستین کە ئەو کاتە بە دەست حەیسی و کەنعانیەکانەوە بو، فەرمانی پێدان جەنگ بکەن لە گەلێان و خۆڕاگرین بەرانبەریان، موسا بە گوێرەی فەرمانی خوا بە خزمەکانی خۆی ووت:

﴿ ياقوم ادخلوا الآرض المقدسة التي كتب الله لكم ﴾ ئەی خزم و نەتەوەی خۆم ئێوە بچنە نێو ئەو زەویە پیرۆزەی ئەو تەوتۆ خوانوسیوێتی بۆ ئێوە پێتانی بەخشیوەو کردوێتی بە نیشتمان بۆتان زۆردارە تاوانبارەکانیان لێی دەرکەن و پەلاماریان بدەن و مەترسن خوا بەڵێنی داوە بیکا بە جێگای ئێوە .

﴿ ولا ترتدوا على ادباركم فتقلبوا خاسرين ﴾ وە ئێوە مەگەرێنەوە بەرەو دوای خۆتان لەبەر ترسی ئەو زۆردارو تاوانبارانە، دوایی ئێوە بگەڕێنەوە و زەرۆمەندی هەردو جیهان ببن.

﴿ قالوا یاموسی إن فیها قوماً جبارین﴾ خزمەکانی ووتیان: یا موسا بە ڕاستی هەیە لە نێو ئەو زەویە پیرۆزەدا تاقمێکی بە هێزو خاوەن زەبر لە توانای ئێمەدا نیە جەنگیان لەگەڵ بکەین و بۆمان ناگونجێ.

﴿ فإن یخرجوا منها فأن داخلون ﴾ دوایی ئەگەر ئەوان لەو زەویەدا چونە دەرەوە، بێ ئەوەی ئێمە تووشی جەنگ ببین، دوای ئەوەی چونە دەرەوە بە ڕاستی ئێمە ئەچینە نێو ئەو زەوییە پیرۆزە. جولەکەکان ئەیان وبست سەر بکەون بە ئاسانی و خۆشی بەبێ کوشتن وبرینداری بە وێنەی خنکاندنی فیرعەون و لەشکرەکەی لەناوچون.

﴿ قال رجلان من الذین یخافون أنعم الله علیهم ﴾ دوو پیاوی چاك لە جولەکەکان ڕاپەڕین و ئامۆژکاریان کردن وهانیاندان بۆ گرتنی ئەو شارەو فەرمانبەرداری فردستادەی خوابن، ئەو دوو کەسانە لەو کەسانەی ئەوتۆ بون لە خوا ئەترسان و لەدوژمن باکیان نەبوو لە سزای خوا ئەترسان خوا چاکەی بەسەردا ڕژاندبوون بە باوەڕی بێ گەردو لەوان نەئەترسان چونکە ئەیانزانی ئەو گەلە زلحۆو بێ هێزن، بە خزمانی خۆیانیان ووت:

﴿ادخلوا علیهم الباب فأذا دخلتموه فأنکم غالبون ﴾ ئێوە بچنە نێو ئەو زەویەوە بدەن بەسەریانا لە دەرگای شارەوە لەوان مەترسن و مەیەڵن بێنە دەرەوە و گەمارۆیان بدەن با هێزیان نەمێنێ‌و ترس یکەوێتە دەرونیان، دوایی ئێوە چونە ناوی ئەو شارە لەو دەرگاییەوە لەناکاودا ئەوان بێ ئاگابن، دووایی ئێوە بە ڕاستی زاڵ ئەبن بەسەریانا بێ کوشتن و ئازار و چاویان بە ئێوە بکەوێ هورە بەرئەدەن، چونکە هەرچەندە لەشیان گەورە بە بەلام بێ خیرەتن. توانای پەلاماردانی ئێوە یان نیە، ئەو دوو پییاوە ئەوانەیان ئەزانی بە هۆی فەرموودەی موساوە .

﴿ وعلی الله فتوکلوا إن کنتم مؤمنین ﴾ دوایی ئێوە هەرپشت ببەستن بە خوا ئەگەر ئێوە باوەڕدارن بە فەرموودەکانی خواو بەڵێنی خواو پشت ببەستن بە خوا لە پێشا پێویستە تفاقی جەنگ ئامادەکەن. لە دوایی‌دا داوای یارمەتی لە خوا بکەن.

بەڵام جولەکەمان دووبارە گەڕانەوە بۆ لای ڕەوشتە خراپەکەی خۆیان و یاخی بونی خۆیان .

﴿ قالوا یاموسی إنا لن ندخلها ابدأ ماداموا فیها ﴾ ووتیان: ئەی موسا بە ڕاستی ئێمە ناچینە نێو ئەو شارە پیرۆزە بابۆ ماوەیێکی کەمیش بێ بەمەرجێ ئەوان بەردەوام بن لە نێو ئەو شارەدا زۆر سەیرە تۆ بە گفتوگۆی ئەو دوو کەسە بڕوا ئەکەی بە بیروبۆچوونی (١٠) کەس بڕوانامەکەی ، ئەو دوو کەسەو ئەو (١٠) کەسە ئەو دووازدە نەفەرەبوون موسا ناردنی بۆ تاقی کردنەوەی چۆنیەتی دانیشتوانی ئەو زەویە و هەواڵ هێنانەوەیان.

دووایی جولەکەکان بەئەوپەڕی بێ شەرمی و گاڵتە کردن بە خواو فروستادەی خواو نرخ دانەنان بۆیان ووتیان ڕوبەڕوی موسا:

﴿فاذهب انت وربك فقاتلا إنا ههنا قاعدون ﴾ دوایی تۆو خوای تۆ برۆن بۆ سەر ئەو تاقمە دوو ایی هەردوولاتان جەنگیان لەگەڵ بکەن، بە راستی ئێمە لێرەدا ئەنیشین چاوەڕوانی ئێوە ئەکەین.

ناوەڕۆکی ئەو دوو ڕستەیە ی پێشوو پیشانمان ئەدەن ئەگەر خوا خزمەتی جولەکان بکاو ئازاریان نەداو داوای شتی گرانیان لێی نەکاو دوژمنیان لەناوبداو ئەمان دانیشن لەو کاتانەدا خوای ئەوانە. بەلأم ئەگەر بچوکترین شتیان لێی داوا بکا توشی ئازاریان بکا لەوکاتەدا خوای ئەوان نیە خوای موسایە یانێ جولەکەکان لە ناوەرۆکا خوای ئەوان ڕابوواردن و خۆش گوەزەرانی و هەواو هەوەس کالأو والأی جیهانە.

دووایی موسا کەوتە سکالأی بێ کەسی خۆی و گیر خواردنی لە نێو ئەو تاقمە ڕکە چییە خۆی دووایی ئەو هەموە ماندووبونەی بە دورو درێژی بۆ سودی ئەوان.

﴿ قال رب إني لا أملك إلا نفسي وأخي فافرق بيننا وبين القوم الفاسقين ﴾ موسا ووتی:

ئەی پەروەردەکەری من : بە ڕاستی من خاوەنی هیچ کەسێ نیم بۆ یاریدانی ئایینی تۆ جگەی خۆم و براکەیشم خاوەنی هیچ کەس نی‌یە جگەی خۆی، یامن توانام بەسەر هیچ کەسدا نیە مەگەر خۆم وبراکەم.

دوایی تۆ جیاوازی بخەرە نێوان ئێمە وگەلێ لایانداو لە فەرمانی تۆ، فەرمان بدە بەشتێ شایستەی ئێمەیە، فەرمان بدە بە شتێ شایستەی ئەوانە. بە کورتی موسا هیچ شتێکی بۆ

نەمایەوە دوای پاش گەز بونەوەی جولەکەکان لە پەیمانی خوا مەگەر ئەوە نەبێ خۆی و براکەی لە کۆشش نەوەستن. بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا موسا خۆی و تاقمەکەی ئامادە کردبوو بۆ بەجێ هێنانی فەرمانی خوا.

﴿ قال انها محرمة عليهم اربعين سنة يتيهون في الارض ﴾ خوا فەرمووی: دوایی بەڕاستی ئەو خاکە پیرۆزە قەدەغە کریا لەسەریان و ناچنە ناوی بەهۆی پاش گەزبونەوەیان لە فەرمانی تۆ بۆ ماوەی چل ساڵ بیێن و بڕۆن و سەرگردان بە نێو ئەو پارچە زەویەدا و سەر بۆ هیچ شوێنێ دەرنەکەن.

هەروەها بەو شێوەیە مانەوە لەوێدا، لەو ماوەیەدا هەمو پیرەکانیان مردن،دوای مردنی ئەوان نەوەی تازە لەوان پێ گەیشتن و ئازار و چاو نەترس و بە هورە.

﴿ فلا تأس على القوم الفاسقين ﴾ دوایی موسا تۆ خەفەت مەخۆ لەسەر کردەوەی نارەوای ئەو تاقمە لایانداوە لە فەرمانی خواو پەیڕەوی کردنی تۆ.

لە ماوەی ئەو چل ساڵەدا موساو هارونی برای موسا کۆچی دووایبان کرد. پاش ئەوان خوا یوشەعی کرد بە پێشەوای نەوە تازە پێ گەیشتووەکان، خوا یوشەعی کرد بە پێغەمبەریان و پەلاماریان بردە سەر دانیشتوانی ئەو خاکە پیرۆزە و زاڵبون بەسەریانا.

خوای مەزن لە ئایەتەکانی پێشودا باسی جولەکەکان وشکاندنی پەیمان و بەڵێنیئەوانی کرد ئێستاش باسی ستەمی کوڕێکی ئادەممان بۆ ئەکا لە براێیکی خۆی. یانێ زۆر ڕاستە ئەی موحەمەد ئەو جولەکانە نیازی کوشتنی تۆیان کرد، ئەبێ بزانرێ ئەوکارە نارەوایانە کۆنە تازە پەیدا نەبوون لەوانەوە. بەڵکو ئەوان لەوەو بەریش پێغەمبەرەکانی خۆیانیان کوشتوە، بەر لەوانیش بۆیەکەمجار کوڕێکی ئادەم بە نارەوا براێیکی خۆی کوشت. جا لەبەر ئەوەی خراپەکردن کۆنەو تازە نیە تویش دڵگران مەبە لەسەر پیلانی دوژمنانی خۆت، باسی ڕوداوی دڵ تەزێنی نێوان ئەو دوو کوڕەی ئادەمیان بەسەردا بخوێنەرەوە، بۆیان ڕون بکەرەوە بەو جۆرەی کە خوای مەزن فەرموی:

وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱبۡنَيۡ ءَادَمَ بِٱلۡحَقِّ إِذۡ قَرَّبَا قُرۡبَانٗا

فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ ٱلْآخَرِ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ
قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾ لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ
لِتَقْتُلَنِى مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٍ يَدِىَ إِلَيْكَ لِأَقْتُلَكَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ
رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ إِنِّىٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثْمِى وَإِثْمِكَ فَتَكُونَ
مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُا۟ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَطَوَّعَتْ
رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ إِنِّىٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثْمِى وَإِثْمِكَ فَتَكُونَ
مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُا۟ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَطَوَّعَتْ
لَهُۥ نَفْسُهُۥ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُۥ فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٣٠﴾
فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابًا يَبْحَثُ فِى ٱلْأَرْضِ لِيُرِيَهُۥ كَيْفَ يُوَٰرِى
سَوْءَةَ أَخِيهِ قَالَ يَٰوَيْلَتَىٰٓ أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَٰذَا
ٱلْغُرَابِ فَأُوَٰرِىَ سَوْءَةَ أَخِى فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلنَّٰدِمِينَ ﴿٣١﴾

﴿ وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبأَ أبْنى أدَمْ بالحَقِ ﴾ وە تۆ بخوێنەرەوە بەسەر خاوەن نامەكانا بەسەر موسوڵمانان و هەمو دانیشتوانی ڕوی زەویی هەواڵی دوو كوڕەكانی ئادەم بەسەر هاتیان بەڕاستو دروستی ـ بۆ ئەوەی تۆ بزانی بەو شتانە خاوەن نامەكان كردونیان بە سروشت بۆ خۆیان لە كینەو چاو چنۆكی و دەست درێژی و كوشتنی برایانی خۆیان.

﴿ إذ قربا قرباناً فتقبل من أحدهما ولم يتقبل من الآخر﴾ کاتێ ئەو دوو کوڕانە کوڕی پشتی ئادەم بوون یالە نەوەی ئادەم بوون؟ ئەو قوربانیە چ شتێ بوە؟ ئەوانە هەمویان هەواڵەی هێزێکی نادیارین بەهەر شێوەیە بۆ بێ ئەو شتانە بە ئێمە فێر نەکراوە لە لایەن سەرچاوەێکی بڕوا پێ کراو.

بەڵام دوو شتمان پیشان ئەدەن:

١-ئێمە خۆمان ماندو نەکەین بۆی دانەچین وابزانین پێویستی سەرشانمانە ناسینی ناوی ئەو دوو کوڕانە، هەروەها جۆری وەرگیرانی قوربانیەکە چۆن بوە؟

٢-ئەوەی ڕاستی بێ هەموو ئادەمیزاد بە گوێرەی سروشتی خۆیان خاوەنی ئامادەیین بۆ چاکە کردن و خۆ گەڕانەوە لە خراپە. بەڵام هەندێکیان خاوەنی ئەقلێکی تەواو ئاینێکی تێدایە ڕویان پێ بکا بۆ لای چاکەو لە خراپە لایاندا، هەندێ تریان ئایینیان لاوازەو ئەقلیان ناتەواوە لەگەڵ ئارەزوو هەوەسی خراپی خۆیان ئەڕۆن.

زۆرترین لەو کەسانە مانای قروئانیان کردوە باسی چیرۆکی ئەو دوو کوڕانەیان کردوە. بەڵام سەرچاوەیان نەبوە جگەی (العهد القديم)ی جولەکەکان، ئێمە پوختەی مانای دەرکەوتوی ئایەتەکان ئەکەین بەم جۆرەی خوارەوە.

بە ڕاستی ئەو دوو کەسە ئاژاوەیان بوە لە گەڵ یەکتری ڕاستە وخۆ کوڕی پشتی ئادەم بوون بەبێ دیاری کردنی ناوەکانیان. زانایان ئەڵێن: ناوی بکوژ قابیلە، ناوی کوژراوەکە هابیلە هۆی ئاژاوەکەیان ئەوەیە هەریەکەیان قوربانی ئەکەن لەبەر فەرموودەی خوا، دووایی خوا لە هابیلی وەرئەگرێ و لەقابیلی وەرناگرێ، جۆری قوربانیەکەو چۆنیەتی وەرگرتنی باس نەکردوە.

شاراوەی دڵی قابیل جوڵاو هەڕەشەی کوشتنی لەبراکەی کرد، براکەیشی ووتی: تۆ تاوان لە خۆت ئەکەی و لۆمەی من مەکە، خوا قوربانی لە خواترسان وەرئەگرێ و تۆ لەوان نیت، ئەگەر بتەوێ من بکوژی من نامەوێ تۆ بکوژم ، ئەگەر تۆ من بکوژی ، تۆ

ئەگەڕێیتەوە بە گوناهی کوشتنی منەوەو بە گوناهی وەرنەگرتنی قوربانیەکەی خۆت.بەڵام ئەو گفتوگۆیانە کاریان نەکردە سەردەرونی قابیل، بە پیچەوانەوە ڕقی زۆر تر پەرەی سەند و بەناڕەوا براکەی خۆی کوشت، دوای ئەوە لەشی براکەی لەبەردەمیا کەوت نەیزانی چۆنی پشارێتەوە، خوای گەورە قەلە ڕەشێکی ناردو بە قاچی و بەدەنوکی چاڵێکی هەڵکەند، کە ئەوەی چاوپێ کەوت سەرگەردانیەکەی نەماو براکەی نایە کۆڕەوە. بەڵام دەستی خۆی کەست لە پەشیمانیدا، دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت لەقەلە ڕەش کەمترە.

ئەوەی باسکرا کورتەی بەسەر هاتی ئەو دوو کوڕانەی ئادەمە بۆ چاکتر ڕون کردنەوەی خوای مەزن ئەفەرموێ.

﴿ قال لا قتلك قال إنما يتقبل الله من المتقين ﴾ ئەو کەسەی قوربانیەکەی لێ وەرنەگیرا ووتی:

بەراستی من تۆ ئەکوژم لەبەر ئەوەی قوربانی تۆ وەرگیراوە، ئەوەیان قوربانیەکەی لێی وەرگیرابوو ووتی: لەبەر چ شتێ من ئەکوژی من هیچ تاوانێکم نەکردووە، بەڵام بەراستی قوربانی وەرناگیرێ مەگەر لە کەسانێ وەرئەگیرێ لە خواپەرسن و نیازیان پاکتبێ.

﴿ لئن بسطت إلي يدك لتقتلني ﴾ بە راستی ئەگەر تۆ دەستی خۆت درێژبکەی بۆ لای بۆ ئەوەی تۆ من بکوژی بەبێ تاوان.

﴿ ما أنا بباسط يدى إليك لأقتلك ﴾ من درێژناکەم دەستی خۆم بۆ لای تۆ بۆ ئەوەی من تۆ بکوژم، هەرچەندە من لە تۆ بە هێز ترم من بە وێنە تۆ خراپە ناکەم و ووڵامت نادەمەوە .

﴿ إني أخاف الله رب العالمين ﴾ بەڕاستی من ئەترسم لە خوای پەروەردەکەری هەموو بونەوەران من شەرم ئەکەم خوا من ببینێ ودەست درێژ بکەم بۆ لای تۆو بۆ کوشتن.

﴿ إني اريد ان تبوأ بأثمي وإثمك فتكون من اصحال النار وذلك جزاء الظالمين ﴾ بە ڕاستی من ئەمەوێ تۆ بگەڕێتەوە بە هۆی گوناهی کوشتنی منەوە بەهۆی گوناهی

وەرنەگرتنی قوربانیەکەت هەرکاتێ من بکوژی، دوایی تۆبەو بۆنەوە ببی لە دانیشتوانی ئاگری دۆزەخ لە پاشە رۆژدا، وە دۆزەخ پاداشتی کەسانێکە ستەم کاربن بەو وێنەی تۆ کە من بکوژی بە نارەوا.

﴿ فطوعت له نفسه قتل اخيه فقتله فأصبح من الخاسرين ﴾ دوایی دەرونی پیسی قابیل کوشتنی براکەی خۆی بۆ رازانەوە، دوایی براکەی خۆی کوشت بە نارەوایی، دوای کوشتنی براکەی گەرا لە کەسانێ زیان مەندبن بەهۆی سزادانیان لە دۆزەخدا.

جۆری کوشتنی براکەی چۆن بووە بە چ شتێ کوشتنی گرنك نیە، ئەوەی جێگەی سەر سورمانێ چۆن دڵی هات برای خۆی بکوژی؟ کاتێ براکەی خۆی کوشت سەرگەردان بوو پەشیمان بویەوە نەی ئەزانی چ شتێ بکاو چۆن لەشی براکەی بشارێتەوە، چونکە یەکەمین کات بوو کەسێ بمرێ لە کورانی ئادەم.

﴿ فبعث الله غراباً يبحث في الآرض ﴾ دوایی خوا بە میهرەبانی خۆی بۆ فێر کردنی ئەو کورەی ئادەم و بۆ ئادەمیزادی پاش ئەو قەلە رەشێکی نارد هەڵی کەند چاڵێ لەزەویدا بە دەنوکو قاچەکانی و قەلە رەشێکی تری مردوی هێناونایە چاڵەکە و خۆڵی دا بە سەریاودای پۆشی مردنی قەلەرەشەکە بە هەر شێوەیە بو بێ گرنگ نیە.

﴿ ليريه كيف يوارى سورة أخيه ﴾ ناردنی ئەو قەلە رەشە بۆ ئەوەبو خوانیشانی ئەو کورەی ئادەم بدا بە چ جۆرێ بشارێتەوە شەرم گەو لەشی براکەی خۆی.. ئەتوانرێ راناوی ووشەی (یری) بچێتەوە بۆ لای قەلەرەشەکە.

﴿ قال ياويلتي أعجزت أن اكون مثل هذا الغراب ﴾ دوای کوشتنی براکەی خەفەت و ئازار دای گرت ووتی: هاوار بۆ من لەسەر ئەو گوناهەی من کردم و کارێکی خراپم کرد ئایا من ئەوەندە نەزان و لاواز بوم کە من وێنەی ئەو قەلە رەشە بومایەو رانموێم وەربگرتایە بە وێنەی ئەو.

﴿فأوارى سوأة أخي فأصبح من النادمين ﴾ دوایی من دام پۆشی بایە شەرم کەو لەشی برای خۆم، دوایی گەرا لەو کەسانەی پەشیمان ببنەوە لەسە رکارێ کردبێتان، بە تایبەتی

لەسەر کوشتنی براکەی، جۆری سەرگەردانی ئەو برا کـوژەی خـۆی، نـەزانینی جـۆری شاردنەوەی لەشی براکەی. ناردنی قەلەرەش بۆ فێرکردنی شـاردنەوەی ئەمـەمان نیشـان ئەدەن کە ئەو دوو کورانە کوری پشتی ئادەم بوون، چونکە هەر ئەوان نەیان دیبوو مردنی کەسێك و شاردنەوەی لە گۆڕدا.

بەراستی ڕوداوو بەسەر هاتی ئەو دوو کوڕانەی ئادەم بۆمانی ڕون ئەکاتـەوە ئـادەمیزاد دوو جۆرن (١) تاوانباران و لە سنوری خوا دەرچوان (٢) بێ تاوانـان بـۆ پاراستنی بـێ تاوانان لە تاوانبـاران . بۆ مانـەوەی بـێ تاوانـان و بـەردەوامیان و دابـەزاندنی ژیـان و گوزەرانی خۆش بۆیان.

بۆ ڕاوەستانی یاسای خوای مەزن. قورئانی پیرۆز دیاری کردوە بۆ هەمو ئەو کەسانەی لە سنوری خوا دەرئەچن سزایێکی واشایانی ئەو کەسانە بێ کەبێ تاوان ئەکوژن، کوشتنی ئادەمیزاد بەبێ تاوان بە گەورەترین گوناە دانراوە، ئیتر ئەو کوشتنە لەهەر کەسێکە وەبێ، نەك بەتایبەتی لەدوو کوڕەکەی ئادەم هەرچەندە ئەوان بونە هۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەو یاسایە بۆ ئەو تاوانە گەورەیە. ئاشکرایە دانانی یاسای گشتی بـەهۆی ڕووداوێکـی تایبەتیـە بوە، بۆ ڕاوەستانی ئەو یاسایە و بۆ چەسپاندنی بەسەر ئادەمیزادا خوا ئەفەرموێ:

مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنَّهُ مَن قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا ۚ وَلَقَدْ جَاءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِالْبَيِّنَاتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم بَعْدَ ذَٰلِكَ فِي الْأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ ﴿٣٢﴾

﴿ من اجل ذلك ﴾ لەبەر گەورەیی تاوانی کوشتن لەهەر کەسێکە وەبێ، لەبەرزیانی کوشتن کە هەمو خراپە و بێ نرخی ئایین و جیهانی تێدایە و بەختیاری پاشە ڕۆژیش لە کیس ئەدا، ئیتر کوشتن بەهەر هۆییەکی ناڕەوابێ، نەك تەنها بە ڕووداوی کوشتنی کوڕی ئادەم، هەر چەندە کوشتنی ئەو هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم، ئایەتەیە.

﴿ کتبنا علی بنی اسرائیل أنه من قتل نفسا بغیر نفس ﴾ ئێمە پێویستمان کردبوو لەسەر بەنی ئیسرائیلی کە بەراستی هەر کەسێ بە ناڕەوا کەسێ تر بکوژێ بەبێ ئەوەی کەسێکی کوشتبێ.

﴿أو فساد في الارض فكأنما قتل الناس جميعاً ﴾ یا کەسێ بکوژێ بەبێ ئەوەی خراپە و بێ ئایینی پەیدا بوبێ لە زەویدا. یا بەبێ ئەوەی ئاسایشی دانیشتوان تێك بدا، دوایی وەك ئەوە وایە هەموو ئادەمیزادی کوشتبێ، چونکە بەهۆی کوشتنی یەك کەسەوە هەتکی ڕێز و نرخی هەمو ئادەمیزادی کردوە بەبێ جیاوازی، ئەگەر کوشتنی یەك کەسی لاڕەوا بێ کوشتنی هەمو کەسێ لاڕوەوایە، خەشمی خوا بۆ کوشتنی یەك کەس و زۆر تر لەیەك کەس یەکسانە لای بۆ زانین: ئەو هۆیانە ئەبنە جێگە بۆ ڕەوابونی کوشتنی ئادەمیزاد ئەمانەن:

کەسێ بەبێ تاوان کەسێ تر بکوژێ. ئەو کەسانەی هاوبەش بۆ خوا دائەنێن. ئەو کەسانە لە ئایینی ئیسلام وەرئەگەڕێن. ئەو کەسانەی ڕێگە گرو جەردەن.

پرسیار: سزای کوشتن جولەکەکان و جگەی ئەوانیش ئەگەڕێتەو، هۆی ناوبردنی جولەکەکان بە تایبەتی چ شتێکە؟

وەلام: زۆر ڕاستە ئەو سزایە هەمو ئادەمیزاد ئەگەڕێتەوە، بەلام خوای مەزن ناوی ئسرائیلیەکان بردوە بەتایبەتی، چونکە ئەوان بۆ کوشتنی ئادەمیزاد لە هەمو کەس نالەباترن، بۆ ڕژاندنی خوێینی ئادەمیزاد. تینون بۆ بەلگە لە تەوراتە دەست کردەکەیاندا کوشتنی منالان و ژنانی جگەی خۆیان بە ڕەوا داناوە، کوشتنی پێغەمبەرەکانی خۆیان گەورەترین بەلگەن لەسەر خوێن ڕژاندنی ئەوان.

بۆ ئاگاداری: کوشتنی موسولمانان وبەڕەوا دانانی کوشتنی ئادەمیزاد تەنها جولەکەکان بە ڕەوای دانێن، بۆ نموونە. کۆماری عیراقی بەعسی زۆرتر لە (١٨٠) هەزار

منالّ و ژن و پیرو پەك کەوتەی زیندە بە چالّ کرد بە ناویی ئەنفالەوە. بە گــازی خــەردەل لە پێنج هەزار زۆرتر دانیشتوی شاری هەڵەبجەی کوشت، هەروەها لە جێگــەکانی تریــش زۆر کەسی تریان گوشت، ئەو کەسانە کوژران هەر لەبەر ئەوەی کورد بون. تورکــەکان هەر لە کاتی عوسمانیەکانەوە هەتا ئەم سەردەمەی ئێمە بە هەزاران کوردیان.

کوشتوە، بە تایبەتی لە کاتی موستەفا کــە مالــەوە، هــەروە فارســەکان لــە تورکــەکان کەمترنین بۆ کوشتنی کوردان، لەلایەترەوە روسیای شیوعی زۆرتر لە پێنــچ هــەزاری لــە شۆرش گێرەکانی ئەفغانی کوشت. ستەمی رژێمەکانی ترنایەنە ژمارە.

﴿ ومن احیاها فکأنما احیا الناس جمیعاً ﴾ وە کەسێ رزگار بکا کەسێ تر لە کوشــتن و لە هۆی کوشتنی ژیانی بپارێزێ و ببێتە هۆی مانەوەی، خۆی بگیرێتەوە لە کوشتنی کەسێ تر یا نەیەڵێ بیکوژن، یارزگاری بکا لە دەستی ستەمکارێ، دوایی وەك ئەوەوایە رزگاری کردبێ هەمو ئادەمیزاد.

ئەو ئایەتە ئەوەمان پیشان ئەدا مانەوەی تا کە کەســێ خــۆی لــە خۆیــا مەبەســتە، نــەك هۆیەکبێ و رێگەبێ بۆ لای مانەوەی جگەی خۆی، ئەو رێزگرتنەی تاکــە کەســێ شــتێکی مرۆڤایەتیە. یانێ بۆ تاکە کەسێ هەیە رێزی لێی بگیرێ بە وێنەی رێز گرتن لــە مرۆڤــایێتی، دەست دریژی بۆ سەر تا کە کەسێ دەست درێژیە بۆ سەر مرۆڤایێتی، چونکە تاکە تاکــەی ئادەمیزاد نوێنەری مرۆڤایەتین، چاکە کردن لەگەڵ تاکەکەسدا چاکە یە لەگەڵ مرۆڤایێتی.

هەر کۆمەڵێ تا کەکەسێکی هەژار و لاوازی تێدابێ و بترسێ مافی پێشێل بکــرێ ئــەو کۆمەڵە خۆی لە خۆیا لاوازو بۆ گەنە، وەك لــە شــتێ وایــە ئــەندامێکی نــەمێنێ، کەواتــە سوودی تاکەکەسێك و سودی کۆمەل تەواوکەری یەکترین لەیەك جۆبێ نابنەوە.

﴿ ولقد جاءتهم رسلنا بالبینات ثم إن کثـیراً منـهم بعـد ذلـك فـي الارض لمسـرفون﴾ بەراستی هاتبوبۆ لای بەنی ئیسرائیل فروستادەکانی ئێمــە بــە چــەندین کــاری یــەك خــەرو بەلگەی ئاشکرا لەپاشا زۆر لەوان دووای چونی فروستادەکانی ئێمە زۆرتر لەوان لایــاندا لە سنوری دادپەروەری لە نێو زەویدا بە کردەوەی خراپ و کوشتنی ئادەمیزاد بە تایبــەتی کوشتنی پێغەمبەرەکانی خۆیان، بۆیە پیانویان لێی وەرناگیرێ.

بەراستی هیچ کەسێ بۆی نیە خۆی بە خاوەنی ئیسلام بزانێ کەچی پاڵ پشتیێ بۆ ئەو کەسانە لە سنوری خوا دەرچوون، بە ناوی ئیسلامەوە ستەم و دەست بڕینی نالەبار بلاو بکاتەوە. بە راستی ئەو کەسانە مافی گەورەیی خوای مەزنیان زەوت کردوە، بۆ ڕون کردنەوەی ئەو مەبەستانە خوا ئەفەرموێ:

إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٣٣﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبۡلِ أَن تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهِمۡۖ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٣٤﴾

﴿ إنما جزاء الذين يحاربون الله ورسوله﴾ بەراستی کەسانێکی ئەو تۆ جەنگ ئەکەن لەگەڵ خوا و فروستادەی خوا، یانێ لەگەڵ دۆستانی خواو فروستادەی خوا. واتە دەست درێژ کردن بە ناڕوا بۆ سەر دانیشتوان وەك دەست درێژیە بۆ سەر خواو فروستادەی خوا، هەر لەبەر ئەوەیشە سزای ئەو دەست درێژیە یاسای بۆ دیاری کراوە لای خوا بە ئەو پەڕی تەمێ کردن.

﴿ ویسعون في الارض فساداً ﴾ وەئەو کەسانە کۆشش ئەکەن بۆ خراپە کردن لە زەویدا بۆ تێك چونی ئاسایش و ژیانی دانیشتوان و تالاَن کردنیان و ڕێگە گرتن لەوان و کوشتنی بێ تاوان و دزینی سامانیان، سزاکانیشیان ئەمەیە.

﴿ ان يقتلوا أو يصلبوا أو تقطع ايديهم وأرجلهم من خلاف ﴾ كە بكوژرێن ئەگەر دانیشتوان بکوژن بەبێ هەڵواسین، یا هەڵبواسرێن لە کاتێکا دانیشتوان بکوژن و دارایشییان لێی بسێنن، ئەو هەڵواسینە بەرلە مردنیانبێ یا دوای مردن زانایان بیریان جیاوازە، یادەستیان و پێکانیان ببرڕێ بە جیاوازی یانێ چەپ و راست ئەگەر ڕێگە بگرن لە دانیشتوان و دارایان لێ بسێنن، ئەبێ ئەو دەست برینە بە جۆرێ بێ ئەوەندە خوێنیان نەڕوا هەتا بمرن، ئیتر بە هەر جۆرێ ئەی برن.

﴿ او ينفوا من الارض ﴾ یا دور بخرێنەوە لە جێگەی خۆیانەوە بۆ جێگەیەتر ئەگەر تەنها ڕێگەیان گرتبێ و دانیشتوانیان ترساندبێ بەبێ کوشتن و دارایی لێی سەند بان.

زانایان دەربارەی جیبەجێ کردنی ئەو یاساو سنورانەی بەسەر ئەو جەردانەدا بیریان جیاوازە لای شافعیەکان بەو جۆرە باس کران لە ماناکردنی ئایەتەکاندا، ئەو بۆ چونەی شافعیەکان ڕێك وپێك ترو شیاو ترە لەگەڵ ڕووالەتی دەرکەوتوی ئایەتەکەدا. لای حەنەفیەکان ئەگە ر داراییان لێی سەندن و کوشتنیان دادوەر بۆی هەیە دەست و پێان چەپ و ڕاستا ببڕێ، ئەگەر ئارەزووی کرد بیان کوژێ و هەڵیان نەواسێ، بۆی هەیە بیان کوژێ و هەڵیانئواسێ بەزیندویی وسکیان بدڕن بەڕم هەتا ئەمرنو هەڵواسینەکەیش سێ ڕۆژبێ بە تەنها.

﴿ ذَلِكَ لهم خَزيٌ لهم في الدُنيا وَلَهُمْ فِي الأخِرَةِ عَذابٌ عَظِيمٌ ﴾ ئەو سنورە ناوبراوانە بۆ ئەو کەسانە ڕسوایی و بێ ئابڕوییە بۆیان لە جیهانداو، بۆ ئەو کەسانەیش هەیە سزایەکی گەورە لە ڕۆژی دوایدا.

ئەو سنورانە کە باسکران بەسەرموسڵماندا بەکار ئەهێنرێن کاتێ دەست بکەن بە ڕێگەگرتن و جەردەیی لە دانیشتوان، ئیتر ئەو کارە خراپە یان لە زەویدابێ یا لە نێو ئاوودا، لە شارابێ یا لە کەژو کێودا، چەکەکانیان تیرو ڕمبێ یا شتێ تر، دەست درێژەکانیان لەسەردانیشتوان بێ یا لەسەر سامان و ناموسیانبێ. بەلام ئەگەر ئەو ڕێگەگرانە بێ باوەڕبن سنورەکانیان لەمەو پاش باس ئەکرێن.

﴿ إلاّ الذيْنَ تابُوا مِنْ قَبْلَ أنْ تَقْدروا عَلَيْهِمْ ﴾ مەگەر کەسانێکی ئەوتۆ لەو ڕێکەگرو جەردانە پەشیمان بوبونەوە بە خۆشی خۆیان و وازیان هێنابێ لەو کارانە کردویانە بەر

لەوەی ئێوە دەسـتەڵات پـەیدا بکـەن بەسـەریانا لـە و کاتـەدا ئـەو تاوانبارانـە وازر لـەو ڕێگەگرتنە بهێنن کە خۆیان لـە خۆیانەوە وازیان هێنا پێویست بە سزادان نامێنێ، ئەو جۆرە دەستورە بۆ سزادانی ئەو پیاوخراپانە ڕاسترین و شایان ترو بێ وێنەیە بۆ ڕێـزی مرۆڤایـەتی کە ئـاینی ئیسـلام داینـاوە بـۆ هـەردوو لایـەنی تاوانبـارو سـتەم لێ کـراو بەشـێوەیەکی دادپەروەرانە.

ئەوەی شایانی باسێ پەشیمان بونەوەیان بەر لەوەی لەدەست بەسەراگرتنیان کە سزای تەمێ کردنەکەیان لەسەر هەڵئەگیرێ کاتێ وایە بۆ شتێ بێ پەیوەندی بە مافـەکانی خـواوە هەبێ بەڵام مافەکانی ئادەمیزادیان لەسەر هەڵناگیرێ. یانێ ئەو جەردانە با پەشیمان ببنـەوە ئەگەر دارایی دانیشتوانیان بردبێ ئەبێ یا ئەو دارایە یا نرخەکەی بدەنەوە بە خاوەنـەکانیان، ئەگەر کەسێکیان کوشتبێ خاوەنی کوژراوەکە ئەتوانێ بیان کوژێ یان خوێنیان لێ بسـێنێ یا لێیان ببورێ.

بەڕاستی ئەو ئایەتە دەربارەی جەردەو ڕێگەگرانی موسڵمانان هاتوەتە خـوارەوە. بـەڵام بت پەرستان و بێ باوەڕانی تر ئەگـەر باوەڕیـان هێنـا سـزای خـواو ئادەمیزادیـان لەسـەر هەڵئەگیرێ لە پێش یا لە پاش دەست بەسەرا گرتنیانبێ.

﴿ فَاعْلَمُوا أَنَّ اللهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ وە دوایی ئێوە بزانن بە ڕاستی خوا لێ بوردنی زۆرە بۆ گوناهباران ئەگەر پەشیمان ببنەوە، میهرەبانی زۆرە بۆ پەشیمان بونەوەکان.

بۆ زانین: ئەو یاسا بەرێزانەی باسکران گەورەترین سـزایە لای ئیسـلام بـۆ گـەورەترین تـاوان بـە شـێوەیەکی دادپەروەرانـە بـەکاردێن لەسـەرتاوانباران پـاش ڕوون بونـەوەی تاوانەکانیان جگەی موسڵمانان ئەو یاسایانە بەکارنایـەرن بـۆ نـەمانی ئـەو تاوانانـە. بـەڵام ئەوروپاییەکان و کاربەدەستانی بە ناو موسڵمان کە شاگردی دڵسـۆزی ئـەوانن ئەوپـەڕی سزاو دارو فەلاقـە بـەکار ئـەهێنن دەبـارەی بـێ تاوانـان هـەر لەبـەر ڕامیـاری خۆیـان و چاوچنۆکیـان. کارەبـا و بزمـارو شوشـە بڕینـە ئـەندامیان و بەسـتنەوەیان بـە پانکـەوە بەکارئەهێنن. هەروەها ژەهری کیمیایی و گـازی خـەردەل و فسـفۆڕ بەفڕۆکـە ئـەڕێژن بەسەر دانیشتواندا کە هیچ تاوانێکیان نەکردووە جگە لەوەی لە نەژادو ڕوەگـەزی ئـەوان

نین. بە هەزاران منالّ و ژن و پیر پارچە پارچە ئەکەن، بە دەیان کەسیان کوێرو کەڕو شەل ئەکەن هەر لەبەر ئەوەی دژی کاری خراپ و ستەم کردنی ئەوانن.

کاتێ خوای مەزن لەمەوبەر باسی کوشتن و ڕێگەگرتنی بۆ کردین، دوای ئەوەیش فەرمانمان پێ ئەداو ئامۆژگاریمان ئەکا لە خوابترسین و خۆمان بکەین بە فیداکار بۆ بەرزی یاسای ئیسلام و سەپاندنی بەسەر دانیشتواناو ئەفەرموێ:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ وَجَٰهِدُواْ فِي سَبِيلِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٣٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡ أَنَّ لَهُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا وَمِثۡلَهُۥ مَعَهُۥ لِيَفۡتَدُواْ بِهِۦ مِنۡ عَذَابِ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنۡهُمۡۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٣٦﴾ يُرِيدُونَ أَن يَخۡرُجُواْ مِنَ ٱلنَّارِ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنۡهَاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّقِيمٞ ﴿٣٧﴾

﴿ يا أَيها الذيْنَ آمَنُوا أَتَقُوا اللہ و أبتغوا إِلَيْهِ الْوَسِيلَة ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە ئێوە لە سزای خوا بترسن و خۆتا لەبێ فەرمانی خوا بپارێزن و، ئێوە داوای نزیک بوونەوە بۆلای خوا بکەن بە کردنی پەرستنێ پەرستنەکانی خوا، بەواز هێنان لەبێ فەرمانی خوا، وەسیلەو تەوسول بە مانایەکن. یانێ پەلاماردان بۆلای خوا بە ئاواتی گەیشتن بە شتێ ، مانای ڕاستی وەسیلەو تەوسول پەلاماردانە بۆلای خوا بەهۆی چاو دێری کردنی کارە

بەرێزەکانی یاساو دەستور. تەوەسول بۆلای جگەی ئەوانەو دزینەو دانانی شتێکە لە جگەی شوێنی خۆیدا .

﴿ وَجاهِدُ في سَبيلِهِ ﴾ وەئێوە خۆتان ماندوو بکەن و کۆشش بکەن لە ڕێگـەی ئـایینی خوادا بە جەنگ کردن لـەگەڵ دوژمنانی ئاشکراو نهێنی ئایین، لـەبێ باوەڕان و لــە نیـازی دڵتان بۆ کردنی خراپەو گوناهو دڵپیسی.

﴿ لَعَلَكُمْ تُفْلَحُونَ ﴾ بۆ ئەوەی ئێوە ڕزگارتان بێ لـە خەشم و سزای خــواو بگــەن بـە بەختیاری و چونتان بۆ بەهەشتی بەرین و نەبڕاوە.

بەڕاستی ترسان لە خوا، داواکردنی شتێ ببێتە هۆی نزیکبوونەوە لە خوا، کۆشش لــە ڕێگەی خوادا، هەموویان بۆیەك مەبەستن، یـا بـۆ چـەند مانایـەکن لـەیـەك جـوێ نابنـەوە، چونکە ترسان لە خوا خۆپاراستنە لـە خـەشمی خـوا، داواکردنـی نزیکبوونـەوە لـە خـوا داواکردنی ڕەزایێتی خوایە، کۆشش لە ڕێگەی خوادا هەردوولایان دەگرێتەوە، گەورەترین شتێ مرۆڤ خۆی پێ نزیك بخاتەوە لەخوا خۆشەویستیە بۆ ئادەمیزاد و کارکردنـە بۆیـان، ناگونجێ مرۆڤ خوای خۆش بوێ بەبێ خۆشەویستی ئادەمیزاد، بە نزیـك بوونـەوە لـەخوا هەموو چاکەیە دەستی ئادەمیزاد دەکەوێ.

بەڵام دواکردنی کەسانی نەزان و نەفام و نەخوێنەواران، نزیکبوونەوەو پەنا بردن بۆلای گۆڕی دۆستانی خواو پیاوچاکان، بڕوا بوون بەوەی ئەو پەنا بردنە ئەبێتە هـۆی جێبـەجێ کردنی مەبەست و نیاز، یا ئەو پیاو چاکانە داوا بکەن لـە خوا نیازەکـەیان بێتـەدی، خـۆی بۆخۆی ڕاستەوخۆ داوا لـە خوا نەکا، ئەوانە هەموویان دژی یاسای ئایینی ئیسلامن، چونکە خوای مەزن ئەفەرموێ: بەڕاستی ئەو کەسانە ئێوە پـەنا ئەبـەن بۆلایـان و داوای جێبـەجێ کردنی مەبەستیان لێ ئەکەن وێنەی ئێوەن، ئیتر بۆخۆتان پەیوەندی بە خواوە نەکەن؟

دوای ئەو فەرماندانە بەرێزانەی پێشوو لەلایەن خوای مەزنــەوە، خـوا هەڕەشـە لـەبێ باوەڕان ئەکا زۆر بە توندی، هەموو ڕێگەیەکییان لێ ئەگرێ و ئەفەرموێ:

﴿ إنَ الذيْنَ كَفرُوا لَوْ أنَ لَهُمْ مافي الأرْضِ جَمِيعاً ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە، ئەگەر بەڕاستی بۆ ئەوان هەبێ شتێ لە زەویدایە لە دارایی و پیت بە گشتی.

﴿ وَمِثلَهُ مَعَهُ ليفتدوا بِهِ مِنْ عَذابِ يَومِ القيامة ﴾ وەبۆ ئەوانیش هەبێ وێنەی ئەوەی لەزەویدایە لەگەڵیا بێ بۆ ئەوەی ئەوان بیکەن بەفیداکاری بۆ خۆیان ئەو شتە لەبەر ڕزگاربوونیان لەسزای ڕۆژی هەڵسانەوەیان لەگۆڕەکانیان.

﴿ ما تقبل مِنهم وَلَهُم عذابٌ أليمٌ ﴾ وەرناگیرێ ئەو شتە لەوان و ڕزگاریان نابێ لەسزای ڕۆژی دوایی ، و بۆ ئەو بێ باوەڕانە هەیە لەو ڕۆژەدا سزایێکی خاوەن ئازار و سوك ناکرێ بۆیان ، ئەو فەرمودەیە ڕاست و بێگومانە ، چونکە ئادەمیزاد هەموو دارایی خۆی ئەبەخشێ بۆ ئەوەی ڕزگاری ببێ لەنەخۆشی جیهان و ئازاری ئەمرۆ ، ئەبێ بۆ سزاو ئێشی ئاگری دۆزەخ چەندە ببەخشێ .

﴿ يريدون أن يخرجوا من النار وَما هُمْ بِخارجِينَ مِنها وَلَهُمْ عَذابٌ مقيمٌ ﴾ بێ باوەڕان ئەیانەوێ کە بێنە دەرەوە لەو ئاگرە و ، ئەوان نایەنە دەرەوە لەو ئاگرە و ئەو ئاواتەیان نایەتە دی و هەوڵی بێ هودە ئەدەن و ، بۆیان هەیە سزایەکی بەردەوام و نەبراوە .

بۆ زانین : تاوانێ تر هەیە سزای گوناهەکەی لەوانەیە شتێ کەمتر بێ لەسزای بێ باوەڕی وەك تاڵان کردنی دارایی و خواردەمەنی گەلان و ڕێگە گرتن لەهۆی ژیانی دانیشتوان کوشتنی بێ تاوان و ڕێگە گرتن لەسەربەستی و ئازاردانی گەلانی ژێردەستە ، ئەوانە لەدوای بێ باوەڕی خراپترین شتن .

خوای مەزن لەئایەتەکانی پێشوودا باسی دەست و پێ بڕینی ڕێگە گران و جەردەی بۆ کردین بەهۆی زەوت کردنی دارایی دانیشتوانەوە ، لەم ئایەتەی دواییدا باسی بڕینی دەستی ڕاستی ئەو کەسانەمان بۆ ئەکا دارایی دانیشتوان ئەدزن بەنهێنی:

وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٣٨﴾ فَمَن تَابَ مِنۢ بَعْدِ ظُلْمِهِۦ وَأَصْلَحَ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ عَلَيْهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٩﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤٠﴾

﴿ وَالسارقُ والسارقَةُ فَاقْطَعُوا أيْدِيَهُما جَزاءً بِما كَسَبا ﴾ وە پیاوێ دزی کردوەو ژنێ دزی کردوە دووایی ئێوە دەستەکانیان ببڕن لەبەر تۆڵەکردنەوە لەوان بەهۆی شتێ ئەوان کردویانە چونکە نرخ و ڕێزی دارایی‌جگەی خۆیانیان ڕوشاندووە.

﴿ نَكالاً مِنَ اللهِ وَاللهُ عَزيزٌ حَكيمٌ ﴾ لەبەر سزادانیان لە جیهاندا لەلایەن خواوە بۆیان دانراوە، خوا بە دەسەلاتە فەرمانی بەرگری ناکرێ، هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ بە تایبەتی فەرماندان بە بڕینی دەستی کەسانێ دزی ئەکەن.

بۆ بڕینی دەستی دز ئەم مەرجانەی دوایی پێویستە ڕەچاو بکرێن:

١- پێویستە دزراوەکە لە جێگەی شیاوی خۆیا دانرابێ، هەموو شتێ جێگەیەکی تایبەتی خۆی هەیە بۆ پاراستنی و دانانی، دزەکەیش شتێ لەو جێگەیە بهێنێتە دەرەوە. بۆ نموونە: ئەگەر ماشینێ لە گەراجێکی داخراوا بدزرێ سنوری دانراوی خوا بەسەر دزەکەیدا جێبەجێ ئەکرێ، دوایش پێویستە ئەو ماشێنە کە بدرێتەوە بە خاوەنەکەی ئەگەر لەسەر جادەیە یا گەراجێکی دانەخراوا ئەو ماشێنە دزرا دەستی دزەکەی نابڕێ و

دادوەر بەشتێ تر تەمێی ئەو دزە بکا بە لێدان یا بەندکردن، پێویستە ماشێنەکەیش بدرێتەوە بە خاوەنەکەی.

٢- زانایان جگە لە ئەبو حەنیفە پێك هاتوون لەسەر ئەوەی کاتێك دەستی ئەبڕێ دزراوەکە لە چواریەکی دیناریێ کەمتر نەبێ. ئەبو حەنیفە لای وایە لە دیناریێ کەمتر نەبێ.

٣- پێویستە ئەو دزە منالّ و شێت نەبێ، ئەگەر منالّ یان شێت بێ دەستی نابڕێ.

٤- زانایان پێك هاتوون لەسەر ئەوەی باوك و دایك بە دزینی دارایی منالّی خۆیان دەستیان. نابڕێ، ژن و مێرد بە دزینی دارایی یەکتری دەستیان نابڕێ. کفن دز دەستی ئەبڕێ.

٥- پێویستە دزی کردنەکە لە سالّانی گرانیدا نەبێ، یانێ ئەگەر کەسێکی برسی بەناچاری دزی کرد بە ئەندازەی پێویستی خۆی دەستی نابڕێ.

٦- چۆنیەتی دەست بڕینی بەم جۆرە ئەبێ: یەکەمجار دەستی ڕاستی دز لە جومگەدا ئەبڕێ، دووهەمجار قاچی چەبی، سێهەمجار دەستی چەپی، چووارەمجار قاچی ڕاستی، دوواجار بەهەر جۆرێ بێ ئەبێ دادوەر تەمێی بکا.

﴿ فَمَنْ تابَ بَعْدَ ظُلْمِهِ وَأَصْلَحَ فَأَنَّ اللّٰهَ يَتُوبُ عَلَيْهِ إِنَّ اللّٰهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ دوای ئەو کەسەی دزی کردووە پەشیمان بویەوە دوای ستەمکردنەکە خۆی و دوای دزی کردنەکەی و، کردەوەکانی خۆی چاك کردو دزراوەکەی دایەوەو بڕیاری دا جارێ تر دزی نەکا، دوایی بەڕاستی خوا پەشیمان بونەوەی لێ وەرئەگرێ و لە ڕۆژی دواییدا سزای نادا. بەڕاستی خوا خۆش ئەبێ لەکەسێ پەشیمان ئەبێتەوە، میهرەبانە بۆ ئەو کەسە. بەلّام بەلای زوربەی زانایانەوە ئەبێ هەر دەستی ببڕێ. کاتێ خوای مەزن پێویستی کرد بڕینی دەستی دزو پەشیمان بونەوەی لێ وەرئەگرێ، دوایی ڕونی ئەکاتەوە کە خوا ئارەزووی هەرشتێ بکا ئەیکا، هەر شتێکی مەبەستبێ فەرمانی پێ ئەدا لە سزادان و لە لێ خۆشبوون، چونکە خوا خاوەنی هەموو شتێکە و ئەفەرموێ:

﴿ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَ اللهَ لَهُ مُلْكُ السَماواتِ وَالأَرْضِ يَعَذِبُ مَنْ يَشاءَ وَيَغْفِرِ لِمَنِ يَشاءُ وَاللهُ عَلَى كُلِ شَيءٍ قَدِيرٌ ﴾ ئایا تۆ نازانی بەڕاستی بۆ خوایە خاوەنێتی و پاشایەتی ئاسمانەکان و زەوی ، خوا سزای کەسێ ئەدا ئارەزووی بکاو، خۆش ئەبێ لەکەسێ ئارەزووی بکا و کەس ناتوانێ بەر هەڵستی بکاو، خوا دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکا هەیە.

ئەو ئایەتەی پێشوو هەرچەندە ڕوی پێ کراوە بۆلای پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بەلاّم هەموو کەسێ ئەگرێتەوە، نیشانیشمان ئەدا خوا هەموو بونەوەرانی دروست کردووە، هەرشتێ بکا بۆ سودی بەندەکانی خۆیەتی، لەبەر ئاسایشی ئادەمیزادە یاسای داناوەو هەموو سنورەکانی بۆ سودی ئەوان هاتۆتە خوارەوە کاتێ خوای مەزن ڕوونی کردەوە هەندێ لە دەستورو یاساکانی خۆی. بەبێ گومان ئاگای لە هەندێ کەس هەبوو پەلەیان ئەکرد بۆلای بێ باوەڕی، پێغەمەریش ﴿ ﷺ ﴾ خۆی ڕاگرتبوو لەسەریان و خەفەتی پێ ئەخوارد، بۆیە خوا فەرمانی پێدا خەفەت نەخوا بۆ ئەو شتانەو فەرموی:

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَـٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِأَفْوَٰهِهِمْ وَلَمْ تُؤْمِن قُلُوبُهُمْ ۛ وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ ۛ سَمَّـٰعُونَ لِلْكَذِبِ سَمَّـٰعُونَ لِقَوْمٍ ءَاخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ ۖ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ مِنۢ بَعْدِ مَوَاضِعِهِۦ ۖ يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَـٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمْ تُؤْتَوْهُ فَٱحْذَرُوا۟ ۚ وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتْنَتَهُۥ فَلَن تَمْلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا

أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَمْ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْۚ لَهُمْ فِي ٱلدُّنْيَا خِزْيٌۖ وَلَهُمْ فِي ٱلْأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٤١﴾ سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحْتِۚ فَإِن جَآءُوكَ فَٱحْكُم بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْۖ وَإِن تُعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيْـًٔاۖ وَإِنْ حَكَمْتَ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٤٢﴾ وَكَيْفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِندَهُمُ ٱلتَّوْرَىٰةُ فِيهَا حُكْمُ ٱللَّهِ ثُمَّ يَتَوَلَّوْنَ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَۚ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٣﴾

﴿ يا أيها الرَسُولَ لا يَحْزُنْكَ الذينَ يُسارِعُونَ في الْكُفرِ مِنَ الذينَ قالُوا أمنا بِأفواهِهِمْ ﴾ ئەی فروستادە تۆ خەفەتبار نەکەن کەسانێکی ئەوتۆ پەلە ئەکەن بۆلای بێ باوەڕی لەو کەسانەی ئەوتۆ ئەیان ووت: بەدەمیان: ئێمە باوەڕمان هێناوە.

﴿ وَلَمْ تُؤْمِنَ قُلُبُهُمْ ﴾ وەلەنهێنیدا دڵیان باوەڕی نەهێنابوو، مەبەست لەو کەسانە ئەو دوو ڕوانە بوون لەگەڵ بێ باوەڕاندا لە نهێنیدا دۆستایەتیان دەرئەبڕی بۆیان دوای ئەوەی خوای مەزن باسی ئەو دووڕوانەی کرد با سێ تاقمی لە جولەکەکان ئەکاو ئەفەرموێ:

﴿ وَمِنَ الذيـنَ هادُوا سَماعُونَ للكَذبِ ﴾ وەهەندێ لە کەسانێکی ئەوتۆ ئایینی جولەکەیان هەیە درۆ ئەبیستن لە مالومی جولەکەکان و بە ڕاستی ئەزانن، گفتوگۆی توش ئەبیسن بۆ ئەوەی بە درۆت بخەنەوە. ئەوە لەوەوە هاتوە جولەکەکانی بەنی قورەیزەی

دانیشتوانی مەدینە دوای ئەوەی گۆییان لە فەرمودەی پێغەمەر ئەگرت ئەچونە دەرەوە ئەیان ووت: فلاَن شتمان بیست لە پێغەمەر کەچی نەیشتان بیستبوو.

﴿ سَماعُونَ لقوم آخرين لم يأتوك ﴾ درۆ ئەبیستن لە کۆمەڵێ ترەوە نەهاتوون بۆلای تۆ لەبەر ئەوە رقیانە لە تۆو خۆیان بە گەورە دائەنێن و گفتوگۆی تۆ ئەبیسن و ئەیبنەوە بۆلای ئەو تاقمەی نەهاتوون بۆلای تۆ.

ئەو ئایەتە لەوەوە هاتوەتە خوارەوە بە رێکەوت کەسێ لە پیاوو ماقوڵانی جولەکەکانی دانیشتوی خەیبەر داوێن پیسی کرد لەگەڵ ژنێکی ماقوڵ لە جولەکەکان، تاقمێ لە جولەکەکان لایان گرانبو بەردەبارانیان بکەن، بۆ ئەو مەبەستە نوێنەری خۆیانیان نارد بۆ خزمەت پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ هەتا لەو بارەوە پرسیاری لێ بکەن، بە نوێنەرەکەیان ووت: ئەگەر بڕیاری جگەی بەردەباران داوەری بگرن، ئەگەربڕیاری بەردە بارانی دا وازی لێ بهێنن و بە گوێی مەکەن. چوونە خزمەت پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ فەرموی: ئەبێ بەردەباران بکرێن، جولەکەکان بڕیارەکەی پێغەمەریان وەرنەگرت. بە گومانی درۆی خۆیان ووتیان: تەورات فەرمانی نەداوە بە بەردەباران کردن.

هەندێ لە زاناکانی جولەکە کەوتنە گفتوگۆ لەگەڵ پێغەمەر مل کەچی خۆیانیان دەربڕی کە تەورات فەرمانی داوە بە بەردەباران. بەڵام جولەکەکان بۆ پیاو ماقوڵەکانیان دار لێدان بەکار ئەهێنن نەك بەردەباران. بە پێچەوانەوە بۆ هەژارەکان و لاوازەکان بەردەباران بەکار ئەهێنن، بۆ ڕون کردنەوەی ئەو مەبەستانە خوا ئەفەرموێ:

﴿ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ مِنْ بَعْدِ مَواضِعِهِ ﴾ فەرمودەکانی تەورات ئەگۆڕن لە دوای ئەوەی خوا دایناوبو لە جێکەگانی خۆیانا. ئەوە بوو بەردەبارانی داوێن پیسیان گۆڕی بە دار لێدان، ناونیشانی پێغەمەریان لە تەوراتا لابرد، لە جێگەی بەردەباراندا دار لێدانیان دانا بۆ پیاوو ژنانی داوێن پیس.

﴿ يَقُولُونَ إنَ أُوتِيتُمْ هـذا فَخـذُوه وَإنَ لَـمْ تُؤتَـوْهُ فَـأحْذَرُوا ﴾ ئەوان ئەڵێن : ئەگەر بەخشرا بە ئێوە ئەوەی ئێمە ئەمانەوێ یانێ موحەمەد ووتی: بەردەباران گۆڕڕاوە

بەدارلێدان، دوایی ئێوە فەرمانەکەی وەربگرن و کاری پێ بکەن و، ئەگەر نـەیدا بـە ئێـوە مەبەستی ئێمە ووتی: هەر ئەبێ بەردە باران بکرێ، دوایی ئێـوە خۆتـانی لێ بپـارێزن وەری مەگرن گفتوگۆی ئەو.

﴿ وَمَنْ يُرِدِ اللهُ فِتْنَتَهُ فَلَنْ تَمْلِكَ لَهُ مِنَ اللهِ شَيْئاً ﴾ وەهەرکەسێ خوا بیەوێ بـێ بـاوەڕو گومڕایی بکاو سزای بدا، دوای ئەوەی خوا ئەقڵی داوەتێ و ڕێگـەی چـاك و خراپـی بـۆ ڕون کردوەتەوەو. بەڵام ئەو کەسە خراپە بۆخۆی هەڵئەبژێرێ. دوایـی تـۆ خـاوەنی هیـچ شتێ نیت بۆ ئەو کەسە لەلای خوا، ناتوانی لەبێ باوەڕی و گومڕایی لای بدەی. گۆڕینـی فەرمودەکانی تەورات بە کوژانەوەی بێ،یا بەکاربێ نەکردنی بێ، یـا لـە جێگـەی ئـەوەی دایناوە ئەوان شتێ دانێن شیاوی هەوەسی خۆیانبێ گرنگ نیەو مەبەست ناگۆڕێ.

﴿ أُولَئِكَ الَّذِيْنَ لَمْ يُرِدِ اللهُ أَنْ يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْ ﴾ ئەو جولەکە و دووڕوانـەی کەسـانێکی ئەوتۆن خوا نایەوێ کەدڵـیان پاك بکاتەوە لە پیسی بێ باوەڕی، زۆریان لێ ناکـا ناچاریـان بکا بۆلای پاك کردنەوەی دڵی خۆیان، کاری خۆیان بە خۆیـان ئەسـپێرێ و ئـەقڵی پـێ بەخشیون و چاك و خراپی بۆ ڕون کردونەتەوەو خۆیان بێ باوەڕیان هەڵبژاردووە.

﴿ لَهُمْ فِي الدُّنْيا خِزْيٌ وَلَهُمْ فِي الأَخِرَةِ عَـذابٌ عَظِيـمٌ ﴾ بـۆ ئـەوان هەیـە لـە جیـهاندا ڕسوایی و سەرانە لێ سەندیان و ترسیان لە موسڵمانان و، بۆ ئەوان هەیە لە ڕۆژی دووایدا سزایکی گران.

﴿ سَمَّاعُونَ لِلْكِذْبِ أَكَّالُون لِلسُّحْتِ ﴾ درۆ ئەبیستن و وەری ئەگرن و درۆ بـە دەمـی تۆوە ئەکەن و فەرمانی تەورات ئەگۆڕن قەدەغە کراوەکان ئـەخۆن لـە سـوود خـواردن و بەرتیل وەرگرتن بە هۆی گۆڕانی فەرمودەکانی خوا ، جەنگ بـەرپا ئەکـەن هـەتا دەسـت بگرن بەسەر سامانی دانیشتوانا ، لـە سـوودو بـەرتیل خرابـتر ئەمەیە پـارە وەربگـرن لـە ڕژێمەکان و نیشتمانی خۆیان پێ کاول بکـەن و ڕێگـە نـەگرن لـەوەی نەتەوەکـەیان ژێـر دەستەبێ و مافی خۆی دەست بکەوێ.

خوای مەزن ڕو ئەکاتە پێغەمەرو هەموو موسڵمانانیش ئەگرێتەوە، پیشەی دادگاکانمان بۆ ڕون ئەکاتەوەو کار بەدەستان ئاگادار ئەکاو ئەفەرموێ:

﴿ فَإِنْ جاءوكَ فَاْحْكُمْ بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ وَإِنْ تَعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَنْ يَضُرُوكَ شَيْئاً ﴾ دوایی ئەگەر ئەوان هاتن بۆلای تۆو داوای فەرماندانیان لەتۆکرد، دوایی فەرمان بدە لە نێوانیانا ئەگەر ئارەزووی هەبوو، یا تۆ ڕویان لێ وەرگێڕەو فەرمانیان بۆ دەرمەکە ئەگەر ئارەزووت نەکرد فەرمانیان بۆ دەرکەی و، ئەگەر تۆ ڕویان لێ وەرگێڕی و فەرمانیان بۆ دەرنەکەی، دوایی ئەوان زیان لە تۆ نادەن هیچ شتێ، ئەگەر دوژمنایێتی تۆ بکەن خوا ئەتپارێزێ.

﴿ وَإِنْ حَكَمَتْ فَاْحْكُمْ ببينهم بِاْلْقِسطِ إِنَ اللهَ يُحِبُ اْلْمُقْسِطِيْنَ ﴾ وەئەگەر تۆ فەرمانت بۆ دەرکرن دوایی تۆ فەرمان دەربکە لەنێوانیانا بەدادپەروەرانە. بەڕاستی خوا خۆشی ئەوێ کەسانێ دادپەروەربن، بە تایبەتە لە فەرمان دەرکردندا، ئەوانە باسکران پیشەی دادوەری موسڵمانە. هەرکاتێ جگەی موسڵمانان پەنایان هێنا بەلای دادگاکانی ئیسلام .

زانایان پێك هاتوون لەسەر ئەوەی دووداواکار لە جگەی ئەو کەسانەی خاوەنی پاراستن نین لەلایەن موسڵمانانەوەو لەژێر فەرمانی ئیسلامدا نین هاتن بۆلای دادگای ئیسلام دادوەر بۆی هەیە فەرمان دەرکا بۆیان، بۆیشی هەیە وازیان لێ بهێنێ سودی موسڵمانان ڕەچاو بکا.

بەڵام زانایان بیریان جیاوازە لە بارەی خاوەن زیمیەکان، جگەی شیعەکان ئەڵێن: پێویستە دادوەر فەرمانیان بۆ دەربکا. ئەگەر موسڵمانێك و جگەی موسڵمان پەیوەندیان کرد بە دادگای ئیسلامەووە پێویستە لەسەر دادوەر داواکانیان وەربگرێ و کارەکانیان جێبەجێ بکا بە جۆرێکی دادپەروەری و بە گوێرەی یاسای ئیسلام. نەك بە یاسای ئەوان.

﴿ وَكَيْفَ يُحَكِمونَكَ وَعِنْدَهُمُ اْلتَوْراةُ فيها حُكْمُ اللهِ ﴾ وەچۆن ئەوان ئۆ ئەکەن بە فەرماندەر، تۆ ئەکەن بە دادوەری خۆیان و فەرمان لە تۆوە وەرئەگرن؟ و لای ئەوانە تەورات و و لە نبۆییدایە فەرمانی خوا کە ئەبێ داوێن پیس بەردەباران بکرێ.

﴿ ثُمَّ يَتَوَلَّوْنَ مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ ﴾ لە پاشا ئەوان پشت ئەکەنە فەرمانی تۆو لە دوای فەرماندانی تۆ کە وەك ئەو فەرمانەیە لە تەوراتایە. یانێ جولەکەکان داوای بڕیاری پێغەمەریان کرد دەربارەی سنوری داوێن پیسەکانی خۆیان، پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بڕیاری بۆ دەرکردن ئەبێ داوێن پیسەکان بەردەباران بکرێن، دوایی پشتیان کردە فەرمودەکەی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ کە بەڵێنیان دابوو فەرمودەی پێغەمەر وەربگرن، شایستە بۆ ئەوان ئەوەبوو مل کەچ بونایە بۆ بڕیاری پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ کەچی زۆر بە ڕاستی ئەیانزانی بڕیاری پێغەمەر وێنەی بڕیاری تەوراتە، بۆیە خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَمَا أُوْلَئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ ﴾ وەئەو جولەکانە باوەڕیان بە نامەکەی خۆیان نیەو باوەڕیشیان بەتۆ نیە. ناوەڕۆکی ئەو ئایەتە تەنها جولەکەکان ناگرێتەوە. بەڵکو هەر کەسێ بە بڕیاری یاسا، بڕوای نەبێ ووەری نەگرێ پەیوەندی بە باوەڕەوە نیە، ئیتر بە ناو موسڵمانبێ یا جولەکە کاتێ خوای مەزن ڕونی کردەوە کە جولەکەکان پشتیان کردبووە تەورات، دوایی باسی تەوارات و فەرمانی تەوراتمان بۆ ئەکاو ئەفەرموێ:

إِنَّآ أَنزَلۡنَا ٱلتَّوۡرَىٰةَ فِيهَا هُدٗى وَنُورٞۚ يَحۡكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسۡلَمُواْ لِلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ بِمَا ٱسۡتُحۡفِظُواْ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ عَلَيۡهِ شُهَدَآءَۚ فَلَا تَخۡشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخۡشَوۡنِ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗاۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾

﴿ إنا أنْزَلْنا الْتوراةَ فِيها هُدى وَنُورٌ ﴾ بەڕاستی ئێمە ڕەوانەمان کردوەتەوە تەورات و ناردومانە بۆ موسا لە نێو تەوراتا هەیە ڕانموییی کردن بۆلای ڕێگەی ڕاست و، لە نێویشیا هەیە ڕون کردنەوەی شتێ نازانرێ لە فەرمانەکانی خوا، بەردەمی ئادەمیزاد ڕون ئەکاتەوە. لە تاریکی بێ باوەڕی... هەموو نامەیەکە خوا ڕەوانەی بکا بۆ سەر پێغەمەرانی خۆی هەمویان ڕانموییی کەرو ڕوناك کەرەوەی ئادەمیزادن بۆ دۆزینەوەی ڕێگەی ڕاست. یەکێ لەو نامانە تەوراتە کەڕەوا نەکراوە بۆسەر موسا. بەڵام تەوراتی ئەمڕۆ هیچ جۆرە پەیوەندی بە خوای مەزنەوە نیە لە ڕانموییی کردن و ڕوناك کردنەوەو دادپەروەری، چونکە لەسەر جیاوازی ڕەگەزدا مەزراوە، جولەکەکان خۆیان بەگەلی هەڵبژاردەی خوا دائەنێن، بەڕەوای دائەنێن بۆ خۆیان داگیرکردنی گەلان و گوشتنی پیاوان و سەربڕینی منداڵان و ژنان و تاڵان کردنی سامانیان و داگیرکردنی نیشتمانیان. کار بەدەستانی ئەمڕۆ هیچیان لەوان کەمتر نیە لە ڕەگەز پەرستیدا.

﴿ يَحْكُمَ بِها الْنبِيُونَ الذيْنَ أسْلَمُوا للذيْنَ هادُوا ﴾ فەرمان ئەدەن بە هۆی ناوەڕۆکی تەوراتەوە پێغەمەرانێکی ئەوتۆ مل کەچی خوان بە نیازی پاکەوە بۆ کەسانێکی ئەوتۆ جولەکە بوون ئەو پێغەمەرانە بریتی بوون لە داوودو سولەیمان و زەکەریا و یەحیا شارەزایی جولەکەکانیان ئەکرد بۆلای فەرمانی تەورات و فەرمانی خوا. نەك بە ئارەزۆی خۆیان بە وێنەی جولەکەکانیان سەردەمی موحەمەد کە ئەیان ویست فەرمان بدا بە سنوری داوێن پیسی بە ئارەزووی ئەوان.

﴿ وَالرَبانِيُونَ وَالأَنْبارُ بِما أسْتُحْفِظُوا مِنْ كِتابِ اللهِ ﴾ وە فەرمان ئەدەن بە جولەکەکان ئەو کەسانەی پەروەردگار ڕازیە بە گفتوگۆو کرداریان و، زاناکانیشیان فەرمانیان پێ ئەدەن بەشتێ لایان دانراوە لە نامەی خوداو پاراستویانە لە دەست کاری کردن.

﴿ وَكانُوا عَلَيْهِ شُهَداءَ ﴾ وە پێغەمەرەکان و خواناسان و زانایان ئاگادار بوون لەسەر نامەی خواو چاودێریان ئەکرد نەگۆڕرێ و کاریان بەو نامەیە ئەکردو ئەیانزانی ڕاستەو فەرمودەی خوایە.

﴿ فَلا تخشوُا الناسَ وَاخشونِ ﴾ دوایی ئێوەی کـار بەدەسـت و دادوەر مەترسـن لـە ئادەمیزاد لـە فەرماندانتاناو نرمی بنوێنن لـە ترسی ستەمکاران و فەرمانەکانی خوا بگۆڕن و، هەر لـە من بترسن، باسی ناونیشانی موحەمەد ڕوون بکەنەە بۆدانیشتوان.

ئەو ئایەتە هەرچەندە ڕوی پێ کراوە بۆلای کاربەدەسـتان و دادوەرانـی جولـەکـەکان. بەلاّم هەموو ئادەمیزاد ئەگرێتەوە.

﴿ وَلا تشترُوا بأیاتنا ثمناً قلیلاً ﴾ وەئێوە مەگۆڕنـەوە بـەو فەرمانـەی مـن ناردوومەتـە خوارەوە بە نرخێکی کەم بە وەرگرتنی بەرتیل و دارایی بێ نرخ و بە پلەو پایەی بڕاوە.

هەرکەسێ زانابێ بە فەرمانی خوابێ فەرمانی خواناکا لـەبەر دوو شتت نەبێ، ڕستەی.

﴿فَلا تَخْشَوُا الناسَ ﴾ ئاماژە ئەکا بۆ یەکەمیان کە پلەو پایەیـە. ڕسـتەی (وَلا تَشْـتَرُوا) ئاماژە ئەکا بۆ دووهەمیان کە سامان و داراییە.

ناوەڕۆکی ئەو ئایەتە هەرچەندە دەربارەی زانایانی جولـەکـەکان هاتوەتـە خـوارەوە کـە سنوری داوێن پیسیان لـە بەردەبارانەوە ئەگۆڕا بۆلای دارلێـدان. بـەلاّم جگـەی ئـەوانیش ئەگرێتەوە کە هەولّی ئەوە بدەن فەرمودوەکانی خوا بگۆڕن لـەبەر پارەو پول .

﴿ وَمَنَ لَمْ یَحْکِمُ بِما أنْزَلَ اللهُ فَأوّلَئِكَ هُـمُ الْکـافِرُونَ ﴾ وەهـەر کەسـێ فـەرمان نـەدا بەشتێ خوا نادویەتیە خوارەوە، جولـەکـەکان و وێنـەکانیان بـە پێچەوانـەی فـەرمانی خـوا هەلّئەسن و گالّتەی پێ ئەکەن، دوایی ئەو کەسانە بەو جۆر بـن و گالّتـە بـە فەرمانـەکانی خوا بکەن هەر ئەوانەن بێ باوەڕن و لــە خـوا یـاخی بـوون بـە جگـەی فـەرمودەی خـوا هەلّساون.

دوایی خوای مەزن ڕون ئەکاتەوە فەرمانەکانی تەورات لە بارەی تۆلّـە سـەندن لـە بـۆ کوشتن و بریندار کردنی ئەندامانی ئادەمیزادو لـەناو بردنیان هەر یەکـەیان بـە وێنـەی ئـەو ئەندامەو ئەفەرموێ:

وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ ۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾ وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٦﴾ وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ ٱلْإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾

﴿ وَكَتَبْنا عَلَيْهِمْ أنَ النَفْسَ بِالْنَفْسِ ﴾ وەئێمە پێویستمان کردووە لەسەر بەنو ئیسرائیلی لە تەوراتا بەڕاستی کەسێ ئەکوژرێتە بە کوشتنی کەسێ تر. یانێ ئەگەر کەسێ بە ناڕەوا کەسێ بکوژێ پێویستە بکوژرێتەوە هەر خۆی. نەك وەك جولەکەاکان کە بە کوشتنی تاکە کەسێ دووکەس بکوژن.

﴿ وَالْعَيْنُ بِالْعَيْنِ وَالأنْفُ بالأنْفِ وَالأذُنَ بِالأُذُن وَالْسِنَ بالسِنِ ﴾ وەچاوێك لە جیاتی چاوێ، وەلووت بە لوت، و گوێچکە بە گوێکەوە ددان بە ددان تۆڵەیان ئەکرێتە بە وێنەی ئەو زیانەی توشی ئەو ئەندامانە بووە بەبێ کەمو زۆر.

﴿ وَالْجُرُحَ قِصاصٌ ﴾ وەبەڕاستی برینەکانی خاوەنی تۆڵە کردنەوەن بە وێنە ئـەو برینـە توشی بریندارەکە بووە تۆڵە لـە تاوانبار ئەکرێتەوە لـە ئەندامەکەی، بە گوێرەی توانا هـەوڵ بدرێ زۆرتر نەبێ. ئەوەی لـە تەوراتایەو وێنەی فەرمانی قورئانە بەبێ جیاوازی.

یاسای ئیسلام بۆ دیاری کردنی چۆنیەتی کوشتنەوەو وەرگرتنی تۆڵـەی هەریەکـە لـەو ئەندامانە لـە نامەی یاسادا بە درێژی باسیان کراوە، بۆیە ئێمە لێرەدا باسیان ناکەین چونکـە باسەکانیان زۆر درێژە.

﴿ فَمَنْ تَصَدَقَ بِهِ فَهُوَ كَفارَةٌ لَهُ ﴾ دوای کەسێ ببورێ بـە ئـارەزوی خـۆی لـە مـافی خۆی و تاوانبار ئازاد بکا دوایی ئەو لێ بورد نەشۆردنەوەیە بۆ گوناهی ئەو کەسە لە ڕۆژی دوایدا.

﴿ وَمَنْ لَمْ يَحْكَمْ بِما أَنْزَلَ اللهُ فأُولئِكَ هُمْ الظالِمُونْ ﴾ وەهەرکەسێ فەرمان نەدا بەشتێ خوا ناردویەتە خوارەوە بەو جـۆرەی باسـکرا دوای ئـەو کەسـانە سـتەمیان کـردووە لـە خۆیان، چونکە بە فەرمانی خوا هەڵنەساون، ئارەزووی خۆیانیان داناوە لـە جێگەی فەرمانی خوا.

جولەکەکان و هاو وێنەکانیان بە دژی فەرمانی خوا هەڵئەسان و لـە جیاتی یـەك کـەس دوو کەسیان ئەکوشت.

کاتێ خوای مەزن باسـی جولـەکـەکانی کـرد، لــە دوایـدا بایسـی گاورەکـان ئـەکاو ئەفەرموێ:

﴿ وَقَفَيْنا عَلَى آثارهِمْ بِعِيسى آبْنَ مَرْيَمْ مَصَدِقاَ لِمـا بَيْـنَ يَدَيْـهِ مِـنَ الْتَـوراة ﴾ وە ئێمـە هێنامان لەسەرڕێبازو شوێنەواری ئەو پێغەمەرانە عیسای کوڕی مریەم، دوای ئەوان عیسای کوڕی مەریەمان کرد بە پێغەمرو ڕەوانەمان کرد بۆلای بەنو ئیسرائیلی بەڕاسـت ئـەگیرێ شتێ نزیکە لـە عیساوە، لـە تەورات و باوەڕی بە هەموو ئـەو شـتانە هەیـە لـە تـەوراتان . گێڕراوەتەوە لـە عیساوە لـە ئینجیلدا کە من نەهاتووم دەستوری تەورات تێك بـدەم بـەڵام

هاتووم بۆ ئەوەی دەستوری تەورات تەواو بکەم. بەڵام زیاد ئەکەم لەسەر تەوارات هەندێ لە فەرمانی خواو ئامۆژگاری.

﴿ وَآتَيْناهُ الأنْجِيلَ فِيهِ هُدى وَنُورٌ ﴾ وە ئێمە بەخشیومانە بە عیسا بۆ ئەوەی ئەو یاساو فەرمان و ئامۆژگاریانەی لە توراتان ڕونیان بکاتەوە، لە ئینجیلدا هەیە ڕانموویی کردن بۆلای ڕێگەی ڕاست و تەنیای خوا، ئینجیل ڕوناك کەرەوەی ئادەمیزادە وەلە تاریکی و بێ باوەڕی لایان ئەدا.

﴿ مَصَدِقاً لِما بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْتوراهْ ﴾ ئینجیل بەڕاست ئەگێڕێ ئەو شتەی نزیکە لە ئینجیلەوە، وەك تەورات لە بنچینەکانی ئایین، فەرمان ئەدا بە دادپەروەری و چاکەکردن، کوشتن و تالآن بەرەوا دانانێ.

﴿ وَهُدى وَمَوْعِظَةً للمُتَقِينْ ﴾ وە ئینجیل ڕانموویی کەرەو ئامۆژگاری کەرە بۆ کەسانێ لە خوا ئەترسن خۆیان ئەپارێزن لەبێ فەرمانی خودا، هەروەك ڕاست گێڕێ فەرمانەکانی تەوراتە.

﴿ وَلَيَحْكُمْ أهْلَ أنْجِيلَ بِما أنْزَلَ اللهُ فِيهِ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِما أنْزَلَ اللهُ فَأوّلئِكَ هُمْ الفاسِقونْ ﴾ وەبا فەرمان بدەن خاوەنی ئینجیل لە زاناکانیان بەشتێ خوا ناردویەتە خوارەوە لەودا، وەهەرکەسێ فەرمان نەدا بەشتێ خوا ناردبێتە خوارەوە دوایی ئەوانە لە یاسای ئینجیل دەرچوون.

بۆ زانین: ووشەی (الکافرون، الظالمون، الفاسقون) هەرسییانیان ماناکانیان یەك دەگرێتەوەو بۆ بێ باوەڕان بەکاردێن، هەندێ لە زانایان لایان وایە یەکەمیان بە کاردێت بۆ ئەو کەسانە باوەڕیان بە هەموو بنچینەکانی ئاین یان هەندێکیان نەبێ.

ووشەی دووهەم و سێهەم بەکاردێن بۆ ئەو کەسانە باوەڕیان بە بنچینەکانی ئایین هەبێت بەڵام سستی ئەکەن و تەمەڵن و لە بەجێ هێنانی پەرستنەکانی خودا.

کاتی خوای مەزن ڕونی کردەوە پێغەمەرایەتی موسا و عیسا، لە دوای ئەوان پێغەمەرایەتی موحەمەدیشمان بۆ ڕون ئەکاتەوەو ئەیکا بە بەڵگە بۆ بۆڕدانی خاوەن نامەکان. دەری ئەخا ڕێگەی هەرسێ لایان یەکسانن بۆ پەك خستنی بێ باوەڕان، دەستوری موحەمەد کۆتایی هاوەری هەموو دەستورەکانی پێغەمەرەکانی ترە، ئایینی موحەمەد ئاینی هەموو ئادەمیزادە هەتا ڕۆژی دوایی، دەستورێکە پێویستی ژیانی ئەوان لە چوارچێوەی ئەو دەستورەدا دەسوڕێتەوە، پەیڕەوێکی کۆمەڵایەتی‌یە بۆ ئەوان هاتۆتە خوارەوەو بۆ ئەوی بخوێنرێتەوەو بناسرێ و ببێتە هۆی ڕۆشنبیری لە نامە نووسینی پەرتوکەکانیاندا، یاسای ئیسلام بۆ ئەوە هاتۆتەوە خوارەوە پەیڕەوی بکرێ و واز لە گوناە بهێنرێ، بە مانای ووشەکانی کار بکەن لە ژیانی ڕۆژانەدا لە هەموو ڕۆژێکا، بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو مەبەستانە خوا دەفەرموێ:

وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ عَمَّا جَاءَكَ مِنَ الْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ ۖ فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ ۚ إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا

ءَاتَىٰكُمْ ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٤٨﴾ وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ وَٱحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَنۢ بَعْضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ﴿٤٩﴾ أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٥٠﴾

﴿ وَأنْزَلْنا إلَيْكَ الْكِتابَ بالْحَقِ مُصَدِّقاً لِما بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتابْ ﴾ وە ئێمە ناردوومانەتە خوارەوە ئەو نامەیە کە قورئانە بە ڕاستی و بەڕاست گێڕە بۆشتێ نزیکە لەو قورئانەوە لە هەموو نامەکانی خوا، وەك تەورات و ئینجیل و نامەکانی تری خوا.

﴿ وَمُهِمناً عَلَيْهِ ﴾ وەئەو قورئانە شایەتی ئەدا لەسەر ڕاستی نامە پێشوەکان و پاسەوانیانەو ئەیان پارێزێ، هەر شتێ لەواندا دەست کاری کرابێ ئەو قورئانە ڕاستی ئەکاتەوە، ناوەڕۆکە پوختەو ڕاستەکانیان جێ گیر ئەکا، ئەو شتانە خراونەتە ناویان و فەرموودەی خوا نیە فڕەی ئەدا.

﴿ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِما أنْزَلَ اللهُ ﴾ دوایی تۆ فەرمان بدە لە نێوان خاوەن نامەکان بە شتێ خوا ڕەوانەی کردوە دژی ئەوە بووەستە لە جیاتی کوشتنی پیاوێك دوو پیاو بکوژن، لە جیاتی بەردەباران داربدەن لە داوێن پیسان.

﴿ وَلا تَتبِعْ أهْواءَهُمْ عَما جاءَكَ مِنَ الْحَقِ ﴾ وە تۆ دووای هەوەس و ئاەزوی نارەوای ئەوان مەکەوە لا نەدەی لە شتێ هاتووە بۆلای تۆ لە یاسای ڕاستی خوا.

زۆر ڕوون و بێگومانە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بە جگەی ڕاستی فەرمان ناداو نەرمیش بەکار نایەنێ بەرامبەر بە ڕاستی بۆ هیچ کەسێ نە بەکەم و نــە بــە زۆر، ناگونجــێ دوای ئــارەزوی هیــچ کەسێ بکەوێ، ترازوی کردەوەی پێغەمەرو فەرمودەکانی قورئانی پیرۆزە، جگە لـە ڕاسـتی و دادپەروەری هیچ شتێکی تری لێ ناوەشێتەوە. بە ڕێکەوت ئەگەر بــێ بـاوەڕێکی فێڵبـاز هەوڵی ئەوە بدا کە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بخەڵەتێنێ بە زمانی لوس و پــاراو درۆی خـۆی بکـا، بەڕواڵەت پێغەمەر گوێ لێ بگرێ خوای گەورە بە میهرەبانی خۆی چاودێری ئەکا بەر لـــە ڕوداوەکە بەرپا بێ و فەرمان بدا بەو شتە نارەوایەو ئاگاداری ئەکا لە ئـەنجامی ئـەو فێڵــەو ڕێگەی ڕاستی نیشان ئەدا.

﴿ لكلٍ جَعَلْنا لَكُمْ شَرِعَةً وَمِنْهاجاً ﴾ بۆ هەموو تاقمێ لە ئادەمیزاد بە تایبەتی موسڵمان و جولەکەو گاور ئێمە دامان ناوە بۆ ئێوەی ئــادەمیزاد دەســتوور ســەرچاوەیەك بۆئـەوەی بەپێ ی ئەو دەستورە هەڵسن و کاری پێ بکەن و ئاوی بــێ گــەردی لێ هــەڵگۆزن، هــەر لەبەر پەرستنی خواو ویستی خواو پاداشتی خوا، بۆیشمان داناون پڕۆگرام و پەیڕەوێ کــە پێویستە هەموو یەکێ لە تاقمەکانی ئادەمیزاد هەریەکەیان بە پەیڕەوی دیاری کراوی خۆیان هەڵسن، یانی ئەو یاساو پڕۆگرامانەی خوا بۆ گەل لە هەموو کاتێکدا وەك یەك نین، یاسای خوا بۆ گەلانی تری جگەی موسڵمان بۆ کاتێکی دیاری کراوبووە هەر لە ئادەمــەوە هــەتا ناردنی عیسا.

بەڵام یاسای قورئان هەتا هەتایە هەر بەردەوامەو هەموو یاساکانی کۆکردۆتەوە شــیاوی هەموو کات و جێگەیەکە، بێگومان هەموو ئاینەکان بنچینەو پایەکانی ئایندەیەکن و گۆڕان بەســەریاندا نایــەو بەردەوامــە، ئــەو کەســانە لــە یاســا کۆڵاونەتــەوە بــەبێ لایــەنی بۆیــان دەرکەوتووە کە ئاینی ئیسلام لەسەر بنچینەیەکی نە لەخەشاو ڕاوەستاوەو بە گۆڕانی کات و شوێن ناگۆڕێ و بۆیشیان دەرئەکەوێ شایستەی ڕێزی ئادەمیزادە.

﴿ وَلَوْ شاءَ اللهُ لَجَعَلَكُمْ أمَةً واحِدَةً ﴾ وەئەگەر خوا ئارەزوی بکردایە ئێوەی ئەگێڕا بەیەك نەتەوەو لەسەر یەك ئایین ئەبوون لەهەموو کاتەکاندا بەبێ گۆڕان، هەموو پێغەمەرەکان یەك نامەیان ئەبوو لەو ڕستەوە ئەمەمان بۆ ڕون ئەبێتەوە خوای مەزن ئادەمیزادی جوێ کردوەتەوە لە بونەوەرانی تر ئامادەیی پێ بەخشیبوون بۆ زانین و نەزانین، بۆ پێش کەوتن و دوواکەوتن. بۆ کردنی کاری چاك و خراپ، لە دواییدا فەرمانی پێداون بە کردنی ئەو شتانەی چاکن و خاوەنی سودن، قەدەغەی کردوون لەوان ئەو شتانەی خاوەنی زیانن، لە ئەنجامی ئەو ئامادەبونەیان و فەرمان پێدانەیان و قەدەغە کردنەیان، جیاوازیان لەبەکارهێناون خستنە جوڵەیان ئامادەیان بۆ پەیدا بووە بە جیاوازی لە پەرستنی خواو نە پەرستنی خوا.

ئەگەرخوا بیویستایە ئەو ڕێزو ئامادەییان بۆ هەموو کارێ پێ نەئەبەخشین و وێنەی ئاژەڵ ئەبوون و چاکەو خراپەیان نەئەزانی، سەرکەوتن و ژێرکەوتنیان لا یەکسان ئەبووە. بەڵام خوا ئەو ڕێزو ئامادەییەی بەخشی بە ئادەمیزاد، فەرمانی بە هەندێ شت پێدان و قەدەغەی هەندێ تری لێ کراون.

﴿ وَلكِنَ لِيَبْلُوَكُمْ في ما آتاكُمْ ﴾ وەبەڵام خوا ویستی ئێوە تاقی بکاتەوە لەو شتەی بەخشینی بە ئێوە لە دەستورە جیاوازەکاندا ئایا ئێوە کاریان پێ ئەکەن یان کاریان پێ ئەکەن . وێنەی کەورەییە بەندەی خۆی تاقی بکاتەوە. ئەگینا خوای مەزن شاراوەو ئاشکرای دڵی هەموو کەس نەزانی. بەر لە کردنیان بۆ شتێ بیکەن لای ڕونەو چ شتێ بکەن. بەڵام پاداشتی چاکەو خراپەی هیچ کەسێ ناداتەوە مەگەر لە دوای ترساندیان و بیانو بڕییان.

﴿ فَأسْتَبِقُوا الْخَيْراتِ إلى اللهِ مَرْجِعَكُمْ جَمِيعاً ﴾ دوای ئێوە پێش برکێ بکەن و پەلە بکەن بۆلای ئەو چاکانەی خوا فەرمانی پێداون بەر لەوەی لە دەستان دەربچێ و بمرن بۆلای خوایە گەڕانەوەی ئێوە هەمووتان بێ باوەڕو باوەڕدارتان و چارەنوستان.

یانێ کاتێ خوای مەزن بەخشی بە ئێوە ڕێزو ئامادەیی و یاسای شایستەی بۆ دانان، بۆ ئەوەی دەربکەوێ لەوانەوە ئەو کارانەی شایانی پاداشت و سزان، دوایی ئێوە پەلە بکەن لە دەستورەکانی خوادا، هەر کەسێ جییاوازی یاسای خوا بکا بە بیانو بۆ کینەو ڕق لە ڕواڵەتا، جیاوازی ڕەگەزو ئایین بەکاربهێنێ و لە یاسای دیاری کراو دەربچێ خوا هەڕەشەی لێ ئەکاو ئەفەرموێ:

﴿ فَيُنَبِّئُكُمْ بِما كُنْتُمْ فِيهِ تَخْتَفِلُونَ ﴾ دوای خوا هەواڵ ئەدا بە ئێوە بە شتی ئێوە ناکۆکی و جیاوازیتان هەیە لەو شتەدا لە کاری هەردوو جیهان، ئەو کاتە ئاگادارتان ئەکات بەو پاداشتە زۆرەی خوا ئەیبەخشێ بە پیاو چاکان کامیان کارگوزاربوون و کامیان تەمەڵ بوون، سزای ئێوە ئەدا بەهۆی ئەو کارە خراپانە کردوتانە.

﴿ وَإِنِ أَحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِما أَنْزَلَ اللهُ ﴾ وەئێمە ناردومانە بۆلای تۆ لەو نامەیەدا کە تۆ فەرمان بدەی لە نێوان خاوەن نامەکاندا بەشتێ خوا ناردویەتی.

زانایان ئەگێڕنەوە: زاناکانی جولەکەکان ووتویانە با ئێمە بچین بۆلای موحەمەد بەڵکو بیخەینە گومانەوە لە ئاینەکەیدا چوونە لای ووتیان : ئێمە زاناکانی جولەکەین ئەگەر ئێمە دوای تۆ بکەوین هەموو جولەکەکان پەیڕەوی تۆ ئەکەن ئێمە ئاژاوەیەکمان لەگەڵ خزمانی خۆماندا لێ پەیدا بووە، هاتووین بۆلای تۆ کە تۆ فەرمان بدەی بۆ سودی ئێمەو زیانی ئەوان، پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ وەڵامی نەدانەوە خوا فەرموی:

﴿ وَلا تَتَبِعَ أَهْواءَهُمْ وأَحْذَرَهُمْ أَنْ يَفْتِنُوكَ عَنْ بَعْضِ ما أَنْزَلَ اللهُ إِلَيْكَ ﴾ وەتۆ پەیڕەوی ئارەزوی ئەوان مەکەو فەرمان بدە بەو شتەی من بۆم ناردوویتە خوارەوە بۆلای تۆو، تۆ بترسە لەوان کە تۆ لابدەن لە هەندی ئەو شتەی کە من نارومەتە خوارەوە بۆلای تۆ.

﴿ فَإِنْ تَوَلُّوا فَأَعْلَمْ أَنَما يُرِيدُ اللهُ أَنْ يُصِيبَهُمْ بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ ﴾ دوای ئەگەر پشت بکەنە ئەو شتەی من ناردومەتە خوارەوەو کاری پێ نەکەن، دوای تۆ بزانە بە ڕاستی خوا ئەیەوێ کە ئەوان توش بکاو سزایان بداو تۆڵەیان لێ بسێنێ بەهۆی هەندێ لە کوناهەکانیان لەم

ڕۆژەدا بە کوشتن و دەبەدەرکردن لە نیشتمانی خۆیان و سەرانە لێ سەندنیان، بەهۆی پاشماوەی کوناهەکانی تریانەوە خوا لە پاشە ڕۆژدا توشی سزای گەورەتریان ئەکا.

ئەو ئایەتە هەرچەندە هاتوەخوارەوە دەربارەی خاوەن نامەکان. بەلاّم هەموو کەس ئەگریتەوە کە واز لە فەرمان و یاسای خوا بهێنێ، جەنگی هەشت ساڵەی نێوان عێراق و ئێرانەوە جگەی ئەوان گەورەترین بەلّگەن بۆ ئەو مەبەستە.

خوای مەزن گەلانی پێشووی لەناوبرد هەندێکیا لەبەر یاری کردن بە ترازوبازی، هەندێ تریان بەهۆی نێربازی و داوێن پیسی. بەلاّم گەلانی ئەم سەردەمە ئەوانەو بە دەیان گوناهی تریان هەیەو خۆیانیشی پێوە هەلّئەکێشن، خوایە میهرەبانیت زۆرە.

﴿ وَإنْ كَثِيراً مِنَ الناسِ لَفاسِقُونَ ﴾ وەبەڕاستی زۆر لە ئادەمیزاد لە سنوری یاسای خوا دەرچوون، بە تایەبەتی جولەکەکان. بە داخەوە دانیشتوانی ئەم سەردەمەیش وازیان لە هەندێ لە فەرمودەکانی خوای مەزن هێناوە، هەندێکیشیان بە گوێرەی هەوەسی خۆیان مانای قورئانی پیرۆز ئەکەن.

﴿ أَفَحَكْمَ الْجاهِلِيةِ يَبْغُونَ ﴾ ئایا ئەو جولەکانە داوای فەرماندان و کردەوەی سەردەمی نەزانین و نەفامی بەر لە هاتنی ئایینی ئیسلام ئەکەن، بەهۆی دەستکاری کاردنی نامەکانی خواو کار پێ نەکردنی، بەرتیل و سوو خواردن و تالاّن کردن و کوشتنی دانیشتوان و ستەم کردن و خواردنەوەی مەیی و کردنی قومارو داوێن پیسیان ئەوێ.

بۆ زانین: هەر فەرمانی دژی یاسای خوابێ بەکاتی سەردەمی نەفامی دائەنرێ، ئیتر لەهەر سەردەمێکابێ، ئادەمیزاد لەهەرجێگەیەبن و لەهەرکاتێکا بن بە فەرمانی خوا هەلّسان موسلّمان و خوا پەرستن، بە پێچەوانەوە دواکەوتوو نەفامن.

﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ مَنَ اللهِ حُكْماً لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ وەچ کەسێکە چاکتربێ لە خوا لەلایەن فەرمان دانەوە بۆ تاقمێ بڕوایان هەبێ، چونکە هەر ئەوانن بیر ئەکەنەوە لە هەموو کارێ و ئەزانن چاکتر لە فەرمانی خوا دەست ناکەوێ و یاساکانی شیرینترین یاسان. بێگومان هەر فەرمانێ سوودی ئادەمیزادی تێدابێ هەر فەرمانی خوایە.

عوبادەی کوڕی سامیت هاتە خزمەت پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ووتی: من وازم لــە دۆستایەتی جولەکەکان هێناوە، عەبدولای کوڕی ئوبەی ووتی: بەڵام وازم لە دۆستایەتی جولەکەکان نایەرم، چونکە ئەترسم ڕۆژ بچەرخێ و ئەوان دەستەڵات پەیدا بکەن، بۆ دیاری کردنی ئەو مەبەستە خوا ئەفەرموێ:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٌ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِىَ بِٱلْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِۦ فَيُصْبِحُوا۟ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ نَٰدِمِينَ ﴿٥٢﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ إِنَّهُمْ لَمَعَكُمْ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فَأَصْبَحُوا۟ خَٰسِرِينَ ﴿٥٣﴾

﴿ يا أَيها الذينَ أَمَنُوا لا تَتَخِذُوا الْيَهُودَ وَالْنصارى أوْلياءَ ﴾ ئــەی کەسانی ئــەوتۆ ئێــوە باوەڕتان هێناوە ئێوە جولەکەو گاورەکان وەرمەگرن بە دۆستی خۆتان و خۆشتان نەوێن.

ئیسلام باوەشی کردۆتەوە بۆ هەموو خاوەن ئاینــێ و ڕەگــەزو نەتــەوەکانی تــر زۆر بــە دادوەری. بەلای ئیسلامەوە جیاوازی نیە لە نێوان ڕەش و سپیدا، لەنێو عەرەب و جگــەی عەرەب، لــەنێو موسـڵمان و جگــە موسـڵمان، هــەموویان یەکسـانن لەبــەردەم دادگــاو دادپەروەریدا، ئادەمزاد هەرچۆنێ بن مافی ئەوەیان هەیە کــە بەسەربەستی ئاسایش و بــێ

ترس لە خۆیان و لە داراییان، هیچ دەسەلاتێ نابێ نارەوایی خۆی بکێشێ بەسەریانا، بەو مەرجەی ئازاری کەس نەدەن، ئەگەر ستەمیان کرد لە کەسێ بە گوێرەی یاسا سنوری بەسەردا ئەسەپێ ئەگەر موسڵمانان ئازاریان گەیاند بە جگەی خۆیان لەبێ باوەڕان پێویستە لەسەر موسڵمانان بێزیان لێ بکەنەوەو خۆمانیان لێ دوربخەینەوەو دژی کردەوەیان بین، ئەگەر خاوەن نامەکان ئازاری خۆیانیاندا پێویستە دادگا یاریدەی نەهێشتنی ئاژاوەکەیان بدا. ئەگەر ئازاری خۆیانیان لە موسڵمانان قەدەغە کرد ئەبێ دەستی چاکەو چاکەکردن لەگەڵیان بۆ درێژ بکەن، ئیتر با باوەڕیشیان بە پێغەمەر نەبێ لەو کاتەدا ئیسلام هانمان ئەداو فەرمان ئەدا بە موسڵمانان بۆ چاکەو چاکەکردن لەگەڵ هەموو نەتەوەیەو هەموو خاوەن نامەکان بەمەرجێ دوژمنایەتی دەرنەخەن و جەنگ بەرپا نەکەن لە دژیان و پیلانیان بۆ ساز نەکەن. بەڵام ئەگەر وەك باسمان کرد ئاشتی خواز بوون لەگەڵ موسلاماندا پێویستە موسڵمانانیش لەگەڵیان بێ باوەڕان بە خۆشی و بەبێ‌وەی لەگەڵیان هەڵسن، بگرە ئەبێ دادپەروەریشبن لەگەڵیان بەو مەرجەی ئازاری کەس نەدەن چونکە ئادەمیزاد بە گشتی لە ئادەمن و هەموویان یەك نەتەوەن و یەك خێزانن، وەك یەك پەیوەندیان بە خواوە هەیە، خۆشەویسترین ئادەمیزاد لای خوا ئەو خێزانەیە سودیان بۆ ئادەمیزاد هەبێ باوەڕداربن یا بێ باوەڕ. کەواتە هۆی چاکەکردن لەگەڵ باوەڕان ئەوەیە ئازاریان بۆ کەس نەبێ بۆ دانیشتوان، ئیتر زیانی بێ باوەڕی هەربۆخۆیانە بە تەنها. بەو بۆنەوە ئەبێ بزانین کینەو ڕقی موسڵمانان لەبێ باوەڕان بە تایبەتی لە خاوەن نامەکان هەر لەبەر ئەوەیە بێ باوەڕان جەنگ لەگەڵ موسڵمانان ئەکەن لە نیشتمانی خۆیان و ژن و مناڵیان دەربەدەر ئەکەن. بە تایبەتی ڕقی موسڵمانان لە ئەمەریکاو ڕژێمەکانی ترلەبەر ئەوەیە یاریدەی دوژمنانی موسڵمانان ئەدەن بە تایبەتی جولەکەکان و ئەو ڕژێمانەی کەمە نەتەوەییەکان ئەچەوسێننەوەو مافیان زەوت ئەکەن و دەربەدەریان ئەکەن لە نیشتمانی خۆیان، کوردەکان ڕقیان لە بەریتانیاو ڕیژێمەکانی ترە لەبەر ئەوەی پارچە پارچەیان کردوون و

یارمەتی تورکەکان و فارسەکان و عەرەبەکان ئەدەن بۆ کوشتن و ئاوارەکردنیان کاول کردنی شارو دێهاتەکانیان و زیندە بەچاڵ کردنیان هەر لەبەر ئەوەی خوا بە کورد دروستی کردوون.

﴿ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ﴾ هەندێ لە خاوەن نامەکان دۆستی هەندێکیانن بۆ سودو بەرژەوەندی خۆیان لە دژی موسڵمانان و جگەی موسڵمانان.

زانایان لایان وایە هەندێ لە خاوەن نامەکان یارمەتی هەندێ تریان ئەدەن. نەك هەموویان یارمەتی یەكتری ئەدەن و دۆستی یەکترین، چونکە جولەکەکان و گاورەکان دوژمنایەتیان لەگەڵ یەکتری زۆرە لە دوژمنایێتی کردنیان بۆ موسڵمانان. بۆ نموونە: جولەکەکان ئەڵێن: عیسامان کوشتووەو مەریەمیش داوێن پیسی کردووە، موسڵمانان ئەڵێن: عیسا نەکوژراوەو مریەمیش داوێن پاك و خاوێنە.

بێگومان ئەو زانایانە مانای قورئانیان کردووە بەڕاستی مانای ئەو ڕستەیان کردووە بە گوێرەی ئەو کاتەی ژیاون تیا، لە کاتێکا بۆ دەزگای هاوبەشی زێڕی ڕەشی جیهاندا لە ئارادانەبووە، دەزگای بەسەراگرتنی سامانی گەلان و چارەنوسیان لە ناودا نەبوە... بەڵام کە ئەوانە پەیدا بوون تەماشا ئەکەن جولەکەکان چاکترین هۆن کە پشتیان پێ بەستن بۆ دانانی دەست بەسەراگرتنی سامانی گەلان، هەر لەبەر ئەوەیشە ڕژێمی جولەکەیان دروست کردووە دڵسۆزانە پاڵپشتی ئەکەنو بە هێزی ئەکەن، نەخشەی دوژمنایێتی پەرەسەندنیان بۆ ئەکێشن و بەڵێنیان پێداون لەکاتی کۆبونەوەی نەتەوە یەك گرتوەکان و ئەنجومەنی بەناو ئاسایش. جولەکەکانیش بە توندی دەستیان گرتووە بەکلکیانەوەو لە بازنەی ئەواندا ئەسوڕێنەوە. لەبەر مانەوەی خۆیان نەخشەی داگیرکردنیان بۆ ئەسازێنن، داگیرکەرانیش فەرمانیان پێ ئەدەن دەست درێژیەکانیان بۆ جێبەجێ بکەن.

هەرکاتێ داگیرکەرەکان و خۆفرۆشانی تورك و عەرەبە بەعسیەکان پشت ببەستەن بە جولەکەکان و بۆ چەوساندنەوەی گەلان بە تایبەتی کوردیش پشت بە دەستەڵاتی خوای مەزن ئەبەستن.

﴿ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ ﴾ وەهەرکەسێ لە ئێوە دۆستایەتی ئەوان بکەن و بەسەرداری خۆتان و پشتیوانیان بکەن، دوایی بە ڕاستی ئەو کەسە لەوانە. ئەو ڕستەیە ئەو بەڕی هەڕەشەیە بۆ ئەو کەسانە دۆستایەتی گاورو جولەکەکان بکەن و یاریدەیان بدەن. ئەو ئایەتە بەڵگەی بەتینە لەسەر ئەوەی کە بە ڕاستی کاربەدەستە بەکرێ گیراوەکانی ئەم سەردەمە بەندەی ڕژێمە داگیرکەرەکانی ئەم سەردەمەن، چونکە پاسەوانی بەرژەوەندی ئەوانن و بە فەرمانی ئەوان هەڵئەسن مەگەر کەمێکیان نەبێ.

﴿ إنَّ اللهَ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمينَ ﴾ بەڕاستی خوا ڕانوێی تاقمی ستەمکاران ناکا کە بە هۆی دۆستایەتی ئەوانەوە دوژمنایێتی گەلانی خۆیان ئەکەن.

﴿ فَتَرى الذيْنَ في قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ يُسارِعُونَ فِيهِمْ ﴾ دوایی تۆ ئەبینی ئەو کەسانە لە دڵیاندایە نەخۆشی بێ باوەڕی و دووڕوی پەلە ئەکەن لە دۆستایەتی و یاریدانیان، چونکە خاوەنی سامانن.

﴿ يَقُولُونَ نَخْشى أنْ يصيبَنا دائِرَةٌ ﴾ ئەڵێن: ئێمە ئەترسین کە توشمان ببێ لە هاتوچۆی ڕۆژگاردا ڕوداویی ناهەموارو گێژ داویی گەردوون، وەك گرانی سەرکەوتنی گاورو جولەکەکان و بێ هێزی موسڵمانان، ئەگەر ئێمە هەولێ بۆخۆمان نەدەین توشی زیان ئەبین.

﴿ فَعَسَى اللهُ سَيَأتي بِالْفَتْحِ أوْ أمْرٍ مَنْ عِنْدِهِ ﴾ دوایی شایان و شایستە کەخوا بهێنێ سەرکەوتنی پێغەمەرو موسڵمانان، ئاینی ئیسلام سەر بکەوێ بەسەر هەموو ئاینەکانی تردا، یاخوا کارێ لەلایەن خۆیەوەو فەرمان بدرێ بە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بە دەرکردنیان لە نێو دورگەی عەرەب و کوشتن و ئابڕو بردنیان.

﴿ فَيَصْبِحُوا عَلَى ما أسَرُّوا في أنْفُسِهِمْ نادِمينَ ﴾ دووایی ئەگەڕێن ئەو دوو ڕووانە لەسەر شتێ پەنهانیانداوە لە دەرونیانەو ئەو کەسانە پەشیمان ببنەوە لەو کارانەی کردویانە لە دۆستایەتی خاوەن نامەکان و لە گومانی سەرکەوتنی موسڵمانان.

﴿ وَيَقُولُ الذيْنَ مَنُوا أهئولاءِ الذيْنَ أقْسَمُوا بِاللهِ جَهْدَ أيْمانِهِمْ إنَهُمْ لِمَعَكُمْ ﴾ وە ئـەڵێن کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە ئایا ئەو کەسانەی ئەوتۆن سوێندیان ئەخوارد بەسەختڕین سوێندەکانیان. بەڕاستی ئەوان لەگەڵ ئێوەن و دۆستی ئێوەن. ئێستا پەردەی ئەوان دڕاو درۆکانیان دەرکەوت و ئابڕویان چووە بەڕاستی موسڵمان دوای ئەوەی چۆنێتی دوو ڕوەکان دیاری کردنیان لەسەر ڕووپەت دەرکەوت بۆیان ووتیان:

﴿ حَبْطَتْ أعْمالُهُمْ فَأصْبَحُوا خاسِرِينَ ﴾ بەڕاستی پوچ بوویەوە کردەوەی دوو ڕووەکان کە لەلای ئێمە دەریان ئەخست لەنوێژ و ڕۆژوەکان، دوایی گەڕان بە زیانۆمەند لە دووا ڕۆژداو ئامادەکراوە بۆیان سزای خاوەن ئازار. بەسەرکەوتنی موسڵمانەکان دوو ڕوەکان خەفەت دای گرتن بە جۆرێ نەیان ئەتوانی بیشارنەوە و نیشانەی بەدەم چاویانا دەرئەکەوت.

خوای مەزن دوای قەدەغەی کرد لەسەر موسڵمانان دۆستایەتی دوژمنایێتی خۆیان پێمان فێرئەکا ئەو دۆستایەتیە لەوانەیە سەر بکێشێ بۆلای بێ باوەڕی و وەرگەڕان لە ئایینی ئیسلام بۆیە ئەفەرموێ:

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَائِمٍ ذَٰلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ 

﴿ يا أَيُها الذيْنَ أمَنُوا مَنْ يَرْتَدَ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە هەرکەسێ لە ئێوە وەرگەڕێ لە ئایینی خۆی. ئەو ئایەتە کارێکی پەك خەرو بەهەموو کەس نەکراوە، چونکە بەرلەوەی هەندێ کەس وەربگەڕێن لە ئایینی خوا هەواڵی پێداوە، هەر وایش بوو پاش ئەوەی پێغەمەر کۆچ بکا هەندێ کەس لە ئایین وەرگەڕان و هەندێکیان خۆیانیان کرد بە پێغەمەر، دوای کۆچی پێغەمەر عەرەبەکانی جگەی دانیشتوی مەکەو مەدینەو جگەی عەبدول قەیس لە نەجران وەرگەڕان لە ئایین و هەندێکیشیان زەکاتیان نەداو لایان پێویست نەبوو. بەناوبانگترین ئەو کەسانە وەرگەڕان لە ئایین ئەمانەن:

١- ئەسوەدی کوڕی کەعبی عەنەسی دانیشتوی یەمەن، داوای پێغەمەرایەتی کرد، زۆر کەس باوەڕیان پێ هێنا، بەر لە کۆچی دوای پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بەیەك ڕۆژ کوژرا.

٢- موسەیلەمە زۆر درۆزن کوڕی حەبیب، لە کاتی پێغەمبەردا ﴿ ﷺ ﴾ داوای پێغەمەرایەتی کرد لە کاتی ئەبو بەکردا بە دەستی وەحشی بکوژی همزەی مامی پێغەمەر کوژرا.

٣- سەجاعی کچی ئەلمونزیر، داوای پێغەمەرایەتی کرد، بە جۆرێکی یەکجار شورەییانە شووی کرد بە موسەیلەمە هەروەها تەلحەی کوڕی خویەلید داوای پێغەمەرایەتی کرد پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ خالیدی کوڕی وەلیدی نارد بۆ جەنگ کردنی لەگەڵی، هەڵهات بۆ شام، دوای موسڵمان بوو بەوە چەند کەسی تر لە ئایین وەرگەڕان لە نامە مێژووەیەکاندا باسیان کراوە.

﴿ فَسَوْفَ يَأْتي اللهُ بِقَومٍ يَحِبُهُمْ وَيُحِبُونَهُ ﴾ دوای بەم نزیکانە خوا کۆمەڵێ ئەهێنێ و ئەیانخاتە جێگەی ئەو کەسانە لە ئایین وەرئەگێڕن و خزمەتی ئایین ئەکەن و بەهۆی ئەوانەوە بەهێز ئەبێ، خوا ئەو تاقمەی خۆش ئەوێ و لەوان ڕازیەو ئەوانیش خوایان خۆش ئەوێ و لە خوا ڕازین.

زانایان لە ناوبردنی دیاری کردنی مەبەست لەو تاقمە بیریان جیاوازە، هەریەکەیان هەندێ تاقمێکیان لە هەندێ نەتەوە دەست نیشان کردووە، خوای گەورە باسی نەکردوون

و ناوی نەبردوون بەڵام بەو جۆرە باسیان ئەکا، هەر تاقمێ ئەمانـەی تیابێ مەبەست لـەو تاقمە ئەوانەن:

١- ﴿ يَحِبُهُمْ وَيُحِبُونَهُ ﴾ لەمەو بەرمانای کرا، خۆشەویستی خـوا بـۆ بـەندەی خـۆی ئەمەیە کە پلەی بەرز ئەکاتەوە لەمەودا، خۆشەویسـتی بـەندەکانی خـوا بـۆ خـوا، خـودا پەرستیان خۆش ئەوێ و، بێ باوەڕانیان خۆش ناوێ.

٢- ﴿ أذِلَةً عَلَى الْمُؤْمِنِيْنَ ﴾ نەرم و نیانن و میهرەبانن لەگەڵ بـاوەڕداران و ڕێزیـان لێ ئەکرن و زۆر ئاشکرایە ئەو ڕێز گرتنـە لـە بـاوڕەوە لـە دەرونـی پاکیانـەوە دەرئـەچێ و هەرلەبەر خوایە.

٣- ﴿ أعِزَةً عَلَى الْكافِرِيْنَ ﴾ توندو تیژو بێ میهرەبانن لەسـەر بـێ بـاوەڕان و خۆیـان بەبەرزتر دائەنێن لەوان هەر لەبەر ئەوەی بێ باوەڕن، ئەگینا ئەوان ئادەمیزادن و هـەموویان لە ئادەمن.

٤- ﴿ يَجاهِدُونَ في سَبيلَ اللهِ ﴾ جەنگ ئەکەن لەگەڵ بێ باوەڕان لە ڕێگـەی خـوداو خۆیان ماندو ئەکەن بۆ بەرگری کردن لە زیانی دانیشتوان و لەبەر بەرزی ئاڵای ئیسـلام، تاریکی و ناخۆشی لەسەر دانیشتوان و خۆیان لائەبەن بۆ پەرەسەندنی ئایین.

پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ دانیشتبوو لەگەڵ هەندێ لە هاوڕێکانی، تەماشـای لاوێکـی بـەهێزیان کرد وتیان: خۆزگایە ئەم لاوە جوانی خۆی و ئـەم هـێزەی لـە ڕێگـەی خـوادا دابنایـە، پێغەمەر فەرموی: ئەگەر ئـەو لاوە کۆشـش بکـا بۆخـۆی بـۆ ئـەوەی خـۆی لـە سـواڵ بگێرێتەوەو پێویستی بەکەس نەمێنێ ئەوەش لە ڕێگەی خودایە، ئەگەر خۆی ماندو بکـا بـۆ خزمە دایك و باوکی و منداڵەکانی ئەوەش ڕێگـەی خوایـە، ئەگـەر خـۆی مـاندو بکـا بـۆ خۆهەڵکێشان بە سامانی زۆرەوە ئەوانە ڕێگەی شەیتانن.

٥- ﴿ وَلا يَخافُونَ لَوْمَةَ لائِمٍ ﴾ وە ناترسن لە تانەی تانە گران لە کاتی دەرچونیان بـۆ جەنگ لە خزمەت پێغەمەردا، هیچ کارێ ناکـەن بـە بۆنـەی تانەگرانـەوە لـە دژی ئـایین. بەڵکو ئەیانەوێ کاری ڕاست سەربکەوێ، کاری پوچ نەمێنێ هەر لەبەر خوا بە تەنها.

بۆ زانین: باوەڕی ڕاستی دەرناکەوێ مەگەر لە کاتی تەنگ و چەڵەمەدا کە باوەڕی ڕاستیان پێ تاقی ئەکرێتەوە. ناوەڕۆکی ئەو ڕستەیە بنچینەی درۆشمی باوەڕدارانی پاکە. بەڵام ئەو کەسانەی لەتانەی ڕژێمەکانی سەرزەوی و لەبەر ترسی لەناوچوونی کورسیەکانیان بە فەرمانی خوا هەڵناسن، بەتایبەتی و پاشاو سەرۆکەکانی جێگەکانی زێڕی ڕەش لەبەر ڕژێمەکانی زاوێنی و ماسۆنی و ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتی وازیان لە ئایین و ناموس و پیتی هەرێمەکانی موسڵمانان هێناوەو ئەوانیش بەفیڕۆو بە خۆڕایی ئەیبەن و گاڵتەیشیان پێ ئەکەن هەر لەبەر مانەوەی کورسیەکانیان، لەبەر ڕەگەز پەرستی و داواکاری خاچ پەرستانی ئورو پادەستیان کردووە بە کوشتنی موسڵمانانی برای خۆیان، بە تایبەتی کوشتن و دەربەدەرکردنی دانیشتوانی لوبنان و کوردەکانی چوار پارچەکەی کوردستان. ئەیانەوێ ئێستا تۆڵەی خۆیان لە نەوەکانی سەلاحەدینی ئەیوبی و لە عەرەبەکان بکەنەوە.

﴿ ذٰلِكَ فَضْلُ اللهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللهُ واسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ ئەو پێنج شتانەی باسکران ئەو تاقمە هەیانە ڕێزگرتنێکی خوایە ئەیبەخشێ بەکەسێ ئارەزۆی هەبێ بە گوێرەی ویستی خۆی ئەیدا بەکەسی بیەوێ و، خوا گەورەیی فراوانەو میهرەبانی زۆرە بۆ بونەوەران، ئەزانێ بە هەموو شتێ و بە چ کەسێ شایستەی ڕێزو پاریدانە.

ئێمە هەست ئەکەین و ئەزانین کە بە ڕاستی خوا ئارەزوو ناکا ڕێزو میهرەبانی خۆی ببەخشێ مەگەر بەو کەسانە ئەڕۆن بە ڕێگەدا بە گوێرەی ئەو دەستورو هۆیانە کە خوا هەموو بونەوەرانی بەوانەوە ڕاوەستانووەو ئادەمیزادو بونەوەرانی تر هەموویان هاوبەشن لەواندا بەڵام ئادەمیزاد ئەبێ بەشتێ تر خۆیانیان بەو شتە لە جانەوەران پێ جوێ بکەنەوە، ئەگەر خۆیان لەوان جوێ نەکەنەوە ئەبێ ئادەمیزاد بەبێ دوو پێ بچن بەرێگەداو بەبێ دەست کار بکەن بەبێ چاوبینن، خۆڕون و ئاشکرا ئەوەش ناگونجێ. کەواتە پێویستە ئادەمیزاد بەو پێنج شتانەی باسکران خۆیان جوێ بکەنەوەلە بێ باوەڕان و لە ئاژەڵ.

تەفسیری زمناکۆیی

(فەیلەسوف نیتشە ئەڵێ: ڕەوشت نرخی بۆ دانانرێ، کەواتە سەربەستی و دادپەروەری و یەکسانی و ڕەوشتی تر هەموویان ووشەی ڕوتن و بێ مانان. مرۆڤانی لاوازو بێ دەستەڵات دروستیان کردوون بۆ ئەوەی بەرەنگاری ستەمکاران و بەهێزەکانیان پێ بکەن.

مارکس ئەڵێ: شۆڕش پەیداکردن پێچەوانەی بیروبۆچونی (نیشتەیە) کەواتە لای مارکس جیهان نەویستن و خۆڕاگرتن و نەرم و نیانی ووشەیەکن پیاوانی خاوەن پلەو پایەو ساماندار دروستیان کردوون بۆ ئەوەی دەستەڵاتی خۆیان بسەپێنن بەسەر هەژاراناو بیان چەوسێننەوە.

بیروباوەڕی زۆر جیاواز هەن بۆ دیاری کردنی ڕەوشت. ئیسلام بڕوای وایە کە بەڕاستی ماك و سەرچاوە ڕەوشت بریتیە لەبەرژەوەندی و سودی خودی مرۆڤ. بەڵام ئەوبەرژەوەندیە هەڵ بقوڵێ لە سروشتی ئادەمیزاد بەو جۆرەی کە ئادەمیزادە. نەك بەو جۆرەی بوچێنێ بێ لە چینەکان، بۆ تاقمێ بێ لە تاقمەکانی ئادەمیزاد، گومانی تێدانیە ئەو بەرژەوەندییە ڕێك بکەوێ لەگەڵ ڕێزی بەرزی ئادەمیزاد، هەر ئەوەیشە و بەس، هەر لەبەر ئەوەیشە ناوی ئەبرێ بە ڕەوشتی مرۆڤایەتی. نەك چینایەتی، بەو بۆنەوە ڕەوشت بوونی بەستراوە بە بوونی ئادەمیزادەوە، دەست بەسەراگرتنی هەموو کەسێ بەسەر ئەو ڕەوشتەداو بیەوێ لە ناوی بباولای وابێ کە هەرناوی ڕوتە، ئەو بیروبۆچونە لە ڕاستیەوە دوورە، بە گوێرەی هەوەسی ئەو کەسە ڕێگە و ڕچەی ڕەوشت ناگۆڕێ، ئەگەر ڕەوشت ماك و سەرچاوەی نەبێ دروست نیە بەشکردنی ئادەمیزاد بۆلای چاکەکەران و خراپەکەران، بۆلای دەروون پاکان و دووڕوان کە بە درۆ خۆیان بە چاکەکەر پیشان ئەدەن. لە مێژوی ئادەمیزاد نەبیستراوە تاقمێ بەکەسێ بڵێ: بڕۆچ شتێ ئەکەی بیکە و بەرپرسیارنیت بۆ کردنی هیچ شتێ لە چاك و لە خراپ و لە کوشتن و دزی و دژایەتی مرڤایەتی.

ئیسلام فەرمانی داوە بە ڕاست گۆیی جێبەجێ کردنی بەڵێن و بەلەخۆبردن و ڕێزگرتن و ئارام گرتن و لێ بوردن و هەروەها. بەڵام نابێ لە دەستوری ئیسلام دەرچن لە هیچ کاتێکا و سەر نەکێشێ بۆلای دژی مەبەست و ئاوات، پێویستە ڕاستگۆی لە سودو بەرژەوەندی ئادەمیزاد دەرنەچێ. ئەگەر زیانی لێ پەیدابوو وێنەی هەوڵدانە بە نهێنی

سەربازی و گەیاندنی بە دوژمن، یا دووبەرەکی پەیدا بکا لەو کاتەدا ڕاستی قەدەغەیە، درۆکردن قەدەغەیە لە جگەی جەنگ کردن لەگەڵ دوژمنانی ئایین و نیشتمان، درۆکردن پێویستە لەبەر ئاشتی کردنەوەی نێوان دووکەس و بۆ پاراستنی کەسێکی بێ تاوان لە ستەمکاران، بۆ ئەوانە نەبێ درۆکردن قەدەغەیە، بەخشینی دارایی لە ڕێگەی خوادا زۆرشیرنیە لە کاتی پێویستیدا، ئارام گرتن زۆر چاکە ئەگەر ستەم و ناچاری ڕونەدا، لێ بوردن زۆر شایستەیە ئەگەر نەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی تاوان و پەرەسەندنی لای نیشتە و مارکس ڕەوشتی بەرز هیچ سەرچاوەیکی جگە سوودی تایبەتی نیە.

بەو شتانەی باسکران بۆمان دەرکەوت کە بەڕاستی ڕەوشت لە ئیسلامدا بەراورد ئەکرێ بەوەی کەئادەمیزاد پەیدای ئەکەن لە ڕاکێشانی سوود بۆ دانیشتوان یا بۆ بەرگری کردن لە ئاژاوە کەواتە ڕەوشت بەر لە ئادەمزاد پەیدا بووە، ئادەمیزادیش لەبەر ڕەوشت دروست پەیداکردن پەیدا نەبووە، ڕەوشتی چاك و بەرز ئەوەیە لەچوارچێوەی سودی ئادەمیزاد دەرنەچێ و لەبەر بەرژەوەندی گشتی بێ، بەلای کەمەوە زیان بە خۆیان نەگەیەنێ.

کاتێ خوای مەزن باسی خۆی تەواو کرد لە بارەی وەرگەڕان و لە باسی یاری کردنی دوو ڕواندا، لەو فەرمودەوە دەردەکەوت دووڕوی لە پایەو پلەی بێ باوەڕاندا ئەژمێرێ، پاش ئەوانە باسی دووڕوی و نیازی پاکمان بۆ ئەکا، بۆمان ڕون ئەکاتەوە ئێمەی موسڵمان دۆستایێتی چ کەسێ بکەین و چ کەسێ بکەین بە گەورەو سەرداری خۆمان و ئەفەرموێ:

إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ ﴿٥٥﴾ وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٥٦﴾

﴿ إنما وَلِيَكُمُ وَاللهُ وَرَسُولَهُ وَالذيْنَ أمَنُوْا ﴾ بەڕاستی دۆست و سەرداری ئێوە خواو فروستادەی خواو کەسانێکی ئەوتۆن باوەڕیان هێناوە، ئێوە مەکەن بە دۆستی خۆتان جولەکەو گاورەکان، چونکە وەك باسکران ئەوان هەندێکیان دۆستی هەندێکیانن، دۆستی ئێوەیش هەر خواو فروستادەی خواو باوەڕدارانن، ئەو باوەڕدارانەش خاوەنی ئەم کردەوانەن:

١- ﴿ الذيْنَ يُقِيمونَ الصَلاة ﴾ کەسانێکی ئەوتۆن نوێژەکانیان ئەکەن بە تەواوی بەمەرج و پایەو کاتەکانیانەوە هەر لەبەر فەرماندانی خوا.

٢- ﴿ ويؤتون الزّكاة ﴾ وەزەکاتەکانیان ئەبەخشن بە هەژاران و ئەو مافەیان خوا پێویستی کردووە ئەیان دەنێ بە گوێرەی یاسای دیاری کراو هەر لەبەر خوا.

٣- ﴿ وَهُمْ راكِعُونَ ﴾ وەئەو کەسانە لەکاتی نوێژکردن و زەکاتدانیانا لە خوا ئەترسن و خۆیان بە بەندەی خوا ئەزانن و سەری بۆ دائەنەوێنن.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە زانایان بیریان جیاوازە، هەریەکەیان دژی یەکترین بیربۆچونیان لە چینایەتی پەرستنەوە نزیکە، بە تایبەتی شیعەکان زۆر پێیان لێ هەڵبڕیوە لەبێ لایەنی و دادپەروەریوە دورە. ئەو بیروبۆچونە لە تاقم پەرستی و بێ لایەنیوە دوربێ بەم جۆرەیە: هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە هەموو کەسێ ئەگرێتەوە خاوەنی ئەو سێ شتانەبێ، بۆ هۆیەکی تایبەتی نەهاتوەتەوە خوارەوە، نەبەستیراوە بە هیچ شتێك و بە هیچ کەسێکەوە. بە وێنەی عەبدوڵای کوڕی سەلام و عەلی کوڕی ئەبو تالیب.

﴿ وَمنْ يَتَوَلَ اللهَ وَرَسُولَهُ وَالذيْنَ أمَنُوْا فَإنَ ضِرْب اللهِ هُمُ الغالِبُونْ ﴾ وەهەرکەسێ خواو فروستادەی خواو کەسانێکی ئەوتۆ باەڕیان هێناوە بکا بە دۆست و سەرداری خۆی دوایی بەڕاستی تاقمێ خودا هەر ئەوان سەرئەکەون لە هەردوو جیهاندا، چونکە ئەوان فەرمان بەرداری خوان و خوای مەزن یاریدەیان ئەدا.

لە دوایدا خوای مەزن ئەو باسەی پێشوەمان بۆ ڕونتر ئەکاتەوەو ئەفەرموێ:

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَكُمْ هُزُوًا وَلَعِبًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَٱلْكُفَّارَ أَوْلِيَآءَ ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾ وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ٱتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ ﴿٥٨﴾ قُلْ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ هَلْ تَنقِمُونَ مِنَّآ إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلُ وَأَنَّ أَكْثَرَكُمْ فَـٰسِقُونَ ﴿٥٩﴾

﴿ يا أيها الذيْنَ أمَنُوْا لا تَتخِذُوا الذيْنَ أتَخِذوا دِنكُمْ هُزُوا وَلَعِباً مَنَ الذيْنَ أوُتُوا الْكِتابَ مِنْ قَبْلِكُمْ والْكُفارَ أوْلِياءَ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە: ئێوەکەسانێکی ئەوتۆ مەکەن بە دۆست و سەرداری خۆتان ئایینی ئێوە بەگاڵتەکردن و یاری کردن داناوە، لە کەسانێکی ئەوتۆ بەخشراوە بەوان نامەی خوا لە ئێوەو لە بێ باوەڕانی ترو مەیان کەن بە دۆستی خۆتان.

﴿ وَأتَقُوا اللهِ إنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ ﴾ وەئێوە لە خوا بترسن و واز لە بێ فەرمانی خوا بهێنن ئەگەر ئێوە باوەڕتان هێناوە، چونکە باوەڕهێنانی ڕاستی ئامانجەکەی ئەوەیە دوژمنانی خۆتان نەکەن بە دۆست بۆخۆتان، ئەو ئایەتە ئێمە فێری ئەبێن هەرکەسێ دۆستایەتی و برایەتی بکا لەگەڵ ئەو کەسانە گاڵتە بکەن بە ئائین دورترینی ئادەمیزادن لە ئاینەوە.

ئەو ئایەتەی پێشوو ئەو ئایەتەی لەمەوپاش دێت لەوەوە هاتوەتە خوارەوە جوەکان و بت پەرستان پێ ئەکەنین و گاڵتەیان پێ ئەکردن بە تایبەتی لە کاتی بانگدانا، وەك ئەفەرموێ:

﴿ وَإِذا نادَيْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ اتَّخَذُوا ها هُزُواً وَلَعِباً ﴾ وەهەرکاتێ ئێوە بانگتان بدایە بۆلای نوێژکردن جولەکەکان و بێ باوەڕان ئەو نوێژکردنەیان وەرئەگرت بە گاڵتەپێ کردن و یاری پێ کردن و پێ ئەکەنین... گاورەکان پەیڕەوانی خۆیانیان بانگ ئەکەن بۆلای نوێژکردنی خۆیان بەزەنگ لێدان، جولەکەکان بەفوکردنیان کەڵەشاخدا. موسڵمانان نوێژ کەرانی خۆیان بانگ بە دەنگی بانگ دەرێ بۆ ئەوەی وەڵامی خوا بدەنەوەو بڕۆن بۆلای پەرستنی خوای تاك و بێ هاوبەش، بۆلای کارێ ڕزگاریان بکا لە سزای ئەمڕۆو پاشە ڕۆژ.

ئەو کەسانە خاوەنی شەرم و ناموس و باوەڕبن نابێ هیچ ڕێزی بۆخۆیان دابنێن ئەگەر گاڵتە بکەن بەو کەسانە بە باوەڕەوە لەبەردەم خوادا ئەوەستن بۆ پەرستنی خوا، موسڵمانان چۆن ئەبێ دۆستایەتی یەکتری ئاشکرا نەکەن، و خۆیان نەبەستن بەیەکەوە لە دژی ئەو کەسانە گاڵتەیان پێ ئەکەن.

هەندێ لە خاوەن نامەکان و کەسانی ترەوە هەر لە سەردەمی پێغەمەرەوە ﴿ ﷺ ﴾هەتا ئێستایش پاش ماوەکانیان و بەکرێ گیراوەکانیان گاڵتە بە بانکدانی موسڵمانان ئەکەن. کەچی ئەوەی شایستەیە بۆ ئەوان ئەبوایە گاڵتەیان بەزەنگ و شاخی خۆیان بکردایە.

﴿ ذٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لا يَعْقِلُونَ ﴾ ئەو گاڵتەکردنو یاری کردنەیان بە بانگی نوێژی موسڵمانان بەو بۆنەوە بوە، ئەوانە تاقمێکن نەزان وە نەفامن و بێ عەقڵ، چونکە ئەگەر ئەقڵیان هەبوایە گاڵتەیان بە پەرستنی خوا نەئەکرد موسڵمانان بۆیان دەرکەوتووەو لایان ڕوونە بێ باوەڕاران ئاگاداری یاسای ئیسلامن و ئەزانن ڕاست و دروستە و ئەنجامی بەرەو چ جێگەیە ئەڕوا، لەبەر ئەو ئەنجامەی ئایینی ئیسلام ئەزانن ئیسلام شۆڕشێکە بۆنەهێشتنی ستەم کردن و چەوسانەوە، هەڵساوەو ڕاپەڕیوە بۆ بنەبڕکردنی هەژاری و دوواکەوتن، دژی بەشکردنی ئادەمیزادە بۆلای دووبەش : بەندەکاری و گەورەیی، گەورەکان بەندەکان بچەوسێننەوە، ئەمیش ئەزانن ئیسلام لای وایە. هیچ بوونەوەرێ خاوەنی ڕێزو

جیاوازی نیە بەسەر کەسێ تردا بە جگـەی خزمـەت کردنـی ئـادەمیزادو خۆشەویسـتی و سودی گشتی.. ئاینێ رێگەی گرتووە لـە چەوسـانەوەو خوێـن مژیـن، ئەوانەیـە خراپـەی موسڵمانان لای بێ باوەڕان. موسڵمانان لەشەوو ڕۆژێکا پێنج جار بانگ ئەدەن بـە گـوێ گرانی بێ باوەڕاندا کەخوا گەورەترە لە هەمو کەس، ووشەی گەورەیی خوایان لا گرانـە، هەر لەبەر ئەوەیشە جەنگ بەرپا ئەکەن لەگەڵ موسـمانان بـە هـەموو توانایانـەوەو گاڵتـە ئەکەن بەو بانگەو دادپەروەری. بانکدانی موسڵمانان بۆ نوێژکردن و پەرسـتن و یەکسـانی هەموو ئادەمیزاد. بە مانای ووشە جاڕی ئەوە ئەدا خوا لە هەموو کەس گەورەترە، خوا تاك و تەنهایە لە پەرستن و جگەی پەرستندا، دارایی و پلەو پایەو باوك و باپیرو پاشاو سـەرۆك و نیشتمان پێویستە نەنرێنە جێگەی خوا بە وێنەی ئەو بیان پەرستن، مل کەچی ئەبێ هـەربۆ خوابێ، ئادەمیزاد لە مانایە یەکسانن لە هەموو ڕویەکەوە، هیـچ کەسـێ لـە ڕوی زەویـدا بۆی نیە لەسەربەستی ئادەمیزاد کەم بکاتەوە،ئەوانەیش بەسن بۆ ئـەوە دوژمنـانی نالـەبارو چاوبرسی و ناقۆڵای ئیسلام بیان کەن بە ناوان بۆ موسڵمانان، دوژمنایەتی بـێ بـاوەڕان و خۆگێل کردنیان هەر لەبەر ئەوەیە گەورەی خـوا زۆر گرانـە لایـان، لـە خـوا ناترسـن و سەرۆکەکانیان خۆیانیان داناوە بە وێنەی خواو ئەیانەوێ دانیشتوان بترسێنن.

دوای ئەوەی خوای مەزن باسی ئەو بانگدانە ڕون کردەوە بـۆ موسـڵمانان، ڕوئەکاتـە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ کە لە ڕوی بێ باوەڕاندا ڕاوەستێ و پرسیار لە خاوەن نامەکان بکا بۆچی ڕقتان لە کۆمەڵی موسڵمانانە؟ بلێ بەوان: هەر لەبەر ئەوەی بڕوایان بـە خـواو نامـەکانی ئێوەو نامەکانی پێغەمەرە پێشوەکان هەیەو ئەفەرموێ بە پێغەمەر:

﴿ قُلْ يا أَهْلَ الْكِتابِ هَلْ تَنْقِمُونَ مِنا ﴾ تۆ بلێ: ئەی خـاوەن نامـەکان: ئایـا ئێـوە بـۆ ڕەخنەو تانە ئاراستەی ئێمە ئەکەن و ڕقتانە لـە ئێمـە و ئـەوبیروباوەڕەی هەیانـە کـە هیـچ خراپەی تێدا نیە؟.

﴿ إلاّ أنْ آمَنا بِاللهِ وَما أُنْزِلَ إلَيْنا وَما أُنْزِلَ مِنْ قَبْلُ ﴾ مەگەر ئەوەبێ ئێمە باوەڕمان هێناوە بەخوا بەشتێ نێردراوەتەوە خوارەوە بۆلای ئێمەو بەشتێ نێرراوەتە خوارەوە بۆلای پێغەمەرەکانی لەمەو بەرو وەك تەورات و ئینجیل و نامەکانی تر، ئەوانەیش ڕەخنەیان لێ ناگیرێ.

﴿ وَإنَّ أكْثَرَكُمْ فاسِقُونَ ﴾ وەبەڕاستی زۆرتر لە ئێوە لاتانداوەو دەرچوون لە سنوور و فەرمانی خوا، دوایی چ لایەك لە ئێمە و لە ئێوە ڕەخنەی لێ ئەگیرێ، بەڕاستی ڕەخنە لێ گیراو هەر ئەبێ ئێوەی ستەم کاربن.

بەڕاستی ڕژێمە داگیرکەرەکان و کاربەدەستانی ئەلقە لە گوێی ئەوان هیچ کەسیان لەڕوی زەویدا خۆش ناوێ لایان چاك نین مەگەر ئەو کەسانە چەوسانەوەی ئەوانی بۆ هەژاران لاڕەوابێ . بە تایبەتی پارتی فەرمان ڕەوای عێراق کوردە موسڵمانەکانیان بە ناوی ئەنفالەوە نزیکەی (٢٨٠) هەزار کەسیان زیندە بەچاڵ کردن، زۆر جێگەی داخە کار بەدەستانی عەرەب لە ئاستی ئەو کارەدا بێ دەنگبوون بگرە یارمەتی ئەو پارتەیامان ئەدا. لەهەموو شتێ سەیرتر ئەوەیە ئەڵێن ئەوانە لە ئایین دەرچوون.

دوای ئەو یاسایانەی پێشوو خوا فەرمان ئەدا بە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ڕوبکاتە جولەکەکان و بکەوێتە گفتوگۆ لەگەڵیان و بەو ئەفەرموێ:

قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِ ۚ مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ ٱلْقِرَدَةَ وَٱلْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٦٠﴾ وَإِذَا جَآءُوكُمْ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَقَد دَّخَلُوا۟ بِٱلْكُفْرِ وَهُمْ قَدْ خَرَجُوا۟ بِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا۟ يَكْتُمُونَ

ٱلسُّحۡتَۚ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٦٢﴾ لَوۡلَا يَنۡهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ عَن قَوۡلِهِمُ ٱلۡإِثۡمَ وَأَكۡلِهِمُ ٱلسُّحۡتَۚ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ﴿٦٣﴾

﴿ قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُمْ بِشَرٍ مِنْ ذَلِكَ مَثُوبَةً عِنْدَ اللهِ ﴾ تۆ بلێ: ئایا من هەواڵ بدەم بە خراپتر لەوە کە ئێوە ئەڵێن: ئێمە هیچ ئاینێکمان نەدیوە خوا بترێ لــە ئـایینی ئێـوەی موسـڵمان، خراپتر لەوەی ئێوە ئەڵێن لەلایەن پاداشتەوە لای خواو ئابڕۆتان بچـێ، ئـەو خرابـترە ئـەو کەسەیە:

﴿ مَنْ لَعَنَهُ اللهُ وَغَضِبَ عَلَيْـهِ وَجَعَـلَ مِنْـهُمْ الْقِـرْدَةَ وَالْخَنـازِيرَ ﴾ کەسێکە خـوادوری خستۆتەوە لە بەزەیی خۆی و خەشمی لێ گرتووە لەنێو جولەکەکاندا، وەگەڕانویێتی هـەندێ لەوان بە مەیمون و بەراز.

بۆ زانین: کردنیان بە مەیمون و بەراز : زانایان بیریان جیاوازە، هەندێکیان ئەڵێن: گەڕان بە مەیمون و بەراز بە لەش و قەوارەو شێوەو. هەندێ تریان ئـەڵێن: وەك مـەیمون لـەداوێن پیسی و خۆی ئاژەڵیدا، وەك بەرازیان لێ هات لە پیسی و پیس خۆری و هەموو شـتێکیان سواری خۆیانیان ئەکرد.وە خرابتر لەوە:

﴿ وَعَبَدَ الْطاغُوتِ ﴾ کەسێکە پەرستوێتی کەسێ پەیڕەوی شەیتانی کردوە لــە زانایـانی خۆیان و پەرستنی گوێرەکەو پەرستنی هەواو هەوەسی خۆی.

﴿ أوْلئِكَ شَرُّ مكاناً وَأضَلُّ عَنْ سَواءِ السَـبيْلِ ﴾ ئـەو دور خراوانـە لـە بـەزەیی خـواو ئەوانەی کراون بە مەیمون و بەرازو پەیڕەوانی شـەیتانیان پەرسـتووە خرابـترین کەسـن لـە بارەی جێگەوە، چونکە جێگەیان دۆزەخە لە ڕۆژی دوایدا، گومڕاترین کەسن لایانداوە لە نیازی ڕێگەیە بیان گەیەنێ بە بەهەشت، ڕێگەی ڕاستیان ون کردووە.

جولەکەکان لەسەر دووپەت یاریان ئەکرد لەگـەڵ پێغەمـەرو موسـڵماندا، خـوا لـەو بارەوە ئەفەرموێ:

﴿ وَإِذا جاؤُكُمْ قالُوا آمَنا وَقَدْ دَخَلُوا بِالْكُفْرِ وَهُمْ قَـدْ خَرَجُـوا بِـهِ ﴾ وەهـەرکاتێ ئـەو دووڕوانە ئەهاتن بۆلای ئێوە ئەیان ووت: ئێمە باوەڕمان هێنـاوە، بەڕاسـتی ئـەوان ئەچونـە لای ئێوە بەبێ باوەڕی و، ئەوان ئەچونە دەرەوەش بەبێ باوەڕیەوە. هەرشتێ شـتێ لای تـۆ ئەیان ووت هەمووی درۆ بوو، ئەوان قوتابی ڕاست بوونایە ئەبوایە بە باوەڕەوە بچونایەتـە دەرەوە لای پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ لە دوای ئەو شتانە بیستیان لـە پێغەمـەرو بینیـان لەبەڵگـە و نیشانەی ڕاست .

﴿ وَاللهُ أَعْلَمُ بِما كانوا يَكتمون ﴾ وەخوا زاناترە بەشتێ ئـەوان ئـەیان شاردەوە لـەبێ باوەڕیی لە دوو ڕوویی و کینە و ڕق لەموسوڵمانان ، ئەو سزایانە شایەنی ئەوانە .

﴿ وترى كثيراً مِنهم يُسارعون في الاثم والعدوان ﴾ وەتۆ زۆرتر لەو دووڕوانـە ئـەبینی پەلە و پێش برکێ ئەکەن بۆ کردنی گوناهو پەیدا کردنی دارایی بەڕێگەیەکی ناڕەوا و ، بۆ لای دەست درێژی کردن لەمافی دانیشتوان و دەرچوون لەسنوری خوا .

﴿ وأكلهم السّحت لبئس ما كـانوا يعملـون ﴾ وەپەلـە ئەکـەن بـۆلای خواردنـی ئـەو شتانەی قەدەغە کراون لەلایەن خواوە لەبەرتیل و مامەڵەکردن بەسـود ، هـەر لەبـەر ئـەو کردەوە خراپەیانەیە هەموو گەلانی تر بێز لەجولەکـەکان ئەکەنـەوە لـەکۆن و لـەتازەدا ، مەگەر ئەو کەسانە نەبێ بەکرێ گیراوی ئەوانن ، وەك زۆربـەی سـەرۆکەکانی عـەرەب و جگەی عەرەب بەڕاستی خراپ شتێکە ئەوان ئەیکەن لەو کارە خراپانە .

﴿ وَلَو لا يَنهاهُم الرّبانيون والأصبارُ عَنْ قَولِهِمْ الإثـم وَأَكلِهِم السّـحق لَبِئـسَ ماكـانوا يضيعون ﴾ بۆچی قەدەغە ناکەن پیاوخوا و زاناکانیان و نایـان گێڕنـەوە لـەگفتوگۆکردنی گوناهیان و لە خواردنی شتە قەدەغە کراوەکان ، بەڕاستی خراپ شتێکە ئەوان ئەیسـازێنن کە قەدەغە ناکەن لەوان ئەو شتانە .

ئەو ڕستەیە هەرچەندە بەگوێرەی ڕواڵەت لەگەڵ سەرۆك و پیاوانی خوا و زاناكانی جولەكەكانە ، بەڵام لەناوەڕۆكا ڕوی پێ كراوە بۆ لای هەموو سەرۆك و زاناكان لەڕوی زەویدا كەڕاستی بناسن و بێ دەنگ نەبن لەكاری خراپ ، هەركەسێ خوا بناسێ و بێ دەنگ بێ لەو ڕاستیەیە ئەبێتە جێگەی خەشمی خوا ، ئەگەر خۆیشی بێ بەتەنها پێویستە لەسەری پێ ناخۆشبوونی خۆی دەربڕێ بەهەر جۆرێ بۆی بلوێ ، ئەگەر ئەو كەسە بڕوای وابوو لەمردنی خۆی لەو ڕێگەیەدا ستەم كاران ووریا ئەكاتەوە لەخەوی بێ باوەڕی و ئەیان گێڕێتەوە لەخراپەكردن و ستەم پێویستە لەسەری خۆی دانێ پەلاماری چاكە بدا و پێ ناخۆشبوونی دەربڕێ بەئاشكرا . مێژوو ئەو كەسانە خۆیان داناوە بۆ نەهێشتنی ستەم و كاری ناڕەوا و بۆمانی دەرئەخاو ڕونی ئەكاتەوە یەكجار زۆر بوون .

جوولەكەكان لەژیانێكی زۆر خۆشدا بوون ، بەڵام كاتێ پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ هات و لەو یاخی بوون ، خوای مەزن ژیانی خۆشی لێ كەم كردنەوە ، بەو بۆنەوە جوولەكەكان ووتیان : خوا لەئاستی ئێمە دەستی بەستراوە ، بۆ ئەو مەبەستە خوای گەورە فەرمووی :

وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ ۚ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا۟ بِمَا قَالُوا۟ ۘ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُ ۚ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَـٰنًا وَكُفْرًا ۚ وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ كُلَّمَآ أَوْقَدُوا۟ نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا ٱللَّهُ ۚ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا ۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَكَفَّرْنَا عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأَدْخَلْنَـٰهُمْ جَنَّـٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٦٥﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقَامُوا۟

ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِم مِّن رَّبِّهِمۡ لَأَكَلُواْ مِن فَوۡقِهِمۡ وَمِن تَحۡتِ أَرۡجُلِهِمۚ مِّنۡهُمۡ أُمَّةٞ مُّقۡتَصِدَةٞۖ وَكَثِيرٞ مِّنۡهُمۡ سَآءَ مَا يَعۡمَلُونَ ﴿٦٦﴾

﴿ وَقالَتْ اليهو د يد الله مَغْلولة ﴾ وەجوولەکەکان ووتیان لەو کاتانەدا هەستیان کرد بەخەشمی خوا لەسەریان بەکەم کردنەوەی ڕۆزی قازانجیان : خوا تواناو دەستی بەستراوە لەڕژاندنی ڕۆزی و دارایی بەسەر ئێمەدا و ڕژدی بەکاردێنێ لەو بارەوە لەگەڵ ئێمە .

﴿ غلَتْ أيديهم وَلُعِنوا بما قالوا ﴾ یا خوا ببەسترێ دەستی ئەوان و گـۆج و شەل بێ لەئاستی کردنی چاکە لەڕێگەی خوادا و توشی نەفرین بن و ، یا خوا بێ بەشبن لەبەزەیی خوا بەهۆی ئەو شتەی ووتویانە بەرامبەر بەڕێزی خوا کە خوا دەستی بەستراوە .

﴿ بَلْ يداهُ منبوسطان فينفق كيف يشاء ﴾ بەڵکو هەردوو دەستی بێ وێنەی خوا و توانای خوا فراوان و کراوەیە ڕۆزی و دارایی ئەبەخشێ بەهەرچۆنێ ئارەزوی بکا ، ئەیشی گرێتەوە بە جۆرێ ئارەزوی بکا ، هەموو شتێ لەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ بەبەخشین و بەنەبەخشین .

بۆ زانین : ئەو شتانەی سوودی جوولەکەکانی تێدا بێ بەگوێرەی گومانی خۆیان دارایی و سامانی زۆرە بۆ بەدەست هێنانی دارایی و سامان هەموو شتێکی ناڕەوا و قەدەغە لای ئەوان پەسەندە ، دروشم و بیرو باوەڕی ئایینی جوولەکەکان و پەیڕەوی خاچپەرستانی ئەورووپای تازە لەم سەردەمەدا هەرشتێ ببێتە هۆی بڵاوکردنەوەی داوێن پیسی و کوشتنی موسوڵمانان بەعەرەب و کورد و جگەی ئەوانیش لایان ڕەوایە .

بۆ زانین : ووشەی (ید) هاتووە بەم مانایانە : بەمانا دەستی زیندەوەران . چاکە و نیعمەت ، توانا ، پاشایەتی و خاوەنێتی ، بەخشین و گرتنەوە ، جگەی مانای یەکەم بۆ خوا بەکاردێن .

﴿ وَلَيَزِيدَنَّ كثيراً مِنهم ما أنزِلَ إِلَيكَ مِنْ رَّبِكَ طغياناً وكفراً ﴾ وەشتێ هێنراوەتە خواوە بۆلای تۆ کە قورئانە لەلایەن خۆتەوە یاخی بون و بێ باوەڕی زۆرئەکا بۆ هەندێ لەخاوەن نامەکان بەبیستنی ئەو قورئانە ، ئەو کەسانەیش هەستیان کرد بەبێ باوەڕی خۆیان ئەبن بەگورگی هار و پەلاماری هەموو لایەك ئەدەن بەکوشتن و تالآن کردنی بێ تاوانان و ناکۆکی نانەوە و بلاو کردنەوەی یاخی بوون و بێ باوەڕی .

﴿ وألقينا بينهم العداوة والبغضاء إلى يومِ القيامة ﴾ وەئێمە خستومانەتە نێوان جولەکەکان و گاورەکان دوژمنایەتی و ڕق لەیەکتری هەتا ڕۆژی هەڵسانەوە لەگۆڕەکان.

جولەکەو گاورەکان هەرگیز دڵیان بەیەکەوە نانوسێ ، دوژمنایەتیان بۆ یەکتری تێکەڵاوی خوێنیانە ، چونکە جوولەکەکان ، باوەڕیان وایە کە گاورەکان ئەفسانە چین و فێڵ زان و سەر بەکوڕێکی زۆڵە ژنێکی داوێن پیس کە عیسا و مەریەم درودی خۆیان لێ بێ . گاورەکان لایان وایە جوولەکەکان عیسایان کوشتووە و هەڵیان واسیوە ، لایان وایە عیسا کوڕی خوایە . مووسڵمانان باوەڕیان وایە عیسا بەندە و فروستادەی خوایە و دوورە لە گومانی خراپە بۆ بردن بەهەموو شێوەیە .

ناگونجێ دوژمنایەتی نێوان جولەکەو گاورەکان لابچێ بەو مەرجەی هەردوو لایان بەردەوامبن لەسەر بیروباوەڕی دژ بەیەکتری ، هەرچەندە بۆ نەهێشتنی ئەو دژایەتیە (پاپاڕۆما) لەساڵی (١٩٦٥) ی زاینی هەوڵی دا گاورەکان و جوولەکەکان لە یەك نزیك بنەوە ، بەڵام بێ هودە بو ، چونکە جوولەکەکان بەردەوامبوون لەسەر بیروباوەڕی خۆیان دەربارەی عیسا . بەڵێ : لەلایە ترەوە چاوچنۆکی و هاوبەشی هەردوو لایان بۆ کێش کردنی سامان و ناکۆکی موسوڵمانان لەیەك نزیکبوونەوە و بوون بەیەك . بەڵام لەسەر بنچینەی بازرگانی نەك لەبارەی ئاین و بیروباوەڕیانەوە.

تەفسیری زمناکۆیی

﴿ كُلّما أوقدوا ناراً للحرب أطفاها الله ﴾ هەموو كاتێ هەڵیان گیرساندبێ ئـاگرێ بـۆ جەنگ كردن لـەگەڵ جگەی خۆیان بەتایبـەتی لـەگـەڵ موسـوڵمانان و هـەوڵیان بدایـە و خراپە و جەنگ بەرپا بكەن خوا ئەو ئاگرەی ئەكوژانەوە و بەرگری لێ ئەكرد.

ئەو جەنگە لـەو ڕستەیەدا باســی كـراوە هەرچـەندە هـۆی هاتنـە خـوارەوەی جـەنگی جولـەكەكانـە لـەگـەڵ كۆمـەڵانی ئـادەمیزادی پێشـوو لـەگـەڵ پێغەمـەر و موسـوڵمانانی سەردەمی پێغەمەر كە مێژوو ڕوونی كردوەتەوە خوا كوژانیتیەوە ، بەڵام جولـەكەكانی ئـەم سەردەمەیش ئەگرێتەوە ، بەیاریدەی خوا هەركاتێ لـەدژی موسولمانان جەنگ بەرپا بكـەن خوا ئەیكوژێنێتەوە .

ووشەی (الحرب) جەنگی چەك و جەنگی زمان و پڕو پاگـەندە و پیـلان سـازكردنیش ئەگرێتەوە لـەگەڵ هەڵسان بـۆ نەهێشـتنی ئاسـایش و خۆشـی و هـەرزانی و داگـیركردنی وولاتان و بەرزكردنەوەی نرخـی شـتومەك ، ئەوانـەیش هـەمویان بەجـەنگ دائـەنرێن یـا بەڕواڵەتیش خوێنی تێدا نەڕژێ ، چونكە زۆر جاران بـەهۆی برسـێتی و گرانـی و كـاری ناهەموارەوە زیان و مردن توشـی ئـادەمیزاد ئـەبێ زۆرتـر لـەوەی تووشـیان ببـێ بـەهۆی جەنگەوە .

تێبینی : بەگوێرەی مانای دەركەوتووی ئەو ڕستەی پێشوە ئەبوایە هەركاتێ جولـەكەكان جەنگیان بەرپا بكردایە خوا ئاگرەكەی بكوژانایەتەوە ، كەچی زۆرجاران بەگوێرەی ئـەقڵی ئێمە جەنگیان هەڵگیرساندووە و نەكوژاوەتەوە . لـەو كاتانەدا وەڵامی نەكوژانەوەی ئاگری هەندێ لـەجەنگەكانیان بەچ جۆرێ ئەدرێتەوە ، بەتایبەتی جەنگی (٥) ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٧٦) ی زاینی . وەڵامی ئەو پرسیارە بەم جۆرەی خوارەوەیە :

١- زانایان پێك هاتوون لـە لـەسەر ئەوەی مەبەست لـەجوولـەكەكان ئەوانەی سەردەمی پێغەمەرن ﴿ ﷺ ﴾ كەویستیان فێڵ و پیلان لـەپێغەمەر بكەن كەبوون بەهاوسـوێندی بت پەرستان هەتا ئاگری جـەنگ خـۆش بكـەن لـەدژی پێغەمـەر و هاوڕێكـانی .

هەندێ تر لەجوولەکەکان ڕۆمەکانیان هان ئەدا لەدژیان ، هەندێ تریشیان لەژێرەوە دوژمنی موسوڵمانان بوون و یارمەتی بت پەرستانیان ئەدا ، خوای مەزن ئەو ئاگرانەی ئەوانی گێڕا بەبێ ئەنجام و ئاواتی جەنگ ساز کردنیان نەچووە سەر .

٢- ئەگەر مەبەستیش کوژانەوەی ئاگری جەنگی جوولەکەکان بێ لەهەمو کاتێکا ، بێگومان هەمو کاتێ بیانەوێ ئاگری جەنگ هەڵگیرسێنن خوایش هەموکاتێ ئەی کوژێنێتەوە بەڕاستی جەنگی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٧) ی زاینی و جەنگی (١٩٤٨) ی زاینی لەنێوان موسوڵمانان و جولەکەکاندا نەبو ، بەڵکو لەڕاستیدا لەنێوان عەرەبەکان و ڕژێمە ڕۆژئاواییەکاندا بوو ، بەتایبەتی ڕژێمی ئەمەریکا لەجەنگی ساڵی (١٩٦٧) لەگەڵ ڕژێمی داگیرکەری بەریتانیادا بوو ساڵی (١٩٤٨) هەرئەوانیش بوون نەخشەی جەنگەکانیان بۆ ئەکێشا و هەتا ئەوان فەرمانیان بەجەنگ نەدایە جولەکەکان ئاگری ئەو جەنگانەیان بەرپا نەئەکرد ، سەرچاوەی ڕاستەقینە ئەوان بوون بۆ چەك و دارایی و پێویستی جەنگ جوولەکەکان لەو کاتانەدا کەمێك بوون لەنێو سەربازەکانی ئەواندا و لەبەر دڵسۆزی جوولەکەکان ئەوان بەباشی ئەیانپاراستن.

بەڵگەی ئاشکرا لەسەر ئەوەی کەجولەکەکان ئاگری ئەو جەنگانەیان هەڵنەگیرساندبوو ، بەڵکو ڕژێمە ڕۆژئاواییەکان دروستیان کردبوو ، نەخشە و پیلانیان بۆ ئامادەکردبوو ئەمانەن .

خاوەنی نامەی (إطلاق الحماقة ) دانراوی زانایان ( بلیابن ، کوبسنتشینکۆ ، بریماکۆف) وەرگێڕاوی (ماهر عسل ) کەڕۆژنامەکانی فەرەنسا و ئەڵمانیای ڕۆژئاوا بلاویان کردەوە : هەواڵ دۆزەکانی ( المخابرات) ناردیان بۆ ئیسرائیل هەموو ئەو شتانەی لایان بوو لەزانیاری بەر لەدەست درێژکردنیان بۆ سەر ڕژێمەکانی عەرەب هاوپێچ لەگەڵ دەوسیەی تایبەتی ڕۆژهەلاتی ناوەند لەلای

بەڕێوەبەری سوێندی ئەتڵەسی (الحلف الأطلسي ) . بەڕاستی ئەو کەسەی ئەوتۆ فەرمانی دەرکرد بۆ ئیسرائیل پەلاماری عەرەبەکان بدەن بەناوی (جونسنەوە) ڕاوێژکارە جولەکەکەی بەناوی ( والت روستو) ، ئەمیراڵی ئەمریکی لەباخەڵیا هەڵیگرتبوو فەرماندان بەجێبەجێ کردنی ئامادەیی بۆ جەنگ کردن بەهەمویەکانەی ئەو سەربازانەی سەرشۆڕی فەرمانی ئەوبون ، کردەوەکانی (لیبرتی) کەشتی سیخوڕی بڕیاری بۆ دابوو لەنێوان ئەمەریکیەکان و ئیسرائیلیەکانە وەئامادەبن بۆ جەنگ .

٣- بەڕاستی ئاگری ئەو جەنگەی ئەوتۆ (واشنتۆن هەڵی گیرساند خۆی یا بەکرێ گیراوی جولەکەکانی هەڵیان گیرساند بێگومان خوا کوژاندیەوە ، دوایی بەڕاستی ئەو کەسانەی ئەوتۆ ئاگرەکەیان هەڵگیرساند چەندین جار دانیان بەوەدا نا بلاویان کردەوە لەرۆژنامە و ڕادیۆدا کە نیشانە و مەبەستی خۆمانمان نەپێکاوە دەستمان نەکەوت لەلێدان و نەمانی سەرۆکایەتی و سەربەستی عەرەبە و خۆ بەدەستەوە دانیان بەبێ مەرج ، ئاژاوەی ڕامیاری ئیسرائیل جێ بەجێ نەکرا . لەهەمان کاتا ڕوداوی (٥) ی حوزەیران تاقی کردنەوەیەکی سەختبوو بۆ عەرەب ئاگادارکردنەوەیە بۆ دۆست و دوژمنی عەرەب ، ئەگەر ئەو ڕووداوە هیچ سوودێکی نەبێ خۆ ئابڕوی پیلان گێڕان و کاربەدەستەکانی عەرەبی پێ چوو ، چونکە ئەگەر لەبەر مانەوەی کورسی خۆیان نەبێ (١٥٠) ملیۆن عەرەب بەسامانی زێری ڕەشەوەبۆ ناتوانن بەرەنگاری ئیسرائیل بکەن .

بۆ ئاگاداری : خاوەنی تەفسیری (المنار) ئەڵێ : سەرسوڕێنەر شتێ خوێندبێتمەوە ئەمەیە : بەڕاستی پیاوەگەورەکانی زاوێنی ، لەوانە : وایزمان ، موساشاریت ، دافید بن غورین ، پێك هاتوون لەگەڵ نازیەکان و گەورەکانی (الجستابو) لەسەر سەر بڕینی جوولەکەکان و ئازاردانیان بۆ دوو نیشانە : (١) پاڵ پێوەنان

جولەکەکان بۆ ئەوەی کۆچ بکەن بۆ فەلەستین . (۲) دروستکردنی بیانوو بۆ پێك هێنانی ڕژێمێ بۆ ئیسرائیل لەفەلەستیندا . خاوەنی مەنار ئەڵێ ئەوەی باسکرا نوسراوە لەنامەی (إطلاق الحماقة) ، (٥) ی (یۆنیۆ) دانراوی بلیابن و کوبستیشینکو و بریماکۆف ، وەرگێڕاوی (ماهر عسل) .

﴿ وَيَسْعَوْنَ في الأرضِ فَساداً ﴾ وەجولەکەکان کۆشش ئەکەن و هەوڵئەدەن بۆ بڵاو کردنەوەی خراپە لەڕوی زەویدا ، چونکە ئاواتی ئەوان نایەتە دی بەبێ بڵاو کردنەوەی خراپەو دوو بەرەکی و بەرپاکردنی ناکۆکی لەنێو ئادەمیزادا ، بەبێ گومان سەرۆکەکانی زاوێنی پڕ بەدەمی خۆیان هاوار ئەکەن : ئێمە بەبێ دروست کردنی دووبەرەکی و ئاژاوە نانەوە لەنێو ئادەمیزادا بەتایبەتی دانیشتوانی موسوڵمانان ناژین ، پێویستە داوێن پیسی و مەی خواردنەوە ستەم بلاو بکەینەوە لەناویانا هەتا بەنج بن و بیر لەخۆیان نەکەنەوە .

﴿ وَاللهُ لا يحبُّ المفسدين ﴾ وەخوا ئەو کەسانەی خۆشناوێ کاری خراپە بڵاو ئەکەنەوە و سەر زەوی پیس ئەکەن و دوو بەرەکی ئەسازێنن ، بەوبۆنەوە بێ بەش ئەبن لەیارمەتی خوا لەجیهاندا و دوارۆژیان نەمانە ، هەرچەندە بۆ ماوەیە ڕابوێرن و خاوەنی ڕژێم و دەسەڵاتبن ، بەکرێ گیراوەکانیان ئەنجامیان بەدبەختی و ئابڕوچوونە .

﴿ وَلَو أنَّ أهل الكتاب آمنوا وأتقوا ﴾ وەئەگەر بەڕاستی خاوەن نامەکان باوەڕیان بهێنایە بە موحەمەد بەفەرمودەکانی خوا و ، لەخوا بترسانایە لەگومان بردن وازیان لەجولەکابەتی و گاوری بهێنایە دووبەرەکی و ئاژاوەیان نەسازاندایە .

﴿ لَكَفَرنا عَنهُمْ سَيئاتِهِم وَلأَدخَلناهُمْ جَناتِ النعيم ﴾ بەڕاستی ئێمە ئەو گوناهانەی بەر لە ئیسلام بوونیان ئەمان شۆریەوە ، بەڕاستی ئێمە ئەوانمان ئەخستە چەندین بەهەشتی خاوەن ناز و چاکە و ڕابواردنی خۆش .

ئەورستەیە بانگەوازێکە بۆ جولەکەو گاورەکان لەلایەن خوای مەزنەوە بۆ پەشیمان بوونەوەیان و چوونەناو ئیسلامەوە ئەگەر باوەڕ بهێنن ، لەهەموو گوناهەکانیان خۆش ئەبێ با زۆر گەورە بونایە .

﴿ وَلَو أنّهُم أقاموا التوراة والأنجيلَ وَما أنزِلَ إلَيهِم مِنْ رَبِّهِم ﴾ وەئەگـــەر ئـەو خـاوەن نامانە ڕایان وەستانایە فەرمانەکانی تەورات و ئینجیل و کاریان پێ بکردایە و باوەڕیان بەداد پەروەری و هەموو پێغەمەران بهێنایە ، بەتایبەتی موحەمەد ﴿ ﷺ﴾ کە ناونیشانی لەنێو ئـەو نامانەدایە . وەبڕوایان بەشتێ بهێنایە نێراوەتە خوارەوە بۆلایان و ڕایان وەستانایە و کاریـان پێ بکردایە لەلایەن پەروەردەدەرەکەیانەوە نـێرراوە ، وك نامـەکانی شـەعیاء و ئـەرمیاء و زەبور کە ئەوانیش ناونیشانی پێغەمەریان تێدایە .

﴿ لأكلوا مِنْ فَوقِهِم وَمِنْ تَحتَ أرجُلِهِم ﴾ بەڕاستی ئەیان خـــوارد لەدانەوێلـە و ئـەو بەرهەمانە لەلای سەرەوەیان بەهۆی بارانەوە پەیدا ئەبن و لەلای ژێری پێکانیانە سەوز ئەبن لەزێڕی ڕەش و ئەڵماس و ئاسن و درەخت و سەوزەی تـرەوە ، ئـەو ڕسـتانە هێمـان بـۆ فراوانی ڕۆزیان .

پێچەوانەی مانای ئەو ئایەتانە وامان پیشان ئەدەن ئەو کەسانەی کار بەفەرمودەکانی خوا نەکەن ، خوای مەزن خەشمیان لێ ئەگرێ و تووشی ئەم کارەساتەیان ئەکا :

١- بڵاو بونەوەی ئازار و خەفەت و هەژاری و نەخۆشی و نەزانین و دوو بـــەرەکی و جەنگ و دەربەدەری و ئاوارەیی لەنیشتمان بەهۆی خراپی ئەو کارانەوە ئەیان کەن لەدزی و تاڵانی و خواردنەوەی مـەی و قنیـات نـەبوون بەبەشـی خـوا نـاڕەزایی بەڕێگە و ڕچەی خوا.

٢- ئەبێ بزانین ڕاگرتنی یاسای قورئان لەلایەن چەند کەسێکی کەمـــەوە نابێتـە هـۆی ئاسایش و خۆشی بۆ هەموو دانیشتوانی ناوچەیە ، پێویستە هەمویان بـاوەش بکـەن بەیاسای قورئاندا بۆ گەڕانەوەی کارەساتی ناهەموار، بەبێ گومان گـەلێکی تەمـەڵ و داوێن پیس و ستەمکار ئەبێ بەسەر شۆڕی و بێ نرخی بژین و خۆشـی ناکەوێتـە دەرونیانەوە ، هەرچەندە خاوەنی سامانی زۆر بن و پێش کەوتووی جیهانبن.

٣- ئەو گەلـەی یاسای قورئان ڕانەوەستێنێ تووشی ئازار و کوشتن و کوێری و شـــەلی و کەڕی ئەبن لەسەریانەوە بەڕژاندنی گازی شیمیایی و بۆنباو گولـە و ووردەئاسنی

ژەهراوی ، لەژێرەوە بەتەقینـەوەە مـین و هاتنـە دەرەوەی ئـاگر و تەقەمـەنی تـر ، جگەی ئەوانە تووشی دووبەرەکی ئەبن ، پاشەڕۆژیان هەر نەمانە .

٤- مەبەست لەباوەڕهێان بەخوا کەببێتە هـۆی فراوانـی ڕۆزی و خۆشـی و ئاسـایش لەسـەریان و لەژێریانـەوە ئـەبێ بـاوەڕ بـهێنن و کاریشـی پـێ بکـەن ، هـەموو فەرمووەکانی خوا دەستوور و یاسای قورئان ڕاگرن ، نەك باوەڕ هێنـان بـەدەم و نوێژ کردن و بەهەندێ لەدروشمی ئیسلام. بەڵکو بەدابەزینی یاساکانی لەزەکات و وەستان لـەدژی داگـیر کـەران و ستەمکاران ، دادپـەروەری ڕاگـرن لەهـەموو ڕویەکەوە ، بێگومـان هـەرکاتێ دادپـەروەری بـڵاو بویـەوە ، هـەموو دانیشـتوان بەخۆشی و ئاسایش ئەژین و دوور ئەبن لەکارەساتی ناهەموار بۆیە خوا ئەفەرموێ:

﴿ مِنهُمْ أمة مقتصدة ﴾ هەندێکە لەخاوەن نامـەکان کۆمـەڵێکی دادپـەروەر و ڕێـك و پێك ، وەك عەبدوڵای کوڕی سەلام و هاوڕێکانی کە باوەشیان گرتۆتەوە بۆ یاسای قورئان ، باوەڕیان هێناوە لەپاش ڕوون بونەوەی ڕاستی بۆیان ، مێژوو باسی زۆر کەسـی کـردووە کەباوەڕیان بەئاینی ئیسلام هێناوە بەبێ گەرد لەکۆن و لەتازەدا و بەردەوامیشن لەسەری .

﴿ وَكَثيرٌ مِنهُم ساءَ ما يَعْلَمون ﴾ وەزۆر کەس هەن لـەخاوەن نامـەکان شـتێ ئەیکـەن خراپە و بەردەوامن لەسەر خراپە کردن ، وەك کەعبی کوڕی ئەشرەف و وێنەکانی .

خوای مەزن فەرمان ئەدا بەپێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ تەماشای ئـەندازەی کـەمی دادپـەروەران و زۆری گوناهباران نەکا و نەترسێ و یاسای ئیسلامیان پێ ڕاگەیەنێ ، خوا بەڵێنی پـێ ئـەدا بیانپارێزێ ئەفەرموێ :

يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥۚ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٦٧﴾

﴿ يا أَيها الرَسُوْلُ بَلِغْ ما أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ ﴾ ئەی فروستادەی خوا تۆ ڕابگەیەنە هەموو شتێ هاتۆتە خوارەوە بۆلای تۆ لەلایەن پەروەردەکەری خۆتەوە بە ئادەمیزاد بەهەر جۆرێ بێ نرخی هیچ کەسێکت لا گرنگ نەبێ و چاوەڕوانی کەس مەکەو مەترسە توشی ئازار ببی.

﴿ وَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَما بَلَغْتَ رسالَتَهُ ﴾ وئەگەر تۆ ڕانەگەیەنی هەمووی بەو جۆرەی من فەرمان پێداوی، دوایی ڕات نەگەیاندووە پەیامی پەروەردەکەری خۆت هیچ شتێکی، چونکە پەنهان کردنی هەندێکی لەناو ئەبا ئەوەکەی تری، بە وێنەی نەکردنی ڕوکنێکی نوێژ. ئەو ڕستەیە ئاگادارکردنەوەی پێغەمەرو هەموو زانایانە کە هیچ شتێ لە فەرمان و یاسای خوا نەشارنەوە. بە تایبەتی تۆ ڕوبکەرە خاوەن نامەکان و هیچ شتێکیان لێ مەشارەوەو بەوانی ڕابگەیەنە کە لەسەر ئاینێ نین گرنگی پێ بدرێ و لەسەر مافی ڕەواو ڕاستی نین و بیروباوەڕیان پوچە. دژی ئەو شتانەن لە تەورات و ئینجیلدا هاتونەتە خوارەوە، ئەو نامانەی لاتانە دەست کاری کراون، ئەگەر بە تەواوی ناوەڕۆکی قورئانیان پێ ڕانەگەیەنی و هەندێکی پەنهان بدەی هەمویت لەناوداو، وەك باسکرا.

﴿ والله يَعْصِمُكَ مَنَ الناسِ ﴾ وەخوا تۆ ئەپارێزێ لە هەموو ئادەمیزادو ناتوانن ئازارو کوشتنت پێ بگەیەنن و بێ باوەڕان بە ئاواتی خۆیان ناگەن، هەوڵدانیان بۆ ئەو مەبەستە ئێستاو لەمەو پاش پوچ ئەکرێتەوە.

﴿ إنَ الله لا يَهْدي الْقَوْمَ الكافِرينَ ﴾ بەڕاستی خوا ڕانموییی تاقمێ بێ باوەڕان ناکا کە دەستەڵات بەسەر تۆدا پەیدا بکەن. هەتا ئەو ئایەتە نەهاتبووە خوارەوە پێغەمەر﴿ ﷺ﴾ پاسەوانی هەبووە، دوای هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە پاسەوانی هەڵگیرا.

زانایان بۆ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە بیریان جیاوازە، لە هەموویان چاکتر ئەمەیە خوای مەزن بەو ئایەتە هەواڵ بە پێغەمەر ئەدا کە لە فێڵ و خراپەکاری خاوەن نامەکان ئەی پارێزێ، فەرمانی پێ ئەدا گوێ نەداتە هەڕەشەی کەس. یاسای قورئان بە تەواوی ڕا بگەیەنی.

کاتێ خوای مەزن فەرمانی دا بە ڕاگەیاندنی یاسای قورئـان، ئیتر گـوێ گـران لایـان خۆشبێ یا لایان گرانبێ پێویستە بەبێ ترس ڕای بگەیـەنێ بـە خـاوەن نامـەکان نـاوەڕۆکی قورئان بالایان خۆش نەبێ. ئەو فەرماندانەش لەوەوە هـاتووە پێغەمـەر ﴿ ﷺ ﴾ لەسـەرەتای هاتنی ئایینەوە ڕاگەیاندنی یاسای بە تەواوی ئاشکرا نەئەکرد بۆ خاوەن نامەکان.

کەواتە پاش و پێشی ئەو ئایەتە ئەبنە بەڵگەی ڕون بۆ ئەوەی هۆی هاتنە خـوارەوی ئـەو ئایەتە شێوەیەکی گشتی وەرئەگرێ. نەك بە تایبەتی بۆیەك مەبەست، بۆیە خوا ئەفەرموێ:

قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَسْتُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ ۗ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا ۖ فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٦٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلصَّٰبِـُٔونَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٩﴾

﴿ قُلْ يا أَهْلَ الْكِتابِ لِسْتُمْ عَلَى شيء حَتى تُقيمُوا التَوْراةَ وَالأَنْجيْلَ ﴾ تـۆ بلـێ: ئـەی خاوەن نامەکان ئێوە لەسەر هیچ ئاینێ نین گرنگی پێ بدرێ هەتا ناوبرێ بە ئـایین چونکـە پوچە هەتا فەرمانی تەورات بەرپا نەکەن و ڕایان نەوەستێنن و بڕوا بە هـەموویان نەیـەرن و کاریان پێ نەکەن، لەو فەرمانانەیە باوەڕهێنان بەو پەیامە موحەمەد بۆی هاتوە. ئـەو ڕستانە لە ئایەتی (٦٤)ی ئەم سورەتە مانایان کراوە.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە ئەمەیە: کۆمەڵێ لە خاوەن نامەکان هاتنە خزمەت پێغەمەر ووتیان: ئایا تۆ بڕوات بە تەوارات و ئینجیل هەیە، پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ فەرموی: بەڵێ . ووتیان: کەواتە ئێمە بڕوامان بە جگەی ئەوان نیە. فەرموی ئێوە:بڕواتان بەو نامانە نیە، چونکە ئەو نامانە فەرمانیان داوە بە باوەڕهێنان بە قورئان و بە پێغەمەر کە موحەمەد.

﴿ وَما أنْزِلَ إِلَيْكُمْ مَنْ رَبِكُمْ ﴾ وەهەتا ڕاوەستێنن شتێ هاتۆتە خوارەوە بۆلای ئێوە لەلایەن پەروەردەکەرتانەوە لە باوەڕهێنان بە هەموو نامەکان و هەموو پێغەمەران و بە ناوەڕۆکی قورئان.

﴿ وَلَيَزِيْدَنَ كَثيراً مِنْهُمْ ما أنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبكَ طُغْياناً وَكُفْراً ﴾ وەشتێ هاتۆتە خوارەوە بۆلای تۆ لەلایەن پەروەردەکەری خۆت یاخی بون و بێ باوەڕی زۆر ئەکا بۆ زۆر کەس لەبێ باوەڕان.

﴿ فَلا تَأسَ عَلَى الْقَوْمِ الْكافِرِينَ ﴾ دوایی تۆ خەفەت مەخۆ لەسەر تاقمێ بێ باوەڕان کە باوەڕ بە تۆ نایەرن ئەوان زیان بەخۆیان ئەگەیەنن، موسڵمانان بەسن بۆتۆو بەوان دڵخۆشبە.

﴿ إنَ الذيْنَ أمَنُوْا وَالذيْنَ هادُوا وَالصابِئُونَ وَالنَصارى ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێنابوو بە زمان و بەدڵ لە ڕابوردووەکانی هەموو خاوەن نامەکان و جیاوازیان پەیدا نەکردبوو لە نێوان هەموو پێغەمەرەکانداو، کەسانێکی ئەوتۆن ئاینی جولەکەییان وەرگرتبوو، سابیئیەکان و گاورەکان وەك ئەوان باوەڕیان هێنابوو. سابیئیەکان کەسانێك بوون لایاندابوو لە ئاینی جولەکەو گاورەکان، دەستیان دابووە فریشتەو ئەستێرە پەرستن.

﴿ مَنْ آمَنَ بِاللهِ وَالْيَوْمَ الأخِرِ وَعَمِلَ صالِحاً فَلا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاهُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ ئەوانەی پێشوو کەسێك بوون بڕوایان هێنابوو بە خواو بە ڕۆرژی دووایی و، کردەوەی چاکیان کردبوو، دوایی هیچ ترسێ لەسەر ئەوان نیە لە پاشە ڕۆژداو، ئەوان خەفەتبار نین لەسەر کەم کردنەوەی پاداشتەکانیان و هیچ چاکەیەکیان لە کیس ناچێ و بەبێ کەم و کوڕی پاداشتی خۆیان وەرئەگرن.

ئەو ئایەتە پێشوو وامان فێر ئەکاو بۆمـانی ڕون ئەکاتـەوە دەرگـای پەشـیمان بوونـەوە کراوەیە لـە هەموو کاتاو بۆ هەموو کەس، هەرکاتێ هەرکەسێ باوەڕی هێنـاو کارچاکـەی کرد خوا پاداشتی ئەداتەوەو ڕزگاری ئەکا لە سزای ئاگری دۆزەخ. خوای مەزن پەشیمان بونەوە لـە هەموو بێ باوەڕێ وەئەگرێ کە بـاوەڕ بـهێنێ و کـاری چـاك بکـا بـە تایبـەتی سابیئیەکان کەلە هەموو ئاینێ دەرچوون.

لَقَدْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ رُسُلًاۖ كُلَّمَا جَآءَهُمْ رَسُولُۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُهُمْ فَرِيقًا كَذَّبُواْ وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ ﴿٧٠﴾ وَحَسِبُوٓاْ أَلَّا تَكُونَ فِتْنَةٌ فَعَمُواْ وَصَمُّواْ ثُمَّ تَابَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ ثُمَّ عَمُواْ وَصَمُّواْ كَثِيرٌ مِّنْهُمْۚ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿٧١﴾

﴿ لَقَدْ أَخَذْنا مِيثاقَ بَنِي إِسْرائِيلَ ﴾ بەڕاستی ئێمە وەرمان گرتبوو پەیمانی بەنو ئیسرائیلی لەتەورا تاکە کار بکەن بەشتێ لە تەوراتایە لـە پەرسـتنی خـوا بـە تەنـها و واز بـهێنن لـەو شتانەی قەدەغە کراوە لەوان.

﴿ وَأَرْسَلْنا إِلَيْـهِمْ رُسُلاً ﴾ وەئێمـە ڕەوانـەمان کـرد بۆلایـان چـەندین فروسـتادە بـۆ ئامۆژگاری کردنیان ڕێگەی ڕاستیان پیشان بدەن و ڕانموییان بکەن، کاروباری ئایینیان بـۆ ڕون بکەنەوە.

﴿ كُلَما جاءَهُمْ رَسُولٌ بِما لا تَهْوى أَنْفُسُهُمْ فَرِيقاً كَذَّبُوا وَفَرِيقاً يَقْتُلُونَ ﴾ بەلاَم هەموو کاتێ بهاتایە بۆلای ئەوان فروستادەیە بەشتێکەوە دەرونیان پێ خـۆش نەبوایـە و نەگونجایـە لـەگەڵ ئاواتی پوچیان لـە خۆیان بایی ئەبوون و ڕویان وەرئەگێڕاو یاخی ئەبوون و لـە سنور دەرئەچوون و پارچە پارچە ئەبوون، تاقمێ لـە پێغەمـەرەکانیان بـەدرۆ ئەخسـتەوە، وێنـەی عیساو موحەمەد، پشتیان تێ ئەکردن و بێ فەرمانیان ئەکردن و، تاقمـێ تریـان ئەکوشـتن وەك، زەکەریا و یەحیا، زۆرجاران هەوڵی کوشتنی عیسا و موحەمەدیان ئەدا.

﴿ وَحَسِبُوا أَلا تَكُونَ فِتْنَةٌ ﴾ وەبەنو ئیسـرائیلەکان گومانیـان بـرد کـە توشـیان نابـێ لـەلایەن خوا، بەلاَو سزا بە هۆی کوشتن و بەدرۆخستنەوەی ئەو پێغەمەرانە. وایان دانـابوو گەلی هەڵبژاردەی خوان و هەرگیز ژێر ناکەون، لـەوەوبـەر بـەو ئاواتـەوەو ئـەژیان. بـەلاَم ئێستا پشت ئەبەستن بە ڕژێمە بەدەستەلاَتەکانەوە، خراپـە و دووبـەرەکی بـلاَو ئەکەنـەوە. ئەوەبوو خوا تۆڵەی کوشتن و بەدرخستنەوەی پێغەمەرەکانی لێ کردونەوە، توشی ئـاوارەی و تالاَن بوون و نیشتمانەکەیان کـاول کـراو زوربـەیان دیلکـران و کـوژران بـە دەسـتی بابولیەکان و بەختە نەسرەوە.

﴿ فَعَمُوا وَصَمُوا ﴾ دوای ئەو بەلاَیە توشیان بوو خۆیانیان کوێرکرد لـە بینینـی ڕێگـەی ڕاست و خۆیانیان کەڕ کرد لـە ئاستی بیستنی فەرمودەی موساو گوێرەکەیان پەرست.

﴿ ثُمَ تابَ عَلَيْهِمْ ﴾ لـەپاشا پەشیمان بوونەوەو خوا پەشـیمان بونـەوەی لێ وەرگرتـن و ڕزگاریان بوو لـە چەوسانەوەی بەختە نەسرو بابولـیەکان.

﴿ ثُمَ عَمُوا وَصَمُوا كَثِيرٌ مِنْهُمْ وَاللهُ بَصِيرٌ بِما يَعْمَلُونَ ﴾ لە پاشـا جـارێ تـر خۆیانیـان کوێر کردەوەو خۆیانیان کەڕ کردەوەو زۆر کەس لـەبەنو ئیسرائیلی، دەستیان کردەوە بـە خراپەکردن و لایاندا لـە سنوری خواو زەکـەریا و یـەحیایان کوشـت و هـەوڵی کوشـتنی عیسایان داو بەدرۆیان خستەوە، کاری نارەوایان دایە پاڵ خۆی و دایکی، خوا بەو بۆنـەوە فارسەکان و ڕۆمەکانی بەسەریانا زاڵ کردو، خوا ئاگادارەو ئەبینێ و ئەزانێ بەشتێ ئـەوان

بیکەن لە ڕژاندنی خوێنی ناڕەواو ڕوکەش کردنی ڕاستیەکان بە ڕەنگی پڕوپوچ و ناڕەواو دروست کردنی پیلان و گێرە شێونی و بەجێ هێنانی نەخشەی خراپی ستەمکاران و خوێن مژان.

ئەو کارە خراپانە خوا لە جولەکەکانیەوە ئەگێڕێتەوە پڕ بە پێستی خۆی ئەدرێ بەسەر ئەو سرۆکە بوسڵمانانەدا کە لە ئاسمانی ئەو کەسانەدا ئەسوڕێنەوە دژی ئایینی پاکی ئیسلامن و پشتیوانی جولەکەکان ئەکەن و یارمەتیان ئەدەن بۆ دژی موسڵمانان کە داوای مافی خۆیان و چەسپاندنی یاسای ئیسلام ئەکەن. ئەگەر داوای مافی چارەنوسی خۆیان بکەن بە گازی کیمیاوی و ئاگرو گولەو بەندکردن وەڵامیان ئەدەنەوە، کارەساتی هەڵەبچە کەمترین نمونەی تاوانە.

دوای ئەوەی خوای مەزن باسی ڕەوشتی جولەکەکانی بۆ کردین، باسی ڕەوشتی خراپی گاورەکانیشمان بۆ ئەکا بەڕادەیە ڕێزی عیساو دایکی ئەبەنە ڕیزی خواو پلەی خوا یان ئەدەنێ. جولەکەکانیش بەجۆرێ لە نرخیان کەم ئەکەنەوە کەبێ شەرمانە عیسا بەزۆڵ و دایکی بە داوێن پیس ئەژمێرن. بەڵام ئیسلام مافی ڕەواو شایستەی خۆیانیان ئەدەنی، ئیسلام بیروڕای هەردوو لایان پوچ ئەکاتەوە، بۆ ڕون کردنەوەی ئەو باسە خوا ئەفەرموێ:

لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ۖ وَقَالَ ٱلْمَسِيحُ يَـٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۖ إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ ۖ وَمَا لِلظَّـٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿٧٢﴾ لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَـٰثَةٍ ۘ وَمَا مِنْ إِلَـٰهٍ إِلَّآ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ ۚ وَإِن لَّمْ يَنتَهُواْ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ

ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُۥ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٧٤﴾ مَّا ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌ كَانَا يَأْكُلَانِ ٱلطَّعَامَ ٱنظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلْآيَٰتِ ثُمَّ ٱنظُرْ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٧٥﴾

﴿ لَقَدْ كَفَرَ الذِيْنَ قالُوا إنَّ اللهَ هُوَ الْمَسِحُ ابْنُ مَرْيَمَ ﴾ بەڕاستی بێ باوەڕان کەسانێکی ئەوتۆن ووتویانە بەڕاستی خوا هەر مەسیحی کوڕی مەریەمە. ئەوەش بیروباوەڕی یەعقوبەیەکان و مەلکانیەکانە، چونکە ئەوان ئەڵێن: مەریەم خوای لێ پەیدا بووە، خوا هاتوەتە نێو لەشی عیساو گەڕا بە خواو بوون بەیەك خوا، خوای مەزن بەدرۆیان ئەخاتەوەو ئەفەرموێ:

﴿ وَقالَ عيسى يا بنـي إسْرائِيْلَ أعْبُدُوا اللهَ رَبّي وَرَبّكُمْ ﴾ وەعیسا ووتی: ئەی بەنو ئیسرائیلی ئێوە خوا بپەرستن پەروەردەکەری منەو پەروەردە ئێوەیە . بە توندی و بە سەختی ترساندنی ووتی:

﴿ إنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللهِ فَقَدْ حَرَمَ اللهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمـأواهُ النارُ وَما للظـالِمِينَ مِنْ أَنْصار ﴾ بەڕاستی هەرکەسێ هاوبەشدابنێ بۆخوا، بەجۆرێ گومانی وابێ جگەی خوا شایانی پەرستنە، لەگەڵ ئەوەیشدا ئاشکرایە هیچ کەسێ توانای کاری وای نیە شایانی پەرستنبێ، دوایی بە ڕاستی خوا قەدەغەی کردووە لەسەر ئەو کەسە بەهەشت کە ئامادەکراوە بۆ ئەو کەسانە خوا بە تاك و تەنها دائەنێ و، جێگەی گەڕانەوەو چارەنوسیئەو کەسە ئاگری دۆزەخەو، نیە بۆ ستەمکاران لە خۆیان بە پەرستنی جگەی خوا هیچ یاریدەرێ فریاڕەسیانبێ بۆ ڕزگارکردنیان لە سزای ئاگری دۆزەخ لە ڕۆژی دواییدا.

خوای مەزن بیروبۆچوونی ئەو کەسانەی پوچ کردەوە کە ئەیان ووت: هەر عیسا خوایە، لەمەوپاش بیروباوەڕی ئەو کەسانەش پوچ ئەکاتەوە ئەڵێن: عیسا یەکێکە لەسێ خواو ئەفەرموێ:

﴿ لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللهَ ثَالِثُ ثَلاثَةٍ ﴾ بەڕاستی بێ باوەڕان کەسانێکی ئەوتۆن ووتیانە: بەڕاستی خوا سێهەمی سێ خوایە. ئەوەیش بیروباوەڕی مەرقوسیەکان و نەستوریەکانی گاورەکانە کە ئەڵێن: سێ خوا هەن (١) باوك (٢) کوڕ (٣) گیانی بەڕێز. لە دواییدا باوك چوە نێو کوڕەوەو بوون بەیەك، هەریەکە لەو سیانە ئەوە کەی ترە بەبێ جیاوازی، بە چونە ناوی باوك بۆنێو کوڕگیانی پاك پەیدا بووە. مەبەستیان لە باوك: ماك و کاکڵەیە. لە کوڕ ووشەیە. لە گیان مان و زیندەگیە، هەرسێیانیان خوان و بوون بەیەك خوا.

﴿ وَمَا مِنْ إِلَهٍ إِلاَّ إِلَهٌ وَاحِدٌ ﴾ وەنیە هیچ خوایە شایانی پەرستن بێ مەگەر خوایەکی تەنها ، خاوەنی کوڕ نیە و عیسا خوا نیە و سێهەمی سێ خوا نیە ، هەر تەنها یەك خودا هەیە .

﴿ وَإِنْ لَمْ يَنتَهُوا عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ وەئەگەر گاورەکان کۆتایی نەهێنن بەشتێ ئەیلێن ، کە عیسا خوایە ، یا سێهەمی سێ خوایە ، بەڕاستی ئەگا بەکەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە لەو گاورانە سزایەکی خاوەن ئازار.

پرسیار / ووشەی (منهم) وائەگەیەنێ گاورەکان دوو بەشن : بێباوەڕ و باوەڕدار ، کەچی بەگوێرەی دەقی مانای ئایەتەکانی پێشوو هەموویان بێ باوەڕن ؟

وەڵام / ئەوەی ڕاستی بێ گاورەکان بۆماوەیە خوایان بەیەك دائەنا و لەو ماوەدا عیسایان بە پێغەمبەر ئەژمارد نەك بەخوا ، لەپاشا بوون بەدوو پارچە یەکێکیان هەر لایان وابو خوا یەکە و عیسا پێغەمبەرە .پارچەکەی تریان بڕیاری زۆری خوایانیدا ، بەدرێژی کات هەمویان بوون بەبێ باوەڕ : بڕیاری خوایەتی عیسایان دا . کەواتە مەبەست لەباوەڕداران ئەوانەی پێشوون کەلەسەر تاك و تەنهایی خوا مابونەوە .

﴿ أفَلا يَتُوبون إلى الله وَيَستَغفِرونَهُ وَاللهُ غَفورٌ رَحيم ﴾ ئایا دوایی بۆ پەشیمان نابنەوە بۆلای خوا . واز لەدانانی عیسا بە خوا بهێنن و بڕیاربدەن خوا یەکە و ، داوای لێخۆشبون لەخوا بکەن بەهۆی باوەڕهێنان بەیەکێتی خوا و وازهێنان لەباوەڕبەخوایەتی عیسا ، یانی پێویستە پەشیمان ببنەوە و داوای لێ خۆش بوون لەخوا بکەن و ، خوا لێ بوردنی بۆ ئەو کەسانە زۆرە میهرەبانە بۆ ئەو کەسانە پەشیمان ئەبنەوە، میهرەبانە بۆ ئەو کەسانە داوای لێ خۆش بوون لە خوا ئەکەن .

﴿ مَا المسيحُ ابن مَريَم إلاّ رَسُلٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبلِهِ الرُّسُلَ وَأمُهُ صِدّيقَةٌ كانا يأكلانِ الطعام ﴾ نیە مەسیحی کوڕی مەریەم کە ئێوە بەخوای دائەنێن مەگەر ڕەوانەکراوێکی لای خوایە ، بەڕاستی ڕابوردوە لەپێش ئەوەوە چەندین نێردراوی خوا ، وەك ئیبراهیم و نوح و موسا و جگەی ئەوانیش . کاری بەهەمو کەس نەکراو لەسەر دەستیان پەیدا بوە، وك لەسەر دەستی عیسا پەیدا بووە . کەواتە دانانی عیسا بەخوا بێ بەڵگەیە و ، دایکی عیسا زۆر ڕاست گۆیە ، هەر شتێ خوا نەیفەرموبێتی بەڕاستی داناوە و داوێن پاکە ، عیسا و مەریەم هەردووکیان خواردەمەنی ئەخۆن و بێ خواردن ناژین ، وەك هەموو گیاندارانی تر ، خوا پێویستی بەخواردن و هیچ تر نیە بۆیە خوا ئەفەرموێ :

﴿ أنظر كَيفَ نُبَيّنُ لَهُمْ الآيات ثُمَّ أنظر أنّي يُؤفكون ﴾ تۆ تەماشا بکە ئێمە چۆن ڕون ئەکەینەوە بۆ ئەوان چەندین بەڵگە لەسەر یەکێتی خوا ، ئەوان ئەگەر خوا بن چۆن خواردن ئەخۆن ؟ لەپاشا تۆ تەماشا بکە چۆن ئەوان واز ئەهێنن لەڕاستی و ڕاستی بەدرۆ ئەخەنەوە و جگەی خوا جیا ناکەنەوە و عیسا بەخوا دائەنێن .

خوای مەزن بەڵگەی زۆر ڕوونتر باس ئەکا بۆ سەرشۆڕکردنیان ، ئاشکرای ئەکا بۆیان کە ئێوە خۆتان ئەڵێن : عیسا منالێ بووە لەمنداڵدانی مەریەمەی دایکیدا ، ئەو کاتە هیچ شتێکی نەزانیوە و بێ توانا بووە ، بۆیە خوا ئەفەرموێ :

قُلْ أَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا
يَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا ۚ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٧٦﴾
قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ غَيْرَ ٱلْحَقِّ
وَلَا تَتَّبِعُوٓا۟ أَهْوَآءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا۟ مِن قَبْلُ وَأَضَلُّوا۟
كَثِيرًا وَضَلُّوا۟ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٧٧﴾ لُعِنَ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى
ٱبْنِ مَرْيَمَ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٧٨﴾
كَانُوا۟ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ ۚ لَبِئْسَ
مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٧٩﴾ تَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ
يَتَوَلَّوْنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ
أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِى ٱلْعَذَابِ هُمْ خَٰلِدُونَ ﴿٨٠﴾
وَلَوْ كَانُوا۟ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِىِّ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ
مَا ٱتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَآءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ
﴿٨١﴾

﴿ قُلْ أَتَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللهِ ما لا يَمْلِكُ لَكُمْ ضراً وَلا نَفْعاً واللهُ هُوَ السَميعُ الْعَلِيْمُ ﴾ تۆ بلّێ ئایا بۆ ئێوە ئەپەرستن لە جگەی خوا شتێ خاوەنی زیان گەیاندن نیە بۆ ئێوەو خاوەنی سود گەیاندن نیە، شتێ بەو جۆرە بێ نابێ پەرستنی بۆ بکرێ. کەچی ئینجیلەکانی خۆتان ئەڵێن: ئەو عیسایە کە ئێوە ئەیکەن بەخوا لەلایەن دوژمنەکانیەوە کوژراوەو بێ ڕێز کراوەو هەڵواسراوەو نراوەتە گۆڕەوەو سود بەخۆی نەگەیەنێ چاکتر توانای ئەوەی نیە زیان و سوود بە ئێوە بگەیەنێ، هەرکەسێ بەو جۆرەبێ مرۆڤێ ژیربێ بە خوای دانانێ و نای پەرستێ و، خوا هەر ئەوەیە هەموو گفتوگۆو بێ باوەڕی ئێوە ببیسێ، ئەزانێ بە شاراوەی دەرونتان. پاداشتی چاکەو خراپەتان ئەداتەوە.

﴿ قُلْ يا أَهْلَ الكِتابِ لا تَغلُوا في دِينِكُمْ غَيْرَ الْحَقِ ﴾ تۆ بلّێ: ئەی خاوەن نامەکان ئێوە لەو سنورە دەرمەچن خوا دیتاری کردووە بۆتان لە ئاینی خۆتان بە دەرچونێکی ناڕاست و ناڕەواو پوچ. نە لە نرخی پێغەمەران کەم بکەنەوەو، نە بە ناڕەوا ڕێزیان بەرزبکەنەوە. لە سنور دەرچونی جولەکەکان ئەوەیە ئەڵێن: عیسا زۆڵەو عوزەیر کوڕی خوایە. گاورەکان ئەڵێن: عیسا خوایە ئەو ئایەتە هەرچەندە ڕوی پێ کراوە بۆلای خاوەن نامەکان بەلّام لە ناوەڕۆکا هەموو خاوەن نامەکانی تر ئەگیرێتەوە. ئیسلام لە بنچینەدا زیان و سودی هەموان داوەتە دەست خوای مەزن، هەموو کەسێ بەبێ جیاوازی بەندەی خوایەو بێ توانایە لەبەردەم خوادا، ئادەمیزاد لە بەرانبەر خوادا پێویستی بە نوێنەرێ نیە، خۆی بۆخۆی لە خوا بپاڕێتەوە.

﴿ وَلا تَتبِعُوا أَهْواءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا مِنْ قَبْلُ وَأَضَلُّوا كَثيراً وَضَلُّوا عَنْ سَواءِ السَبيلِ ﴾ وەئێوەی خاوەن نامە دوای هەواو هەوەس و ئارەزوی تاقمێ مەکەون بەڕاستی لایاندابوو لە ڕێگەی ڕاست لەمەوبەر لە سەرۆکەکان و ڕێگەی ڕاستیان لێ وونبوو بەر لە هاتنی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ زۆر کەسیان لادابوو لە ڕێگەی ڕاست و خواپەرستی، خۆشیان لایاندابوو لە نیاز کردنی ڕێگەی ڕاستی مام ناوەندی ئیسلام و ناوەڕاستی ڕێگەی ئاینیان نەگرتبوو،

هەندێکیان پلەی خوایەتیان ئـەدا بـە عیسـا، هـەندێ تریـان ئەیاندایـە پـاڵ عیسـا کـاری ناشایستە.

ئەوانەی ڕابواردن لەو ئایەتەدا کاری خاوەن نامەکانە. بەڵام ئیسلام لـە یەکـەم جـاری هاتنی پێغەمەرەوە ڕێگەی مام ناوەندیان گرتووە لە سـنوری دیـاری کـراو لایـان نـەداوە، پێغەمەریان نەبردە پلەی خوایی، ئەوپەڕی ڕێزیان گرتوە لە هەموو ڕویەوکەوە. بـۆ نموونـە: پێغەمەر خوا فەرمانی پێداوە بڵێ: بە موسڵمانان من مرۆڤێکم هەروەك ئێوە، بەو جۆرە پێـم سپێردراوە لەلایەن خواوە، خوای ئێوەو من هەریەکە.

جارێ پیاوێ چووە خزمەت پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ لە ترسی گەورەیی پلەی پێغەمـەر لـەشـی هاتە لەرزین. پێغەمەر فەرمووی: ئارام و لەسەرخۆبەو مەترسە، من کوڕی ژنێکم شـوربای گۆشتی ئەخوارد. ئایینی ئیسلام بەو جۆرە فەرمانی داوە بە موسڵمانان کـە لـە ڕێزگرتنـی پێغەمەردا لە سنور دەرنەچن، پێویستە هەمو پلەیە بدەن بە پێغەمەر جگەی پلەی خوایی.

﴿ لُعِنَ الذِيْنَ كَفَـرُوا مِـنْ بَـنِي إِسْـرائيلَ عَلَـى لِسـانِ داوُدَ وَ عِيسـى أَبْـنَ مَرْيَـمَ ﴾ بـێ بەشکراوان لە بەزەیی و میهرەبانی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێنابوو لە بەنو ئیسـرائیلی لەسەر زمانی داوود لە نامەی خۆیا کە زەبورە نـەفرەتی کـردوە لـە دانیشـتوانی (ئیلـە): قەدەغەی کرد لەوان یەهۆی سروشتی خواوە بۆی کەڕاوە ماسی نەکەن لە ڕۆژی شەمەدا، کاتێ لە فەرمانی خوا دەرچون پاڕایەوە لە خوا تۆڵەیان لێ بسێنێ،خوا کردنی بە مەیمون بێ بەشکراون لە بەزەیی و میهرەبانی خۆی و، لە سەر زمانی عیسایش لـە ئینجیلـدا بـەهۆی لادانیان لە فەرمانی خوا، ئەوە بۆ پێنج هەزار کەسیان داوایان کرد لە عیسا لـە ئاسمانـەوە سفرەیێکی پڕ لە خواردەمەنیان بۆ نبێتە خوارەوە، دوایی ئەوان بیخـۆن باوەڕبـهێنن. کاتـێ هاتە خوارەوە خواردیان پەشیمان بونەوە، عیسا فەرموی: ئەی خوایە بێ بەشـیان لەبـەزەیی خۆت بکە هەوەك ماسی ڕاوکەرەکانی ڕۆژی شەمەت بێ بەش کرد لە بـەزەیی میـهرەبانی خۆت ئەو ئایەتە هەرچەندە بە ڕوواڵەت دەربارەی بەنو ئیسـرائیلیەکان هاتوەتـە خـوارەوە

بەڵام هەموو ئەو کەســانە ئەگرێتــەوە بــاوەڕ بــە فــەرمودەکانی خــوا نەیــەرن و لــە ســنور دەرنەچن.

لەو ئایەتەدا خوا بۆمانی دەرخستوە کە دروستە نــەفرین لــەبێ بــاوەڕان بکــرێ بــا لــە بڕبڕەی پشتی پێغەمەرانبن، بۆمانیشی ڕون ئەکاتەوە باوك و باپیر نابنە هــۆی قەدەغــەکردنی نەفرین لەوان.

﴿ ذٰلِكَ بِما عَصَوْا وَكانُوا يَعْتَدُونَ ﴾ ئەو نەفرینــە ســەختە بــە هــۆی ئــەوەوە بــوو بــێ فەرمانی خوایان کردبوو، ئەوان دەست درێژییان کردبووە سەر پێغەمــەران و لــەو ســنورە دەرچوبون.

﴿ كانُوا لاَيَتَناهَوْنَ عَنْ مُنْكَرٍ فَعَلُوهُ لَبِئْسَ ماكانُوا يَفْعَلُونَ ﴾ لەو بێ باوەڕانە واز نایەنن لە هیچ خراپەیە کردویانە و بۆیان لوابێ، لەبەر ئەوەی کە بێ فەرمانی بوبو بــە ڕەوشــتیان هیچ کەسێکیان بەرگری لە خراپەی ئەویی تریان نەئەکرد و ئامۆژگاری یەکتریان نەئەکردو سەرشۆڕی هیچ هەڕەشەیەکی خوا نەئەبون. سوێند بــەخوا خــراپ شــتێکە ئــەوان ئەیکــەن لەکردنی بێ فەرمانی خواو لائەدەن لە سنوری خواداو دەست درێژ ئەکەنە سەر پێغەمەران ئەو ئایتە پیرۆزە وامان پیشان ئەدا ئەو خراپە کردنەیان وەنەبێ کاری یەکێکیانبێ بــە تەنــها. بەڵکو ڕەوشتی زۆر کەسیان بووە، بەڕادەیــە بوبــو بــە پیشــەی ئاســایی جولەکــەکان لــەم سەردەمەی ئێمەیشدا شاگردەکانیان لە هەموو ڕوی زەویدا بە تایبەتی شاگردەکانیان لــەنێو وولاتی موسڵمانانـدا کە دەقاودەقی کردەوەیان ڕەوشتی ئەو جولەکانەیــە، کردنــی هــەموو خراپەیە لایان پەسەندە، بگرە خۆیشیانی پێوە هەڵئەکێشن، بۆ ڕون کردنەوەی ئەو مەبەســتە زانایان موسلیم و بوخاری ئەگێڕنەوە لە پێغەمەرەوە ﴿ ﷺ﴾ فەرموی:

ئێــوە پــەیڕەوی کەســانێك ئەکــەن لــە پێشــتانەوە بــوون، دووایــان ئەکــەون وێنــــەی دوواکەوتنی تیریەك بە دووای یەکا، بە جۆرێ ئەگەر ئەوان بچنە نێو کونــی سوســەمارەوە

ئێوەیش ئەچنە نێو ئەو کونەوە، ووتیان: ئەی فرۆستادەی خوا جولەکەو گاورەکان، فەرموی:

ئەی کێن؟هەروەها ئەگەر یەکێ لەوان لە ناوەڕاستی ڕێگەدا بچێتە لای ژنی خۆی، ئێوەیش ئەیکەن. هەروەها ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قەدەغەیە هاوڕێتی و دانیشتن لەگەڵ تاوانباران، فەرمانیشی داوە وازیان لێ بهێنرێ و کۆچ نەکرێ بۆلایان.

﴿ تری کَثیراً مِنهُمْ یَتَوَلَوْنَ الذینَ کَفَرُوْا ﴾ تۆ ئەبینی زۆر کەس لەو جولەکانە ئەوپەڕی کینەو دڵ پیسان هەیە لەگەڵ موسڵمانان، لەبەر ئەوانەیشە: دۆستایێتی ئەکەن لەگەڵ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە لە بت پەرستان و هانیان ئەدەن لەدژی موسڵمانان.

ئەو ئایەتە لەوەوە هاتووە کە زوربەی جولەکەکان پشتی بت پەرستەکانیان ئەگرت لەدژی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾، هانی بت پەرستانیان ئەدا بۆ ئەو مەبەستە، بگرە زۆرتر لەوان دوژمنایێتی پێغەمەریان ئەکرد، لەگەڵ ئەوەیشدا پێغەمەر باوەڕی بەخواو بە پێغەمەرایێتی موسا هەبووەو بەڕاستی تەورات. ئەو کەسانە ئەوان دۆستایەتیان ئەکردن بت پەرستبوون و باوەڕیان نە بە موساو نە نە بە هیچ ئاینێ نەبوو لەگەڵ نامەکانیان، چاکتر بۆ جولەکەکان ئەوەبو یاریدەی پێغەمەریان بدایە لەدژی بت پەرستان.

بەڵام جولەکەکان هەر لە کۆنەوە باوەڕیان بە کۆکردنەوەی پارەو دارایی هەبووە بازرگانیان بە ئاینی خۆیان دائەنا، نەك خواپەرستی، هەمیشە دژی مرۆڤایێتی و ئاشتی بوون.

بۆزانین: جولەکەکان دەستیان گرتبوو لە مەدینەدا بەسەر قازانج و بازرگانی ناوخۆی مەدینە. بت پەرستانیش دەستیان گرتبوو بەسەر قازانج و بازرگانی دەرەوەدا. پێغەمەر هەوڵی داو کاری کرد بۆ ڕزگارکردنی دانیشتوان و سەربەخۆی بازرگانی و لەدەستی هەردوو لایانی دەربهێنێ بۆ سودی دانیشتوان، ئەو کارەی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ دژی سوودی هەردوو لایان بوو، بۆیە قەولیان کرد بەیەك لە دژی پێغەمەرو باوەڕداران، هەروەها لەم سەردەمەی ئێمەشدا سودی زاوێنی بەستراوە بە سودی وولاتانی داگیرکەرو خوێن مژانەوە

بۆیە یارمەتی یەکتری ئەدەن لەدژی گەلانی هەژار بە تایبەتی گەلانی موسڵمان، کاربەدەستانی بەنا و موسڵمان بە نهێنی و بە ئاشکرا یارمەتیان ئەدەن لەدژی گەلانی خۆیان، چونکە مانەوەی خۆیان لە هەژاری و ڕوتانەوەی گەلانی خۆیانیان ئەبینن.

﴿ لَبِئْسَ ما قَدَمْتَ لَهُمْ أَنْفُسُهُمْ أنْ سَخِطَ اللهُ عَلَيْهُمْ وَفِي الْعَذابِ هُمْ خالِدُونَ ﴾ سوێند بەخوا خراپە شتێکە خۆیان پێشیان خستوە بۆخۆیان کە بەو شتە خراپەوە بگەڕێنەوە بۆلای ڕۆژی دوایی کە خوا خەشمی خۆی ڕژاندەوە بەسەریانا بەهۆی ئەو دۆستایەتیەوە لەگەڵ بت پەرستان کردویانە لەدژی پێغەمەرو موسڵمانان و لەنێو سزادان ئەوان بە بەردەوامی.

﴿ وَلَوْ كانُوا يُؤْمِنُونَ بِاللهِ وَالنبِي وَما أنْـزِلَ إلَيْـهِ مـا أتَخَذُوهُـمْ أوْلِيـاءَ ﴾ وەئەگەر ئەو جولەکانە باوەڕ بهێنن بەخوا بە پێغەمەرو بە موساو بەشتێ نێردراوەتە خوارەوە بۆلای کە تەوراتە یا باوەڕ بهێنن بەخواو بە پێغەمەر و بەشتێ نێراوەتە خوارەوە بۆلای کە قورئانە، ئەوان ئەو بت پەرستانەیان نەئەکرد بە دۆستی خۆیان لە دژی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾، چونکە دۆستایێتی ئەوان قەدەغەیە بە گوێرەی یاسای نامەکانیان.

﴿ وَلَكِنَّ كَثيِرًا مِنْهُمْ فاسِقُونْ ﴾ و بەلاّم زۆر کەس لە خاوەن نامەکان دەرچوون لە بازنەی باوەڕهێنان، مەبەستیان بە باوەڕ بە خواو بە ئایین نیە، جگە لە سودو قازانج و بازرگانی باوەڕیان بە هیچ شتێ نیە. ئەوەی ڕێك و پێکبێ لەگەڵ پێشەوەی ئەو ئایەتە وا دیارە ئەو پێغەمەرە موسابێ و مەبەست لەو شتەی هاتووەتە خوارەوە تەواراتبێ و مەبەست لەو کەسانە داوای باوەڕهێنانیان لێ ئەکرێ جولەکەکانن.

به یاریدەی خوا کۆتایی بە نوسینی جزمە شەشەم هات لە ڕێکەوتی ٥ - ٣ - ١٩٩٩ زایینی بەرانبەر بە ١٧دەی زیلقەعیدەی ساڵی ١٤١٩٠ - کۆچی.

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

درودی بێ پایان لەسەر گیانی پێغەمەری مەزن و لەسەریارو یاوەرانی بێ.

کاتێ ئازاری قورەیشیەکان پەرەی سەند، پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ فەرموی بە موسڵمانان:
چاك وایە ئێوە بڵاوبنەوە بە وولاتاناو لە مەکە دەرچن. ئەوانیش داوایان کرد بۆ چ جێگەیەك بچن؟ پێغەمەبەر ﴿ ﷺ ﴾ ئامۆژگاری کردن و فەرموی: بڕۆن بۆ هەرێمی حەبەشە، پاشاکەیان دادپەروەرەو ستەمیش لایاناکرێ هیچ جۆرێ هەتا خوا دەورێکمان بۆ ئەکاتەوە. کۆمەڵێ لە باوەڕداران چوون بۆ حەبەشە هەندێکیان بە تەنها و هەندێ تریان بە خێزانەوە. بۆ پاراستنی ئاینەکەیان پشتیان بە خوا بەست، ژمارەیان گەیشتە یازدە پیاو چوار ژن، زۆر بە خۆشی لە پاڵی نەجاشیدا ژیان. دانیشتوانی مەکە ئەو کۆچەیان زۆر لاگران و دژواربو، زۆر ترسان ئایینی ئیسلام لە حەبەشە بڵاوبێتەوە، بۆ بەرگری کردن لەو مەبەستەدا دانیشتوانی مەکە عمری کوڕی عاص بەر لە موسڵمانبوونی عەبدوڵای کوڕی ڕەبیعەیان نارد بۆلای نەجاشی و دیاری زۆر بە نرخیان لە کاڵاو قوماشی مەکەیان بۆ، برد هەروەها دیاریشیان نارد بۆ هەموو یەکێ لە زاناکانی حەبەشە، هەوڵ بدەن بەر لە موسڵمانان بکەونە گفتوگۆ لەگەڵ نەجاشیدا هەتا موسڵمانان بداتە دەستیان، چونە لای نەجاشی و ووتیان تاقمێ لە ئێمە هاتۆتە لای تۆوبونەتە هۆی ناکۆکی و خوێن ڕێژی لە نێوانماندا، بۆیە داوات لێ دەکەین بیاندەنە دەستمان. نەجاشی ووتی من کاری بەو جۆرە ناکەم هەتا گفتوگۆیان نەبینم و نەزانتم چ شتێ ئەڵێن؟ لە دوایدا موسڵمانانی لەگەڵ ئەواندا کۆکردەوەو لای خۆی، جەعفەری کوڕی ئەبو تالبی ئامۆزای پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ نەجاشیدا، بۆ دانیشتوانی ڕوون کردەوە ئەو شتە نالەبارانەی بەر لە ئیسلام لەسەری بوون، وەك گومڕایی و داوێن پیسی و زیندە بەچاڵ کردنی ژنان کاری زۆری ناپەسەند بۆیشی ڕون کردنەوە کە ئێستا لەم کاتەدا موسڵمان بووین ڕەوشتی بەرزو بەڕێز بووە بە پەشەمان بە هۆی فروستادەیەکی بەرزەوە نەجاشی و فەرمووی چ شتێك لایە

لەوەی هاتووەتە خوارەوە بۆلای موحەممەد ﴿ ﷺ ﴾ بۆمانی بخوێنەرەوە جەعفەری تەیار سورەتی (مەریەمی) بەسەردا خوێندەوە، دوای نەجاشی و زاناکانی گاورەکان دەستیان کرد بە گریان هەتا ڕیشیانتەڕبوو بەهۆی کاریگەری قورئانی پیرۆزەوە، بۆیە نەجاشی فەرموی: سوێندم بەخواو ئەو شتەی هاتوەتە خوارەوە بۆ لای عیسا، ئەوەیە هاتوەتە خوارەوە بۆلای موحەممەد لەگەڵ ئەوەی عیسادا لەیەك سەرچاوەوە هاتونەتە خوارەوە، بەعەمری کوڕی عاصی ووت: لێرە دەرچن خۆت و هاوڕێکانت، من ئەم موسڵمانانە نادەمە دەستتان، دیاریەکانی خۆیشتان ببەنەوە، من پێویستم پێ نیە.

بەڕونی خوای مەزن ئەو باسەمان بۆ ئەکا، دوای ئەوەی باسی دوژمنایەتی و دڵ پیسی جولەکەکانی بۆ کردین، ئێستاش ئەو دوژمنایەتی و دڵ ڕەقی ئەوانمان بۆ دووپات ئەکاتەوە لەگەڵ باسی دۆستایەتی هەندێ لە گاورەکانی ئەو کاتە بۆ موسڵمانان، بەراوردی یەکیان ئەکاو ئەفەرموێ:

لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٨٢﴾ وَإِذَا سَمِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُواْ مِنَ ٱلْحَقِّۖ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨٣﴾ وَمَا لَنَا لَا نُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْحَقِّ

وَنَطْمَعُ أَن يُدْخِلَنَا رَبُّنَا مَعَ الْقَوْمِ الصَّالِحِينَ ﴿٨٤﴾ فَأَثَابَهُمُ اللَّهُ بِمَا قَالُوا جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الْمُحْسِنِينَ ﴿٨٥﴾ وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴿٨٦﴾

﴿ لَتَجِدَنَ أشَدَ الناسِ عَداوةً للذيـنَ آمَنـوْا الْيَـهُودَ ﴾ بەڕاستی تۆ دەستت ئەكەوێ سەختڕین ئادەمیزاد لە بارەی دوژمنایەتیەوە بۆ كەسانێ باوەڕیان هێناوە جولەكەكانن، چونكە چونەتە خوارەوە لە پەیڕەوی كردنی هەواو هەوەسی خۆیانا، بێ شەرمانە پێغەمەران بەدرۆ ئەخەنەوە.

﴿ وَالذيـنَ أشـرَكوا ﴾ وەكەسانێكی ئەوتۆبن هاوبەشی بۆخوا دائەنێن، وەك بت پەرستان، چونكە زۆر بە سەختی یاریدەی ستەم كاران ئەدەن، ئارەزۆی زۆریان بۆلای لاسایی كردنەوەی پێشوەكانیان ئەڕوا لەبێ باوەڕیداو چونەتە خوارەوە لە دڵ ڕەقیدا.

زۆر كەس هەن ئەو ئایەتە ئەكەن بەبەڵگە لەسەر ئەوەی ئایینی گاورەكان نزیكترە لە ئایینی ئیسلامەوە هەتا ئایینی جولەكەكان. ئەبێ بزانین ئەو كەسانە لە هەڵەدان، چونكە ئەگەر مەبەست لە ئایینی گاورەكان بەر لە دەست كاری بێ زۆر ڕاستە، ئایینی نەگۆڕاو لای خواو پێغەمەران یەكەو سەرچاوەیان یەكە لەلایەن بیروباوەڕەوەو یەك بنچینەیان هەیە، ئەگەر مەبەست لە ئاینەكانیان دوای دەست كاری كردنیانبێ، هەردوو ئاینەكان وەك یەك وان لە پوچیداو لە ناڕاستیدا، هەردووانیان دژی ئایینی ڕاستی ئیسلامن.

ئەوەی ڕاستی بێ دوژمنایەتی جولەكەكان و بت پەرستان بوبون بەیەك بۆ دوژمنایەتی كردنی ئایینی ئیسلام و بۆ گەشەنەكردنی سروشی بانگەوازی ئایینی ئیسلام لە قورئاندا،

ڕژێمی کۆنی نێو دورگەی عەرەب دژی یاسای تازە هاتوی ئیسلام بوون، هەردوو ڕیژێمی جولەکەو بت پەرستان بەردەوام ڕاوەستابوون لەسەر بنچینەی پێش کەوتنی یەکتری و بۆ زۆرکردنی دارایی و سامان وبە بەندەکردنی ئادەمیزاد لە ڕێگەی تالآن و جەردەییەوە، لەسەر هێشتنەوەی دەستوری خراپی خۆیان بۆ خواردنی سوودو دەست برین و لەسەر ستەم و فێڵ و فڕبازی، ئەو جۆرە ڕژێمە خۆی ئەندواندو دەرئەکەوت لەسەر دەستی گەورە پیاوانی بت پەرستانی مەکە کە دەستیان گرتبوو بەسەر بازرگانی دەرووەدا، خۆیشی دەر ئەخست لەسەر دەستی جولەکەکانی مەدینە کە دەستیان گرتبوو بەسەر پیشەسازی بازرگانی ناوخۆدا، جاڕدان و بانگەوازی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ پڕ بە دەمی خۆی هاواری ئەکرد لەدژی هەردوو ڕژێمەکە.داوای دادپەروەری ئەکردو نەهێشتنی ستەم و ڕوتانەوە بە هەموو جۆرە بەشەکانیەوە، ڕێگەی ئەگرت لە چەوساندنەوەی جولەکەکان و بت پەرستان ڕاستەوخۆ، جا بەو بۆنەوە سوودی هەردوولایان کەوتە مەترسییەوە، بۆیە بوون بە هاوسوێندنی یەکتری و دوورخستنەوەی دانیشتوان لە ئایین و بیروباوەڕی ئیسلام، سوێندیان خوارد بۆ یەکتری و بوون بەیەك بۆ جەنگ کردن لەگەڵ پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾، بوون بە دوژمنی هاوبەش بۆ دژی موسڵمانان.

ئەوەی ئێمە نوسیومان چاکترین هەڵبژاردەیە بۆ مەبەست لەو ئایەتە، بە جۆری تر ڕونتر دوژمنایێتی جولەکەکان و بت پەرستان بۆ موسڵمانان مەبەستێکی جیهانیەو بەس. بەڵام جولەکەکان بە ناویی ئایینەوە بە دوو ڕویی ڕووالەت و بەرچاوی ئەیکەن. وێنەی ئەو ڕۆ زۆرترین لەو کەسانە خۆیان بە موسڵمان ناو ئەبەن بە ناوی ئاینەوە وە سامانی زۆر پەیدا ئەکەن. ئەگینا هەردوولای جولەکەو بت پەرستان هاوبەشن لە ڕەگەز پەرستی و گەلایێتی پەرستن. بەڵام بت پەرستان دڵ نرم و دەست کراوەترن لەبیرکردنەوەیان و سەربەستی گفتوگۆیاندا، بۆیە زۆربەی زۆری بت پەرستان باوەڕیان هێناوە بە پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾. جولەکەکان زۆر بە کەمی و بە دەگمەن باوەڕیان هێناوە.

﴿ وَلَتَجِدَنَ أَقْرَبَهُمْ مَوَدَةً للذِيْنَ أَمَنُوْا الذِيْنَ قالُوا إنا نَصارى ﴾ وەتـۆ بەڕاسـتی دەسـتت ئەکەوێ نزیکترین ئادەمیزاد لـە بارەی دۆستاییتەوە بۆ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە بـە ئایینی ئیسلام کەسانێکی ئەوتۆن ووتویانە: ئێمە گـاورین. ئـەوەیش زۆر ڕاسـتەو ئـەبینرێ گاورەکان لەو کاتەدا فەرمان بدەن بە چاوپۆشی و لێبوردن و لێ خۆشبوون لە یـەکتری و دۆستایەتی با لەگەڵ دوژمنی خۆیشانبێ، لـە دەسـت گـیرۆی کردنـی ئـادەمیزاد کـۆن و تازەیان پێچەوانەی جولەکەکانی ئەوکاتەو ئێستان. بەڵام گاورەکانی ئەم سـەردوەمەو بـت پەرستان لە کۆن و تازەداو لە هەموو کاتێکـاو بـەکرێ گیراوەکـان و شـاگردەکانی ئـەم سەردەمەیش خوو ڕەوشتی جولەکەکانیان گرتـووە بـۆ دوژمنـایێتی کردنـی موسـڵمانان و گەلانی بێ دەستەلات. خوای مەزن مەرجی ئەو نزیکونەوەی گاورەکان لە موسـڵمانانەوە بۆمان ڕون ئەکاتەوەو ئەفەرموێ:

﴿ ذلَكَ بِأنَ مِنهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْباناً ﴾ ئەو نزکـترین دۆسـتایێتیەی گاورەکـان بـە هـۆی ئەوەوە بووە بەڕاستی هەندێ لەوان زانابوون بە ئایینی عیساو نامـەکانی خۆیـان و ڕاست وێژبوون و پەیرەوانی خۆیانیان بەڕاستی پەروەردە نەکردو، هەیانبوو خوا پەرسـتیان ئـەکرد لە کلێسادا وازیان لە جیهان هێنابوو، ژنیان نەئەهێناو شویان نەئەکرد.

﴿ وَأَنَهُمْ لا يَسْتَكْبِرُونَ ﴾ وەئەو تاقمە بەڕاستی خۆیانیا بـە گـەورە دانەئـەنا لـە ئاستی ئایینی ئیسلامدا کاتێ ڕاستیان بۆ دەرکەوتایـە وەریـان ئـەگرت، وەك هـاوڕێ گۆیـان لـە دانیشتوان ئەگرت وێنەی، نەچاشی پاشای حەبەشە و زاناکانیان و خوا پەرسـتەکانیان. بـە پێچەوانە جولەکەکان و گاورەکانی ترو کار بەدەستەکانی ئەم سەردەمەی ئێمە.

هەندێ کەسانی سادە هەن ئەو ئایەتەی پێشەوەو ئایەتەکانی دووایی ئەکەن بە بەڵگە کە گوایە قورئان لایەنی هەندێ لە بێ باوەڕان ئەگرێ و دژی هەندێکیانە، ئەو کەسـانەی لـەم سەردەمەی ئێمەدا زۆرن. کەواتە پێویستە مانای ئەم چوار ئایەتەی دووایی بە جۆرێ بکەین ڕێگە لەو خۆفرۆشانە بگرێ لە ئایین لایانداوە.

بەڕاستی هەرکەسێ لەم چوار ئایەتە وورد ببێتەوە گومانی نامێنێ کە هەریەکێ لەو ئایەتانە تەواوکەری مانای یەکترین و سەربەخۆ نین لە مەبەست و ناوەڕۆکا، هەر چوار ئایەتەکە بە ئاشکرایی بۆمانی ڕون ئەکەنەوە کە خوای مەزن ڕێزی گاورەکانی نەگرتووە بە جۆرێکی گشتی.مەبەستی خوای گەورە بەو گاورانە هەندێکی مام ناوەندین لەکاتی ڕاستیدا دژی ناوەستن و وەری ئەگرن، وەك لە مانای ڕستەی پێشودا باسیان کرا، خوای مەزن بەڕونتر باسی ئەکاو ئەفەرموێ:

﴿ وَإِذا سَمِعُوا ما أُنْزِلَ إِلى الرَسُولِ تُرى أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مَنَ الدَمْعِ مِما عَرِفُوا مِنَ الْحَقِ ﴾ و هەرکاتێ بییان بیستایە شتێ نێرابوو بۆلای فروستادەی خوا ئەو زاناو خوا پەرستانە لە جەعفەری کوڕی ئەبی تالیب تۆ ئەبینی چاوەکانیان فرمێسك ئەڕێژن لەبەر شتێ زانیان لە ڕاستی کە بۆ تۆ نێرابووە خوارەوە لە قورئان، ئەوان کە بەو بەشە کەمە بیستیان باوەڕیان هێنا ئەگەر زۆرتریان ببیستایە باشتر باوەڕیان ئەهێناو ئەگریان.

﴿ يَقُولُونَ رَبَنا آمَنا فَاكْتُبْنا مَعَ الشّاهِدِينَ ﴾ ئەڵێن: ئەی پەروەردەکەری ئێمە باوەڕمان هێنا بە قورئان و بە موحەمەد لەبەر ئەو شتەی زانیمان لەنامەی خۆمان و لەبەر شتێ پێشوەکان بۆ ئێمەیان گێڕاوەتەوە کە پێغەمەرێ دێت، ئینجیلیش موژدەی داوە بە هاتنی و کاتی هاتنی هاتووە دوایی تۆ ئێمە بنوسە لەگەڵ کەسانێکی ئەو تۆ شایتی ئەدەن بە ڕاستی و بە پێغەمەرایەتی موحەمەد ﴿ ﷺ﴾ لەگەڵ کۆمەڵێ موسڵمانانادا تۆمارمان بکە.

مانای ئەو ئایەتە دەری ئەخا کە هەندێ لە گاورەکان ڕاستی ناسن، بۆیە چونە ناوی ئیسلام بەخواستی خۆیان و بە باوەڕەوە. مێژوو بۆی باسکردووین کەمێ بوون لە گاورەکان و نابێ بخەڵەتێین کە گاورەکان هەموویان ئیسلامیان خۆش ئەوێ، مێژوو بۆی باس کردووین کە کینەو ڕقی خاچ پەسرتان بۆ موسڵمانان و ئیسلام بۆ لەناوبردنیان و بنەبڕکردنیان نایەنە ژمارە، بۆ نموونە: پەلاماردانی زوربەی زۆری خاچ پەرستان بۆسەر فەلەستین و دوای بنەبڕکردنی دانیشتوانی ئەندەلوس، نالەباری و خوێن ڕێژی بەریتانیا لە قودس و میسرو عێراق و سودان و جگەی ئەوانیش، کوشتن و دارو فەلاقەی ئیتالیا لە

تەرابلوسی ڕۆژئاوا، کاری نارەواو ئازاردانی کاربەدەستانی فەرەنسا بۆ دانیشتوانی جەزائیرو تونس و مەراکیش و سوریا. ئەوانەو جێگاکانی تر نابنە ژمارە هەروەها جۆرج دەبڵ بۆشی سەرۆکی ئەمەریکا لە ٢٠٠١/٩/١٧ ووتی: ئێمە جەنگی سەلیبی دەست پێ ئەکەینە، هەرچەندە دووایی بە زمان نەك بەدڵ پەشیمان بویەوە. کەواتە ئەبێ بزانین ئەو گاورانە باوەڕیان بە ئایینی ئیسلام نەهێناوە دورترینی ئادەمیزادن لە خۆشەویستی موسڵمانانداا، بۆیە خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ وَمالَنا لا نُؤمِنُ بِاللهِ وَما جاءَنا مِنَ الْحَقِ ﴾ وەچ شتێکە ڕێگە بگرێ لە ئێمە باوەڕ نەیەرین بە خواو بەو شتەی هاتوە بۆلای ئێمە لە ڕاستی قورئان و پێغەمەرایێتی موحەمەد. دوای ئەوەی عیسا ڕونی کردەوە ئەو موژدە پێدراوە لەلایەن عسیاوە ئەم موحەمەدەیە.

﴿ وَنَطْمَعُ أنْ يُدْخِلَنا رَبُنا مَعَ الْقَوْمِ الصّالِحِينَ ﴾ وەئێمە بەتەماین کە پەروەردەکەری ئێمە بمان خاتە بەهەشت لەگەڵ پیاوچاکان و پەیڕەوانی موحەمەد کە دەرونیان پاك بۆتەوە لە خراپە بە هۆی وەرگرتنی ئایینی ئیسلامەوە.

﴿ فَأثابَهُمْ اللهُ بِما قالُوا جَنّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِها الأنْهارُ خالِدِينَ فِيها وَذلِكَ جَزاءُ الْمُحْسِنِينَ ﴾ دوایی خوا پاداشتیان ئەداتەوە بە هۆی ئەو شتەی ووتیان و باوەڕیان پێ کرد بە چەندین بەهەشت ئەڕوا بەژێر درختەکانیان و ئەم لاولای کۆشکەکانیان چەندین ڕوباری ئاوی پاك بەردەوامن لەنێو ئەو بەهەشتانەداو، ئەو بەهەشتانە پاداشتی چاکەکەرانە کە بیریان کردوەتەوە لە گەورەیی خواو ڕاستی شتێ هاتوەتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾.

شایێتی دانی خوا بۆ ئەو تاقمە کەمەی گاورەکان بەکاری چاکەکردنیان و پاداشت دانەوەیان بەبەهەشت لەسەر ئیسلامەتیان، هەروەها ئەو تاقمە بە تنها مەبەستی باسکردنیانە لەو ئایەتانەدا بە چاکەکرنیان و پاداشت دانەوەیان. بەڵام ئەو گاورانەی بڕوایان بە ڕاستی نەهێناوە دوای ئەوەی ڕاستیان بۆ دەرکەوت و ووازیان هێناوە پاش تەمەشاکردنی بەڵگەو نیشانەکانی خوا، ئەو کەسانە خوا هەڕەشەیان لێ ئەکاو ئەیان ترسێنێ و ئەفەرموێ:

﴿ وَالذيْنَ كَفَرُوا أو كَذّبُوا بِأياتِنا أوُلِكَ أصْحابُ الْجَحِيمِ ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە نیشانە ڕون و ئاشکراکانی ئێمە بە درۆئەخەنەوە، ئەو کەسانە دانیشتوی دۆزەخن و یاری ئاگرن.

پرسار/ ئەو ئایەتە هەموو کەسێ ئەگرێتەوە باوەڕ نەهێنن بە ئایینی ئیسلام و بە نیشانەکانی و بە درۆیان بخەنەوە، ئەبێ هۆی بەستنی ئەو ئایەتە بە گاورەکانەوە هۆی چ شتێ بێ؟

وەلآم/ بەڕاستی داڕژاندنی ئەو باسە کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خـوای مەزن پاش ئەوەی بەڵێنی داوە بەو کەسانە باوەڕیان هێناوە لە گاورەکان بە بەهەشت، هەرەشەش ئەکا لەو کەسانە بەردەوامن لەسەربێ باوەڕی لە گاورەکان، ئایەتەکە بە شێوەیەکی گشتی داڕژاوەو نەبەستراوە بە تاقمێکەوە هەتا هەموو بێ باوەڕان نەگرێتەوە. هەرچەندە پێشەوەشی باسی گاورەکانبێ.

کۆمەڵێ لە هاوڕێکانی پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ ترسی خـوا پەرەی سەند بەسەریاناو وای لێ کردن قەدەغە بکەن لە خۆمان ڕابواردن لەگەڵ ژنـەکانیان و خۆراکی خۆش نەخۆن و بەرگی چاك نەپۆشن و واز لە هەموو شتێکی جیهانی بهێنن، خۆیان خەریك بکەن بەشەو نوێژو ڕۆژوگرتن.

پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ بانگی کرد ئەم ئایەتانەی خوارەوەی بەسەردا خوێندنەوە، فەرمووی:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓاْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٨٧﴾ وَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلًا طَيِّبًا ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾

﴿ يا أَيُّها الَّذِيْنَ أمَنُوْا لا تُحَرِّمُوا طَيِّباتِ ما أَحَلَّ اللهُ لَكُمْ وَلا تَعْتَدُوا ﴾ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە ئێوە قەدەغە مەکەن لە خۆتان خواردەمنیە پاکەکانی شتێ خوا ڕەوای کردووە بۆ ئێوە خواردنیان و زۆر خۆریش مەکەن بە جۆرێ گەدەتان ئازاری پێ بگا، وە

ئێوە لە سنورە دیاریکراوەکانی خوا دەرمەچن و لە خواردەمەنی ڕەواوە بچن بۆلای قەدەغە کراوەکان زیادە خۆری بکەن.

﴿ إنّ الله لا يُحِبُ الْمُعْتَدِيْنَ ﴾ بەڕاستی خوا خۆشی ناوێ کەسانێ لە سنور دەربچن و خواردەمەنی پاك و خۆش نەخۆن، یا زیادە خۆری بکەن.

﴿ وَكُلُوا مِما رَزَقَكُمْ الله حَلالاً طَيباً واَتَقُوا الله الذي أنْتُمْ بِهِ مُؤْمِنِينَ ﴾ وەئێوە بخۆن هەندێ لەو شتانە خوا کردونی بە خواردەمەنی بۆ ئێوە بە خواردنێکی ڕەواو پاك و بەتام و، ئێوە بترسن لە خوایەکی ئەوتۆ ئێوە باوەڕتان بەو خوایە هێناوە، ئەو شتانە بۆی ڕەوا کردوون بۆ خواردنتان قەدەغەی مەکەن لە خۆتان و ڕایش بوێرن لەگەڵ ژنەکانتان بە گوێرەی یاسا، مانای ئەو ئایەتە لە ئایەتی (١٦٨)ی سورەتی ئەلبەقەرەدا مانای کراوە.

کاتێ ئەو دوو ئایەتەی پێشوو هاتە خوارەوە بۆ خواردنی خواردەمەنی پاك و ڕابواردن لەگەڵ ژنەکانیان، هاوڕێکانی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ووتیان: ئەی فروستادەی خوا: چ شتێ بکەین دەربارەی ئەو سوێندەی خواردوومانە نەچینە لای ژنەکانمان و خواردن و خواردنەوەی خۆش و پاك و بەتام نەخۆین، دوایی خوای وەڵامی دانەوەو فەرموی:

لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الْأَيْمَانَ ۖ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ ۚ ذَٰلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ ۚ وَاحْفَظُوا أَيْمَانَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٨٩﴾

﴿ لا يُؤاخِذُكُمْ اللهُ باللَغْوِ في أيْمانِكُمْ ﴾ خوا سزای ئێوە نادا لە جیهانداو گوناهتان ناگا و بریتی بۆ نادرێ بە هۆی گفتوگۆیەکتانەوە نیازی کردنی شتێ یا نەکردنی شتێکی تێدا نەبێ، وەك ئەوەی لە دەمی کەسێکەوە دەرئەچێ بەبێ نیازو ئەڵێ: نەبەخوا وانیە. بەخوا وایە، لای پێشەوا حەنەفیەوە سوێندی بێ نیاز ئەمەیە: سوێند بخورێ بە گوێرەی گومان و بڵێ: سوێند بەخوا فلاّن شت کراوە. یا بڵێ: فلاّن شت نەکراوە. بە گوێرەی گومانی خۆی، ئەو فەرمودەی حەنەفیە بیروبۆچونی هەندێکە لە زانایانی شافیعیەکان. مانای ئەو ڕستەیە لە ئایەتی (٢٢٥)ی سورەتی ئەلبەقەرە باسی کراوە.

﴿ وَلكِنْ يُؤْخِذُكُمْ بِما عَقَدْتُمْ الأيْمانَ ﴾ وەبەلاّم خوا سزای ئێوە ئەدا بەهۆی بەستنەوەی سوێندەکانتان بەدەم بیلێن و بە دڵ نیازی کردنی یا نەکردنی شتێ بکەن. ئەو کاتە دوای شکاندنی سوێندەکانتان سزاتان ئەدا لە جیهاندا بە داواکردنی بریتی دان.

﴿ فَكَفارَتُهُ إطْعامُ عَشَرَةِ مَساكينَ مِنْ أوْسَطِ ما تُطْعِمُونَ أهْلِيكُمْ ﴾ دوای بریتی دان بۆ شکاندنی سوێنەکانتان و لابردنی گوناهەکانتان: خواردەمەنی دانە بە (١٠) ە کەسی هەژار کە بریتی‌یە لە بەخشینی هەریەکە لەو (١٠) ە کەسە ئەندازەی (٥٨٣) گرام دانەوێڵە لە برنج و گەنم و جۆو خورماو ترێ. بەلای حەنەفیەکانەوە بریتی‌یە (١١٦٦) گرام، ئەو خواردەمەنیە لە مام ناوەندی شتێ ئێوە دەرخواردی خێزانەکانی خۆتانی ئەدەن بە زۆری ئەندازەی نرخەکەی نە زۆر گرانبێ و نە زۆریش کەمبێ.

﴿ أوْكِسْوَتُهُمْ أوْ تَحْرِيرُ يُراقَبَه ﴾ یا پۆشاکی (١٠)ە کەسی هەژار هەریەکەیان پارچە قوماشێ نێوان ناوك و ئەژنۆی داپۆشێ و نرخەکەی مام ناوەندبێ، بەجۆرێ نوێژ کردنی پێوە دروستبێ. بەلای هەندێ زانایانەوە ئەو پۆشاکە ئەبێ هەموو لەشی داپۆشێ. بەلای پێشەوا حەنەفییەوە لە جییاتی خواردەمەنی و پۆشاك نرخەکەیشیان دروستە.

یا ئازادکردنی بەندەیەکی موسڵمان و بێ عەیب، ئیتر نێر بێ یان مێ. لای پێشەوا حەنەفی بەندەی بێ باوەڕیش دروستە، ئێستا سوپاس بۆخوا بەندەنەماوە... سوێند خۆر بۆی هەیە بە ئارەزۆی خۆی یەکێ لە خواردەمەنی و پۆشاك و ئازادکردن هەڵبژێرێ.

﴿ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيامُ ثَلاثَةِ أيامٍ ﴾ دوایی هەرکەسێ دەرستی نەکەوت یەکێ لەو سیانە بۆ بریتی دان، دوایی سێ ڕۆژ گرتن لەسەر یەك بگرێ یا هەرماوەیە ڕۆژێ بگرێ، هەرچەندە بەلای هەندێ لە زانایانەوە پێویستە ئەو سێ ڕۆژوە لەسەر یەکبن.

﴿ ذلِكَ كَفارةُ أيْمانِكُمْ إذا حَلَفْتُمْ وَاحْفَظُوا أيْمانَكُمْ ﴾ ئەو چوار شتانە باسکران بریستی دانن بۆ سوێندەکانی ئێوەو لابردنی گوناە بەسەرتانەوە هەرکاتێ سوێندتان خواردو شکانتان، وەئێوە ئاگاداری سوێند خواردنی خۆتان بکەن و کەم سوێند بخۆن و بۆ هەموو شتێ سوێند مەخۆن، بە گوێرەی توانا هەتا بۆتان ئەلوێ سوێند مەخۆن، خوای مەزن مەکەن بە نیشانەو بۆ سوێندەکانتان.

﴿ كَذلِكَ يُبَيِّنَ اللهُ لَكُمْ أياتِهِ لَعَلَكُمْ تَشكُرُونَ ﴾ بەو جۆرەی باسکرا بۆ بریتی دانی سوێندەکانتان خوا ڕونی ئەکاتەوە بۆ ئێوە نیشانە ئاشکراکانی خۆی لە دیاری کردنی یاساو دەستور بۆ ئەوەی ئێوە سوپاسی خوا بکەن لەسەر ئەو میهرەبانیە خوا لەگەڵ ئێوەی کردووە لە ڕون کردنەوەی یاساو سنوری خۆی.

هەموو موسڵمانان پێك هاتوون لەسەر ئەوەی کە سوێند خواردن بە جگەی خواو ناوەکانی خواو قورئان دانا بەسترێ. بەلای پێشەوا حەنەفی بە قورئانیش دانابەسترێ.

سوێند بە پێغەمەران و دۆستانی خواو بەسەری باوك و جگەی ئەوانیش دانابەسترێ، چاکیش نیە لای یاسای ئیسلام، بریتشیان بۆ نادرێ. بەلای پیشە ئەحمەدەوە بە تەنها سوێند بە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ دائەبەسترێ. بەڵام دوای تەماشاکردنی نامەکانی حەنیەلیەکان ئەو بیروبۆچونەی ئەحمەدم دەست نەکەوت. خوا ئەیزانێ.

خوای مەزن لە بارەی خواردنەوەی (مەیدا) چوار ئایەتی ناردوەتە خوارەوە:

١- ئایەتی (وَمَنْ ثَمَراتِ النَخيْلَ وَالأعْنابِ تَتَخِذُونَ مِنْهُ سَكَراً وَرزْقاً حَسَناً ) یانێ وەلەبەرهەمەکانی خورماو ترێ ئێوە دروست ئەکەن و دەری ئەهێنن لەو بەرهەمانە شتێ ئادەمیزاد سەرخۆش ئەکا، وەك مەی، وەخواردەمەنیێکیچاك و خۆش، وەك خورماو دۆشاو

مێوژو سرکەو شتی تریش) سورەتی نەحل ئایەتی (٦٧)، ڕون و ئاشکرایە هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە لە کاتێکا بووە (مەی) خواردنەوە قەدەغە نەبووە.

٢- کاتێ عومەری خەتاب و مەعازی کوڕی جەبەل لە بارەی خواردنەوەی مەیی و کردنی قومارەوە پرسیاریان کرد لە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾: وەڵام لەلایەن خواوە هاتە خوارەوەو فەرموی:

﴿ قُلْ فِيهِما إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنافِعُ لِلنّاسِ ﴾ تۆ بڵێ: لەمەیی و قوماردا هەیە گوناهێکی گەورەو چەندین سوود بۆ ئادەمیزاد. لە دوای هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە زۆرکەس گوناهە گەورەکەیان ڕەچاو کردوو وازیان لێ هێنان. هەندێ تر تەماشای سودەکانیان ئەکردو وازیان لێ نەهێنان. سورەتی ئەلبەقەرە ئایەتی (٢٢٢).

٣- لە میوانداری عبدالرحمنی کوڕی عەوفدا هاورێکانی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ مەیان خواردەوە سەرخۆش بوون، کاتی نوێژی مەغریب هات یەکێ لەوان بۆ بە پێشەوای نوێژ لە نوێژەکەدا ووتی: ﴿ قُلْ يا أَيُّها الْكافِرُونَ أَعْبُدُ ما تَعْبُدُونَ ﴾ بە نەخوێندنەوەی پیتی (لا) بەو بۆنەوە ئایەتی (٤٣) ی سورەتی نیساء هاتە خوارەوە فەرموی﴿ لا تقربوا الصّلاة وأنتم سكارى﴾ یانێ ئێوە نزیك نوێژ کردن مەکەونەوە، وەئێوە سەرخۆش بن) هەندێ لە موسڵمانان وازیان نەهێنا لە خواردنەوەی مەی، بەر لە نوێژکردن بە ماوەیە کە سەرخۆشیەکەیان نەمێنێ مەیان ئەخواردەوە، بەبێ سەرخۆشی نوێژەکەیان ئەکرد.

٤- عەتبانی کوڕی مالیك میوانداری هەندێ لە موسڵمانانی کرد، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس یەکێ بوو لە میوانەکان، خواردەمەنیان خواردو مەیشیان خواردەوەو سەرخۆش بوون، لەکاتی سەرخۆشی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس دەستی کرد بە خۆهەڵکێشان و دەستی کرد بە جنێودان بە یاریدەرانی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ یەکێ لەوانیش دووشەویلەی هوشترە کولاوەکەی دا بەسەری سەعدداو سەری شکاند، دانیشتوان شڵەژان و ڕوداوەکەیان بردە خزمەت پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ئەوە لەلایەکەوە، لەلای ترەوە کە

خوای گەورە ئایەتی (٨٧–٨٨) ئەم سورەتەی ناردە خوارەوە بە موسڵمانانی ڕاگەیاند کە ئەو خواردەمەنیانە خوا بۆی ڕەوا کردوون خواردنیان لـە خۆیان قەدەغە نەکــەن و هـەموو خواردەمەنی پاك و ڕەوا بخۆن و بیخۆنەوە، مەیش یەکێ بوو لـەوانە پاك و ڕەوا بۆلایان لـەو کاتەدا خوای مەزن ڕونی کردەوە ئارەق پاك نیەو قەدەغەیەو فەرموی:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَٱحۡذَرُواْۚ فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿٩٢﴾ لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٞ فِيمَا طَعِمُوٓاْ إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّأَحۡسَنُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٩٣﴾

﴿ يا ايُها الذيْنَ أمَنُوا إنَما لَخمْرُ وَالْمَيْسِـرُ ﴾ ئـەی کەسـانێکی ئـەوتۆ باوەڕتـان هێنـاو بەڕاستی مەیی و قومار: (مەی) بریتیە لـە شتێ ئادەمیزاد سەرخۆش بکا، ئیتر هەر ناوێکیـان هەبێ، لـەترێ یا خورما یا گەنم یا جۆ یا لە شتێ تر دروست بکرێ. قومارکردن بە هـەموو جۆرەکانییەوە. بە کاغەزبێ یا شتێ تر، دۆمینەبێ یا تاوڵە یا هەشتێ تربێ و لـەسەر پارەبـێ.

لە ئایەتی (٢١٩) ی سورەتی ئەلبەقەرەدا ماناو مەبەست لەمەیی و قومار بەدرێژی باسـیان کراوە.

﴿ وَالأنْصابُ وَالأزْلامُ﴾ وەئەو بتانە هەڵواسراون بۆ ئەوەی پەرستنیان بۆ بکرێ، یـا بـە پیرۆز بزانرێن، هەموو شتێ تریش هەڵبواسرێن بۆ ڕێزگرتن و وابزانـرێ پیـت و فـەڕیان لێ ئەوەشێتەوە و بەکارهێنانی (ئەزلام) و، مانای ووشەی (ئەنساب و ئـەزلام) لـە ئایـەتی (٣) ئەم سورەتە باسی کراوە، ئـەتوانرێ تەماشـای بکـەن. ووشـەی (ئـەزلام) نامـە گرتنـەوەو خوێندنەوەی ناو لەپ و دانە گرتنەوەیشی ئەگرێتەوە.

﴿ رجْسٌ مِنْ عَمَلِ الْشَيْطانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ هەموو یەکێ لەوانە بەکارهێنان و کردنیان پیسن و بێز لێ کراوەن لە کارو کردەوەی شەیتانن و ئەیان ڕازێنێتەوە بۆ ئێـوە، دوای ئێوە دوور بکەونەوە لەو شتە پیسەو نزیکیان مەکەونەوە، بۆ ئەوەی ئێـوە ڕزگارتـان ببێ لە خراپەی جیهان و ڕزگابن لە سزای پاشە ڕۆژ.

﴿ إنَما يُرِيدُ الْشَيْطانَ أنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمْ الْعَداوة وَالْبَغْضاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسَـرِ ﴾ بەڕاستی شەیتان ئەیەوێ دوژمنایەتی و ڕق و کینە بخاتە نێوان ئێوەو بیکاتە هـۆی بچڕانـی شـیرازەی دۆستایەتی و کۆمەڵایەتی و خزمایەتی ئێوە لەژیانی ئـەمڕۆتان بـە خواردنـەوەی ئارەقـەوە، چونکە ئادەمیزاد کە سەرخۆشبوو زمان درێژ ئەکا بە گفتوگۆی پیـس و ناپەسـەند، توشـی جمو جوڵی کاری ناڕەوای ئەکا، زۆرجاران سەرئەکێشێ بۆلای ئاژاوەو جەنگ لە نێوانتان، وایش ئەبێ تووشی داوێن پیسی و دزی کردنتان ئـەکاو شـتی تـری خـراپ و، بـە هـۆی کردنی قومارەوە، چونکە ئەو کەسە بیدۆڕێنێ ڕق و کینە پەیدا ئەکا لەو کەسەی بیباتـەوە، وایش ئەبێ دەست درێژی بکاتە سەر دانیشـتوان دەسـت ئـەکا بـە دزی کردنـی دارایـی ئادەمیزادو دزی ئەو شتانە میری داویەتیە بە دەستی، بەو بۆنـەوە موچەکـەی ئـەبڕن و بـە کەلەبچەی ئەی بەن بۆ گرتوخانە، زۆر جارانیش خۆی ئـەکوژێ، خێزانەکەیشـی تووشـی هەژاری و دەربەدەری ئەکا. لە هەموو شتێ حرابتر ئەوەیە کەمەیی و قومـار ئـەو کەسـانە

ئەیکەن ئەیانخاتە چالّی گوناهەوەو پەرستنی خوایان لەبیر ئەباتەوە وەك خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللهِ وَعَنِ الصَّلاةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ ﴾ وەبەکارهێنانی ئارەق و قومار ئێوە لائەدەن لە پەرستن و یادی خواو لە کردنی نوێژ یا لە کردنی لە کاتی خۆیا، دوایی ئایا ئێوە کۆتایی ئەهێنن لە بەکارهێنانی مەیی و قومار و لەسەر گەردانی خۆتان و یاخی بونتان لە ئاستی فەرمانەکانی خواو دەرچون لە پەرستنی خوا. یانێ پێویستە ئیتر ئێوە وازیان لێ بهێنن و بەکاریان نەهێنن. چونکە ئارەق خۆر ئەقلّی نامێنێ و ناتوانێ پێویستی سەرشانی خۆی جێبەجێ بهێنێ، ڕوئەکاتە ڕابواردن و هەواو هەوەسی خۆی، ئەگەر بییەوێ نوێژ بکا بەگوێرەی یاسای دیاری کراو بۆی ناکرێ. قومارچیش هەموو ئەندامەکانی ئەخاتە کارەوە بۆ یاری کردنی قومارو بەدەست هێنانی قازانج و نەدۆڕانی پارەکەی، ئەگەر بردیەوە لە خۆی بایی ئەبێ و واز لە کارکردن دێنێ، ئەگەر دۆڕانی توشی خەفەت و پەرێشانی ئەبێ، بیر لە فێلّی ئەکاتەوە بۆبەسەر گرتنەوەی دۆڕاوەکەی، بەهەر چۆنێ بێ بیر لە خواو لەنوێژکردن ناکاتەوە، ئەگەر هەولّی کردنیان بدا ئاگای لە نوێژەکەی نابێ و بیر لە دۆڕاوی پارەکەی ئەکاتەوە.

دوای هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتانە موسلّمانان بەیەکجاری ووتیان وازمان هێناو کۆتاییمان بەکارهێنانی مەی و قورما هێنا. دوایی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بە جارچی خۆی جاڕیدا بە کۆلّانەکانی مەدینەدا بلّێ: ئاگاداربن مەی قەدەغە کراوە، دانیشتوان دەستیان کرد بە شکاندنی کوپەکانیان و ڕژاندنی مەیەکان، بەجۆرێ ئەو مەیە بە کۆلّانەکاندا ئەڕۆیشت.

خوای مەزن فەرمانی بە قەدەغەکردنی مەیی و قومار بتەوترئەکا و ئەفەرموێ:

﴿ وَأَطِيعُوا اللهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَاحْذَرُوا ﴾ وەئێوە پەیڕەوی فەرمانەکانی خوا بکەن و ، پەیڕەوی فەرمودەکانی پێغەمەر بکەن. بە وازهێنانتان لە خواردنی مەیی و کردنی و هەموو قەدەغەکراوەکانی ترو. بترسن لەسەر پێچی کردنی فەمانی خواو پێغەمەر، لەو شتانەیش توشتان ئەبێ لە سزای خوا لە کاتی بێ فەرمانی کردنتان.

﴿ فَإنْ تَوَلَّيْتُمْ فَاعْلَمُوا أنما عَلَى رَسُولِنا الْبَلاغُ الْمُبِينُ ﴾ دوایی ئەگەر ئێوە پشت بکەنە فەرمانی خواو پێغەمەری خوا، بە تایبەتی مەی خواردنەوەو قومارکردن، دوایی ئێوە بزانن بە ڕاستی لەسەر فروستادەی ئێمەیە ڕاگەیاندنی ئاشکرا کە فەرمانەکانی ئێمە بە ئێوە ڕابگەیەنێ. پشت تێ کردنی ئێوە زیان بە فروستادەی ئێمە ناگەیەنێ و زیان لە خۆتان ئەدەن، ئێمە ئەزانین بە ئێوەی ڕائەگەیەنێ و ئێوەش بیانوتان نامێنێ.

زانایان پێك هاتوون لەسەر ئەوەی کاتێ قەدەغەکردنی خواردنەوەی مەی هاتەخوارەوە هەندێ لە هاوڕێکانی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ ووتیان: ئەو کەسانەی بەرای ئێمە بوون ئارەقیان خواردوەتەوە بەر لە قەدەغەکردنی و ئێستا مردوون خوای مەزن چ شتێکیان لێ ئەکا؟ بۆ وەڵامدانەوەیان ئەم ئایەتە هاتەخوارەوەو فەرموی:

لَيْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوٓا۟ إِذَا مَا ٱتَّقَوا۟ وَّءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ثُمَّ ٱتَّقَوا۟ وَّءَامَنُوا۟ ثُمَّ ٱتَّقَوا۟ وَّأَحْسَنُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٩٣﴾

﴿ لَيْسَ عَلَى الذيْنَ أمَنُوا وعَمِلُوا الْصالِحاتِ جُناحٌ فِيما طَعِمُوا ﴾ لەسەرئەو کەسانە نیە باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردووە هیچ گوناهێ لە شتێکا خواردویانەو قەدەغە نەکرابوو لەسەریان و مردوون و ئەوانەیش زیندوون و ئارەقیان خواردەوەتەوە بەر لە قەدەغەکردنی.

﴿ إذا ما أتَقُوْا وَأمَنُوا وَعَمِلُوا الصّالِحاتِ ﴾ کاتێ خۆیانیان پاراستبێ لە هاوبەشدانان بۆ خواو لە خواردنەوەی مەی و دوای قەدەغەکردنیان، بڕوایشیان هێنابێ و

بەردەوامیشبووبن لەسەری لە دەرونی خۆیاناو، کردەوە چاکەکانیانکردبێ دوای باوەڕهێنانیان.

﴿ ثُمَّ اتَّقَوا وَآمَنُوا ﴾ لە پاشان خۆیانیان پارستبێ لە هەموو قەدەغەکراوێ بە بەردەوامی و باوەڕیان هێنابێ بە نیازی پاکەوە کە ئەوانە قەدەغەکراون جێگەی خۆیەتی.

﴿ ثُمَّ اتَّقَوْا وأحْسَنُوا وَاللهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِيْنَ ﴾ لە پاشا خۆیان پارستبێ لە هەموو گوناهێ بەبەردەوامی و چاکەیان کردبێ لەنێو خۆیان و خوادا بە نهێنی و، خوا خۆشی ئەوێ چاکەکەران و لە دوا ڕۆژدا سزایان نادا.

خاوەنی تەفسیری (مجمع البیان) ئەڵێ: مەبەست لە خۆپارستنی یەکەم لەو ئایەتەدا خۆپاراستنە لە خواردنەوەی مەی دوای قەدەغەکردنی، مەبەست لە خۆپاراستنی دوهەم بەردەوامیە لەسەر نەخواردنەوە. مەبەست لە خۆپاراستنی سێهەم خۆپاراستنە لە هەموو گوناهێ و چاکەیش بکا.. ئەوەی شایانی باسبێ ئەمەیە:

ئادەمیزای موسڵمانی ڕاست، ئەبێ خۆپارێزبێ لە هەموو خراپەیە لە هەموو کاتێکداو لە هەموو بەسەرهاتیا، لە تەمەنی لاوی و مام ناوەندی و پیریدا، لەکاتی خۆشی و تریشدا، بە ڕاستی هەرکەسێ مردبێ با بمرێ و بەو شێوانە بن پاشە ڕۆژی لە ئاسایش و بێ مەترسیدایە لە ساڵی (ئەلحودەی بیە) شەش هەمین ساڵی کۆچی فروستادەی خوا فەرمانی دا بە موسڵمانان بۆ حەج کردن، دوای لە سەرەتای مانگی زیلقەعدەدا، چونە دەرەوە بۆ ئەو مەبەستە، هاوڕێ کۆچکەران و یاریدەران ئامادەی ئەو چونە دەرەوە بوون بریتی بوون لەوان و بە عەرەبەکانی تر، ئەندازەیان هەزارو چوار کەسبوون، کاتێ گەیشتنە گوندی زولحولەیفە کە حەوت میل لە مەدینەوە دوورە بەرگێیان پۆشی بە حەج و کەوتنە ڕۆیشتن، تاقم تاق م و پۆل پۆل گییان لەبەری کێوی و باڵندەیان توشبوو، ئەتوانرا بە هەموو شێوەیە بیان گرن و نێچیریان بکەن، بۆ ڕون کردنەوەی فەرماندان بۆ ئەو مەبەستە خوا فەرموی:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَيَبۡلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلصَّيۡدِ تَنَالُهُۥٓ أَيۡدِيكُمۡ وَرِمَاحُكُمۡ لِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٩٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡتُلُواْ ٱلصَّيۡدَ وَأَنتُمۡ حُرُمٞۚ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآءٞ مِّثۡلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ يَحۡكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ هَدۡيَۢا بَٰلِغَ ٱلۡكَعۡبَةِ أَوۡ كَفَّٰرَةٞ طَعَامُ مَسَٰكِينَ أَوۡ عَدۡلُ ذَٰلِكَ صِيَامٗا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمۡرِهِۦۗ عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَۚ وَمَنۡ عَادَ فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنۡهُۚ وَٱللَّهُ عَزِيزٞ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٩٥﴾ أُحِلَّ لَكُمۡ صَيۡدُ ٱلۡبَحۡرِ وَطَعَامُهُۥ مَتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِلسَّيَّارَةِۖ وَحُرِّمَ عَلَيۡكُمۡ صَيۡدُ ٱلۡبَرِّ مَا دُمۡتُمۡ حُرُمٗاۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴿٩٦﴾

﴿ يا ايُها الذيْنَ آمَنُوا لِيَبْلُوَنّكُمْ الله بِشَيءٍ مِنَ الْصَيْدَ تُناله أيْدِيكُمْ وَرماحُكُمْ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە بەڕاستی خوا ئێوە تاقی ئەکاتەوە بەشتێ لە نێچیرەکان و گیباندارانی کێوی کە توشی ئێوە ئەبن دەستتان ئەگا بەو نێچیرانە نزیکتان بن یا منالّبن و بێچولەبوون ئەتان توانی بیان گرن، وەڕمەکانتان پێیانْ ئەگەن ئەگەر دوربن و گەورەبن و بیان کوژن وەك کەرە کێوییەکان.

﴿ لِيَعْلَمَ اللهُ مَنْ يَخافُهُ بِالْغَيْبِ ﴾ بۆ ئەوەی خوا بزانێ بە کەسێ لەخوا ئەترسێ لە نهێنیدا بە خۆگەڕانەوە لە گرتنی نێچیرەکان بە گشتی.

﴿ فَمَنْ أعْتَدى بَعْدَ ذلِكَ فَلَهُ عَذابٌ أليمٌ ﴾ دوایی هەرکەسێ لە سنور دەربچێ ڕاوی گیاندارانی کێوی بکا پاش ئەوەی خوا ئەیەوێ تاقییان بکاتەوە لە ڕاوکردنی گیاندارانی کێوی، دوایی بۆ ئەو کەسە هەیە سزایەکی ئازاردەر.......

بەڕاستی خوا بەندەی خۆی تاقی ناکاتەوە بۆ ئەوەی شتێ بزانێ کە نایزانێ بەو تاقی کردنەوەیە خوای مەزن مرۆڤ چاکتر ئەناسێ لە خۆی. بەڵام ئەو تاقیکردنەوەیە لەبەر ئەمانەیە:

١- بۆ ئەوەیە بەندەکانی خۆی ئەوەی لە دەرونیانا داپۆشراوە دەری بخەن و دانیشتوان ببینن و، چونکە خوای مەزن سزای ئادەمیزاد نادا لەسەر شاراوەی دەرونیان هەتا لەوا پەیدا نەبێ.

٢- لەبەر ئەوەیە چاك و پیس جوێ ببنەوەو ناوەڕۆکی دەرون لەبەردەم ئادەمیزادا ئاشکرا بێ، دوای مامەڵەی لەگەڵ بکرێ بە جۆرێ شایستەی ئەو کەسەبێ.

٣- زۆر کەس لە ئادەمیزاد خۆیان بەڕاستی ناناسن و ئەڵێن: ئەگەر ئێمە بۆمان بلوێ کاری چاك ئەکەین، دوایی خوا توانایان ئەداتێ و لە پەیمانی خۆیان پەشیمان ئەبنەوەو خۆیانیان بۆ دەرئەکەوێ.

بەو فەرماندانانەی پێشوو خوا لەو ئایەتەدا ڕوی پێ کردوە بۆلای موسڵمانان، ئەو ڕاوداوەیان بیرئەخاتەوە کەبەنی ئیسرائیلیەکان داوایان لە موسا کرد ڕۆژێکیان بۆ دیاری بکا کە پشوی تێدا بدەن و پەرستنی تێدا بکەن، خوای مەزن ڕۆژی شەمەی بۆ دیاری کردن و پەیمانی لێ وەرگرتن جگە لە خوا پەرستی شتی کاری جهانی تێدا نەکەن. بەو بۆنەوە ماسیەکان لە ڕۆژی شەمەدا بە زۆری دەرئەکەوتن و بە چاو ئەبینران لەنێو ئاودا، بە کۆتایی ڕۆژی شەمە وون ئەبون هەتا شەمەیەتر، جولەکەکان فێڵێکیان سازاندوە

ماسیەکانیان لە دوای ڕۆژی شەممە ئەگرت و پەیمانەکەیان شکاند. کەواتە موسڵمانان ئێـوە فێڵ مەسازێنن و ڕاوی کیانداری کێوی بکەن و وەك جولەکەکان، بۆیە ئەفەرموێ:

﴿ یاأَیها الذینَ آمَنُوا لا تَقْتُلُوا الصَّیْدَ وَأَنْتُـمْ حُـرُمٌ ﴾ ئـەی کەسـانێکی ئـەوتۆ باوەڕتـان هێناوە: ئێوە نێچیرەکان مەکوژن با کرابیشن  بەماڵی وەك قـازو مـراوی و کەروێشـك و ئێوە ئیحرامتان بەستبێ بە حەج یا بە عەمرەو ئیتر گەیشتبنە کەعبە یان لە دەوری کەعبەبن. بەمەرجێ ئەو نێچیرە گۆشتی بخورێ. بـەڵام لای حەنەفیـەکان ئـەڵێن هـەموو گیـانداریکی کێوی ئەگرێتەوە گۆشتی بخورێ یانــە؟ لای هـەموو زانایـان مـاروو دوپشـك و مشـك و کۆلارەو سەگی نهێن گرو قەلەڕەش  کوشتنیان دروستە لە ئیحرام و لە شاری مەکەیشدا.

بۆ زانین: سنوری شارەوانی مەکە لە باکورەوە (التنعیم) شەش کیلۆمـەتر لـە مەکـەوە دورە لە باشورەوە (أرضاه) دوازدە کیلۆمەتر لە مەکەوە دورە. لە ڕۆژئـاواوە (الجعرانـە) پازدە کیلۆمەتر لە مەکەوە دورە.

﴿ وَمَنْ قَتَلَهُ مِنكُمْ مُتَعَمِداً فَجَـزاءٌ مِثْـلُ مـا قَتَـلَ مِـنَ النَعَـمِ ﴾ وە هەرکەسـێ لـە ئێـوە کوشتبێتی لە ئێوە نێچیرێ بە دەستیان قەست و بزانێ لە ئیحرامدایە و قەدەغەیـە کوشـتنی نێچیر، دوایی پێویستە لە سەر ئەو کەسە تۆڵە و پاداشتێ وێنەی شتێ‌بێ کوشتبێتی لە چوار پێکان وەك حوشتر و بزن و مەڕو گا.

﴿ یَحْکُمُ بِهِ ذَوا عَدْلٍ مِنکُمْ هَدْیاً بالِغَ الْکَعْبَةِ ﴾ فەرمان بدەن بەو پاداشـتە دوو پیـاوی دادپەروەر لە ئێوەی موسڵمان و بڕیار بدەن کە ئەو گیان لەبـەر کـراوە بـە تۆڵـە وێنـەی کوژراوە کە بە ئەو تۆڵ و دیاریە بگەیەنرێتە کەعبە لەوێ سەرییبڕن و بیبەخشـنەوە بەسـەر هەژرانی کەعبەدا. ئەمانەش هەندێکن لە وێنەی کوژراوەکە: هوشـتر مـورغ پاداشـتەکەی هوشترە. گای کێویی و کەری کێوی پاداشتەکانیان گایەکە. ئاسك پاداشـتەکەی بزنێکـە. کەروێشك پاداشتەکەی کارژەلەی بزنە بەشی کراوەیی ئەو پاداشتانە لە نامە یاسـاییەکاندا باسکراون.

﴿ أَوْ كَفارَةُ طَعامُ مَساكِينَ أَوْ عَدْلُ ذلِكَ صِياماً ﴾ یا پێویستە لەسەری بریتی بدا بۆ ئەو کوژراوە کە خواردەمەنیە بدرێ بە هەژاران لە خواردەمەنی زۆربەی دانیشتوان بە ئەندازەی نرخی کوژراوەکە و بدرێ بە هەر هەژارێ(٨٠٠)گرام خواردەمەنی. یا وێنە و بەرانبەری ئەو خواردەمەنییە ڕۆژوگرتن، لە جیاتی هەر(٨٠٠)گرامێ ڕۆژێ بە ڕۆژوبێ. بە کورتی ئەو کەسەی گیان لەبەرێکی کێویی بکوژێ لە کاتی ئیحرامدا یا لە مەکە پێویستە لەسەری بەکێ لەو شتانە بکا:{١} وێنەی کوژراوەکە لە گیان لەبەری ناوخۆ، {٢} خواردەمەنی دان بە هەژاران بە ئەندازەی نرخی وێنەی کوژراوەکە.{٣} ڕۆژو گرتن بەو جۆرەی باسکران. ئەو کەسە سەربەستە لە کردنی یەکێ لەو شتانە.

﴿ لِيَذُوقَ وَبالَ أَمْرِهِ عَفا اللهُ عَما سَلَفَ ﴾ لەبەرئەوەی ئەو کەسە بچێژێ قورسایی و گرانی کارەکەی خۆی کە کوشتنی گیاندارێکی کێویە، خوا خۆشبووە لەو شتەی ڕابوردوە و ئێوە کردوتانە بەر لە قەدەغە کردنی کوشتنی گیاندارانی کێوی لە کاتی ئیحرامدا.

﴿ وَمَنْ عادَ فَيَنْتَقِمُ اللهُ مِنهُ وَاللهُ عَزِيزٌ ذُوا إِنْتِقامٍ ﴾ وە هەرکەسێ بگەڕێتەوە جارێ تر بۆ لای کوشتنی گیاندارانی کێویی لە کاتی ئیحرامدا، دوای خوا تۆڵەی لیێ ئەستێنێ و سزای گرانی ئەدا لە پاشە ڕۆژدا و خوا زۆر بە دەسەڵاتە خاوەنی تۆڵە کردنەوەیە لەو کەسانەی بەردەوامن لەسەر گوناه کردن.

﴿ أُحِلَ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ وَطَعامُهُ مَتاعاً لَكُمْ وَلِلسَيارَةِ ﴾ ڕەوا کراوە بۆ ئێوە گرتنی نێچیرەکانی دەریا و ئاوەکانی تردا بە جۆرێ بن لە نێو ئاودا نەبێ نەژین، ئیتر بە هەر جۆرێ بن. بەلای پێشەوا حەنەفی جگە لە لە ماسی و ئەوانەی وێنەیان گۆشتی ئەخورێ لە وشکانییدا ڕەوا نیین گرتنیان، وە ڕوایە خواردەمەنی‌یە دەریا فڕەی ئەدا لە ماسی و جگەی ماسی، ڕەوا کراون لەبەر ژیان و مانەوەی ئێوەی دانیشتوو لە نیشتیمانی خۆتانا، بۆ ئەوانەیش کاروانین و بە برژاوی بیکەن بە توێشوی خۆیان و هەڵی گرن و لەگەڵ خۆیانا ببەن.

﴿ وَحُرِمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ الْبَرِ مادُمْتُمْ حُرُماً وَاتَّقُوا اللهَ الذي إلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴾ وە قەدەغە کراوە لەسەر ئێوە نێچیرکردنی گیاندارانی کێوی و سەر زەویی ئەو کاتەی ئێوە لە ئیحرامدان بۆ حەج و عەمرە بۆ زانیین:زانایان بیریان جیاوازە لە خواردنی گۆشتی نێچیر بۆ ئەو کەسانەی لە ئیحرامدان تاقمێکیان لایان وایە خواردنی دروست نییە هیچ شێوەیە. هەندێکیان دەڵێن زۆربەی زانایان لایان وایە دروستە خواردنی بۆ ئەوانەی لە ئیحرامدان ئەگەر خۆی نەیگرێ و بۆ ئەو نێچیر نەکرێ نە بە ئیشارە و نە بە یاریدانی و ئێوە بترسن لە خوایەکی ئەوتۆ بۆلای ئەو کۆ ئەکرێنەوە لە پاشە ڕۆژدا، تۆڵە و پاداشتی کردەوەکانتان ئەداتێ.

جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلْكَعْبَةَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ قِيَٰمًا لِّلنَّاسِ وَٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ وَٱلْهَدْىَ وَٱلْقَلَٰٓئِدَ ذَٰلِكَ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٩٧﴾ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ وَأَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩٨﴾ مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴿٩٩﴾

﴿ جَعَلَ اللهُ الْبَيْتَ الْحَرامَ قياماً لِلناسِ ﴾ خوا کەعبەی کردووە کە خانەی ڕێزدارە بە جێگەی پەرستن و بە دروشم بۆ بەجێ هێنانی حەج و عەمرە و بەبەرزکردنەوەی ئاین بۆ ئادەمیزاد یانێ کەعبە هۆی بوژاندنەوەی ئادەمیزادە لە هەردوو جیهاندا. هەموو کار و فرمانیان بە بۆنەی کەعبەوە دەچێت بە ڕێوە لە هەموو ڕویەکەوە بۆ بازرگانی و قازانجیان،

لە کاتی ترسدا پەنای بۆ ئەبەن، هەژار و ساماندار و دەسەڵاتدار لە نێویدا ئەحەسێتەوە و کەس دەستیان بۆ درێژناکا. جێگەی کۆبونەوەی گشتییە بۆ موسڵمانان بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتیان، مانای{کعبە} بە مانا بەرزاییە.

﴿ وَالْشَهْرَ الْحَرامَ وَالْهَدْىَ وَالْقَلائِدَ ﴾ و خوا کردویەتی ئەو مانگە بەرێزە و ئەو دیارییە ئەبرێتە کەعبە و ئەو چوار پێیانە کراوەتە ملیان نیشانەیەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بۆ کەعبە ئەبرێ، خوا ئەوانەی هەمووی گێراوە بە جێگای سوود و قازانج بۆ ئادەمیزاد، و کات و دروشمی پەرستن.

بۆ زانیین: ئەو مانگانەی بەرێزن و نابێ جەنگیان تێدا بکرێ چوار مانگن. موحەرەم، رەجەب، زیلقعدە، زیلحجە. بە تایبەتی مانگی زیل حیجە کاتی بەجێهێنانی حەج و عەمرەیە و لە دەشتی عەرەفەدا موسڵمانان وەك یەك خێزان کۆئەبنەوە لۆ پەرستنی خودا بۆ پتەوکردنی نێوانیان و بۆ نەهێشتنی ناکۆکی خۆیان، سامان و دارایی زۆر ئەبەن و ئەیدەن بە هەژارانی ئەو جێگەیە.

﴿ ذٰلِكَ لِتَعْلَمُوْا أنَ اللهَ يَعْلَمُ ما في الْسَمواتِ وَما في الآرْضِ وَأنَ اللهَ بِكُلِ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾ ئەو گەڕاندنەوەی خوایە بۆ ڕێزداری کەعبە و ئەوانی تر بە دیاری بۆ کەعبە و ئەوانی تر بە دیاری بۆ کەعبە لەبەر ئەوەیە ئێوە بزانن بە ڕاستی خوا ئەزانێ بە شتێ لە ئاسمانەکان و لە زەوییدا، بۆ ئەوەی ئێوە بزانن بە ڕاستی خوا بە هەموو شتێ دەزانێ. ئیتر چۆن شتێ لە ئاسمانەکان و زەویدان نایانزانێ؟ هیچ شتێکی لیێ پەنهان نەبووە پەنهانیش نابێ.

ئێمە لە فەرموودەی خواوە بۆ ڕێزگرتنی کەعبەو بۆ مانگە ڕێزدارەکان و فەرماندانی خوا کە لە کاتی کردنی حەج و عەمرەو لەنێو شارەوانی کەعبەدا ئەبێ. دەست درێژی نەکرێنە سەر هیچ گیانداری ئیتر ئادەمیزادبێ یا جگەی ئادەمیزاد، ئەممان بۆ دەرئەکەوێ کە ئەو کاتانەو ئەو جێگانە خوا کردونی بە جێگەی پاراستنی گیانداران (المحمیە)، هەروەها پێغەمەریش ﴿ ﷺ﴾ مەدینەو شارەوانی مەدینەی کردوە بە جێگەی پاراستنی

گییانداران. ئەوەتە ڕژێمەکان لە ئاینی ئیسلامەوە فێربوون و پێك هاتوون لەنێو خۆیانا کە هەندێ لە شارەکان ناوچەیەکی بێ لایەنی، دروست نەبێ بۆ ئەو ڕژێمانە ناکۆکن لە نێوان خۆیانا ئەو شارانە بکەن بە هاوبەشی خۆیان بۆ سوێندی سەربازی، جێگەکان کە بە بارەگای بنکەی جەنگی و سەربازە شەڕ کەرەکانیان هاتوچۆی پێدانەکەن و ڕژێمە ناکۆکان بیانکەن بە جێگە بۆ دانیشتنیان بۆ نەمانی ئاژاوەو جەنگ.

﴿ اعْلَمُوا أَنَّ اللهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ وَأَنَّ اللهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ بە ڕاستی ئێوە بزانن کە خوا سزای بۆ کەسانێ هەتکی جێگە ڕێزدارو کاتە بەڕێزەکان بکاو بەردەوامبێ لەسەری وازنەیەرێ و، ئێوە بزانن بە ڕاستی خوا خۆش ئەبێ لە گوناهی کەسێ بە گەورە دابنێ درۆشمە گەورەکان و میهرەبان و خاوەن بەزەییە بۆ تاوانبارێ پەنا ببا بۆ لای ئەو شارە ڕێزدارە.

﴿ ما عَلَى الرَّسُولِ إِلاَّ الْبَلاغُ ﴾ نیە لەسەر نێرراوی خوا جگەی ڕاگەیاندنی فەرمانەکانی خوا بە ئادەمیزاد هەتا بیانویان نەمێنێ، جگەی ئەوان داوای هیچ شتێ تری لێ ناکرێ.

﴿ وَاللهُ يَعْلَمُ ما تُبْدُونَ وَما تَكْتُمُونَ ﴾ وە خوا ئەزانێ بەشتێ ئێوە دەری ئەبڕن و بەشتێ پەنهابێ ئەدەن لە دەرونی خۆتانا لەبێ باوەڕی و لە بەدرۆخستنەوەی پێغەمەر پەنهانیان ئەدەن.

کاتێ خوای مەزن ڕونی کردەوە ئەو شتانەی ڕەوان و ئەو شتانەی قەدەغەن، بۆیشمانی ڕون ئەکاتەوە ئەو کارە نارەو پەسەندانە وەك یەك نین و لەیەك ناچن، ئەفەرموێ:

قُل لَّا يَسْتَوِي ٱلْخَبِيثُ وَٱلطَّيِّبُ وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ ٱلْخَبِيثِ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٠٠﴾

﴿ قُلْ لا يَسْتَوي الخَبيثُ والطَّيبُ وَلَوْ أعْجَبَكَ كَثْرَةُ الْخَبِيثُ ﴾ تۆ بلێ: وەك یەك نین و یەکسان نین لای خوا کارە خراپ و قەدەغە کراوەکان و کارە ڕەواو پاکەکان، موسڵمان و بێ باوەڕان لە پلەو پایەداو، ئەگەرچی تۆ خۆشحاڵ بکا زۆر شتی پیس و خراپ و قەدەغە کراوەکان. تۆ هەر پاك هەڵبژێرە بۆ خۆت با کەمیشبێ و ڕێزی بدە بەسەر شتی خراپدا با زۆریشبێ، جەنگ سازێن و ئاشتی خواز یەکسان نین. دارایی پلەو پایەی خراپ نرخی بۆ دانانرێ لای خواو ئەبنە هۆی قورس لە سەر خاوەنەکانیان.

ئەو ئایەتە لەوەوە هاتوەتە خوارەوە کە پیاوێ پرسی لە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ من دارایی زۆرم کۆکردۆتەوە بە بازرگانی و کڕین و فرۆشتنی ئارەق، ئایا لە پەرستنی خوادا بەکار بێنم سوود بەخشە، پێغەمەر فەرموی: ئەگەر حەج و جەنگیشی پێ بکەی لەبەر خوا سوودی باڵە مێشولەیەکی نیە.

﴿ فاتَّقُوا اللهَ يا أُولِي الألْبابِ لَعَلَكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ دوایی ئێوە لە خوا بترسن و پەلاماری کاری چاك بدەن خۆتان بپارێزن لە قەدەغە کراوەکان، ئەی کەسانێ ئێوە خاوەنی عەقڵن، بۆئەوەی ڕزگارتان بێ لە ئازاری هەردوو جیهان.

پرسیار/ دارایی پیس کە لەلای خوا بێزی لێ ئەکرێتەوە، سامانی پاك خوا لای چاکەو خۆشی ئەوێ، ئەبێ هۆی چ شتێ بێ ئادەمیزادی خراپ سەر ئەکەوێ پلەو پایەی بەرزو دارایی زۆری دەست ئەکەوێ و، مرۆڤی پاك زۆرجاران هەژارو نەدارایە؟

وەڵام/ ژیانی جیهان و ئەم ڕۆژە دەستورو یاسایەکی تایبەتی دراوەتێ لەلای خواو ئەبێ پەیڕەویان بکرێ، لە هیچ کاتێکدا لەو سنورانە دەرنەچین، پلەو پایەو سامان پەیوەندیان بە چاك و بە خراپ و باوەڕدارو بێ باوەڕەوە نیە، هەرکەسێ کۆشش بکاو خۆی ماندو بکا نابێ بەبار بەسەر دانیشتوانەوە، خوابێ بەهرەی ناکا لەو شتەدا خۆی بۆ ماندا ئەکا کەمێ یان زۆر. بازرگان پێویستە خۆی ماندو بکا، کاتێ دەستکەوتی خۆی ببینێ داوا لە خوا بکا بکڕو کڕیاری بۆ بەنێرێ و ڕەواج بەکاڵاو قوماشەکەی بدا، نابێ داوا بکا لە خوا بەبێ ماندوبوون قوماشی بۆ بنێرێ. خاوەنی کشت و کاڵ بپاڕێتەوە خوا بارانی بۆ بەنێرێ بۆ

سەوزکردنی دانەوێڵەکەی، نابێ داوای سەوزبوونی بکا بەبێ باران. کەواتە ئەبێ بپاڕێنەوە لە خوا یاریدەی منالەکانمان بدا بۆ خوێندن و فێربوونی وانەکانیان و سەرکەون لە تاقی کردنەوەدا، نابێ داوا بکەین لە خوا بخاتە دڵی مامۆستاکانی زانکۆ بەڵێن نامەیان بداتێ بەبێ خوێندن و تاقی کردنەوە.

بۆ زانین: پلەو پایەو سامان بە دوو جۆر دەست ئەکەوێ:

١- بە ڕێگەی ڕەواو بە گوێرەی یاسای دیاری کراو لەلایەن خوای مەزنەوە، بە گوێرەی کۆششی ئادەمیزاد بەرهەم وەرئەگرن، نابێ لە سنور دەرچێ ئەو کاتەیش وائەبێ ئەو بەرهەمە زۆرجاران کەم ئەبێ.

٢- بە ڕێگەی قەدەغە کراوو نارەوا، لەو کاتەدا ئادەمیزادی خراپ بە خۆماندوبونێکی کەم پلەو پایەی بەرزو سامانی زۆر پەیدا ئەکەن، سەر لە هیچ شتێ ناکاتەوە، وائەبێ ناموسی خۆی و هاونیشتمانی خۆی ئەدا بەکاربەدەستان و دووڕویان بۆ ئەکا، نهێنی دانیشوان ئەبا بۆیان، هەتا ئەوانیش پلەو پایەو سامانیان بۆ بڕەخسێنن، کۆشك نایاب و سامانی زۆر پێکەوە ئەنێن و ئەیسازێنن بۆ خۆیان بە فرۆشتنی هەموو ڕێزی خۆی .

هەندێ لە هاوڕێکانی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ پرسیاری زۆریان لە پێغەمەر ئەکرد هەریەکەیان لە بابەتێکەوە، بە جۆرێ پێغەمەریان ماندوو ئەکرد، ئەگەر وەڵامی بدانایەوە وائەبوو توشی شورەیی ببونایەو ئابڕویان بڕوشایە، چونکە وەڵامەکە باسی خراپە نهێنییەکانی ئەوانی تێدا ئەبوو، ئەو پرسیارانە زۆریشیان پێویستیان بە وەڵامدانەوە نەبوو، خوا ئەفەرموێ:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ وَإِن تَسۡـَٔلُواْ عَنۡهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلۡقُرۡءَانُ تُبۡدَ لَكُمۡ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهَاۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٞ ﴿١٠١﴾ قَدۡ سَأَلَهَا قَوۡمٞ مِّن قَبۡلِكُمۡ ثُمَّ أَصۡبَحُواْ بِهَا كَٰفِرِينَ ﴿١٠٢﴾

﴿ یا أَیها الذِیْنَ أمَنُوا لا تَسْأَلُوا عَنْ أَشیاءَ إِنْ تَبدَلَكُمْ تَسُؤْكُمْ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە ئێوە پرسیار لە پێغەمەری خۆتان مەکەن لە چەندین شتێ ئەگەر بۆتان ئاشکرابێ ئێوە خەفەت بارئەکا، چونکە شورەیی و ئازاری تێدایە بۆ ئێوە، چاوەڕوانی فەرمودەی خوا بکەن لە هەموو ڕویەکەوە. بۆ نموونە: مرۆڤێ ووتی: ئەی پێغەمەری خوا: باوکی من چ کەسێکە؟ فەرموی: فلان کەسە. پیاوی تر ووتی: باوکم لە جێگەیەکە، فەرموی: لە نێوی ئاگردایە. هەندێ زانایان ئەلێن: هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە ئەوەبوو، پێغەمەر ووتی: خوا حەجی فەرز کردووە لەسەر ئێوە، پیاوێ ووتی: هەموو ساڵێ پێغەمەر دەنگی نەکرد، و دووپاتی کردەوەو فەرموی: هەموو ساڵێ: فەرمووی: ئەگەر بڵێم: بەڵێ، پێویست ئەبێ. دووایی ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە.

﴿ وإِنْ تَسْأَلُوا عَنْها حِینَ یَنْزِلُ القُرْأنُ تَبدلَكُمْ ﴾ وەئەگەر ئێوە پرسیار بکەن لەو شتانە کاتێ قورئان بنێرڕێتە خوارەوە وولامی ئەو شتانەتان بۆ دەرئەکەوێ. کەواتە ئێوە ئازاری خۆتان مەدەن بۆ پرسایری هیچ شتێ، دوایی ئەگەر پێویستی بە ڕوون کردنەوەی هەبوو پرسیار لە پێغەمەر بکەن هەتا وولامی پرسیارەکانتان بداتەوە بە ڕونی بە گوێرەی فەرمودەی خوا.

﴿ عَفااللهُ عَنْها واللهُ غَفُورٌ حَكِیمٌ ﴾ خوا لە پرسیارە پێشوەکانتان خۆش بووەو لە گوناهەکانیان خۆشبوە، دوایی مەچنەوە بۆلای وێنەی ئەو پرسیارانە، خۆتان ڕاگرن خوا هەموو شتێ ڕون ئەکاتەوە بۆتان و، خوا لێ خۆشبونی زۆرە بۆ ئەوە کەسانە پەشیمان ئەبنەوە، زۆر لەسەر خۆیەو پەلە ناکا بۆ سزادانتان لە کاتی بێ فەرمانیدا.

﴿ قَدْ سَألَها قَوْمٌ مِنْ قَبْلُكُمْ ثُمَ أصبَحُوا بِها كافِرِینْ ﴾ بە ڕاستی تاقمێ لە پێش ئێوەوە پرسیاری چەندین شتیان ئەکرد لە پێغەمەرەکانی خۆیان و خۆیان ماندوو ئەکرد کە خوا وولامەکانیان بۆ ڕون بکاتەوە، لە پاش ڕون کردنەوەی لەلایەن خواوە وەلامەکانیان پێ ناخۆش بوو، دوایی بە هۆی ئەو شتانەوە گەڕان بە بێ باوەڕ. زانایان درێژەیان داوە بە

ڕونکردنەوەی مەبەست لەو تاقمە، خوا ڕونی نەکردووەتەوە، زۆر نزیکە جولەکەکان بن، چونکە پرسیاری زۆرنالەبارەیان لە موسا ئەکرد. داوای بینینی خوایان ئەکردو زۆر شتی تریش.

عەرەبەکان بەر لە هاتنی ئایینی ئیسلام، خۆیان لە خۆیانەوە چەند کارێکیان کردبوو بە دەستورو نەریت بۆ خۆیان، ئەوانەیش دوای ئەوان هاتبوون لاسایی ئەوانیان ئەکردەوە لەو یاسایانەی ئەواندا هەندێ شتیان لە خۆیان قەدەغە کردبوو بەبێ ئەوەی خوا ئەو شتانەی بۆ کردبن بە دەستور، بەو بۆنەوە خوا ئەفەرموێ:

مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٍ وَلَا سَآئِبَةٍ وَلَا وَصِيلَةٍ وَلَا حَامٍ وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ وَأَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ ﴿١٠٣﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ قَالُواْ حَسۡبُنَا مَا وَجَدۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَآ أَوَلَوۡ كَانَ ءَابَآؤُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ شَيۡـًٔا وَلَا يَهۡتَدُونَ ﴿١٠٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡ إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿١٠٥﴾

﴿ ما جَعَلَ اللهُ مِنْ بَحيرَةٍ ﴾ خوا نەیناردوەتە خوارەوە نەی کردووە بە دەستورو یاسای ئایینی (بەحیرە) بە هوشترێ ئەڵێن گوێیان قلێشاندبێ. عەرەبەکان بەرلە هاتنی ئایینی ئیسلام هەر هوشترێ پێنج بەچکەی ببوایەو پێنچەمیان نێربوایە گوێچکەیان دائەقلێشان و بەرەڵایان

ئەکردو هیچ سودێکیان لێ وەرنەئەگرت، ئەبوایە هیچ کەسێ سواری نەبوایەو کەس شیرەکەی نەدۆشایە، باریشیان نەکردایە، لەسەر ئاودانیدا هیچ کەسێ دەری نەکردایە لە هیچ لەوەڕگایە دەریان نەکردایە، ئەو کارەیان بە دروشمی ئایینی دائەناو ئەبوایە پەیڕەوی بکرایە.

﴿ وَلا سائِبَةٍ ﴾ وەخوا نەی کردوە بە یاسای ئاینی (سائبە): بە هوشترێ ئەڵێن عەرەبەکان بەرەڵایان ئەکردو خۆی بۆخۆی بلەوەڕێ هەر کاتێ (١٠)ە بەچکەی بوایە هەمویان مێ بونایە، ئەیان کرد بە بەشی بتەکانیان، ئەبوایە هیچ کەسێ سواری نەبوایەو باری نەکردایە. مووکورگەکەیان نەئەبڕیەوە، شیرەکەی بۆ جگەی مێوان نەئەدۆشرایە.

﴿ وَلا وَصِيلَةٍ ﴾ وەخو نەی کردووە بە دەستوری ئایینی (وەسیلە): بە مەڕێ یا بە بزنێ ئەڵێن بە جارێ دوو بەچکەی نێرومێی ببوایە. عەرەبەکان دەستوریان وابوو ئەگەر بە تەنها بەچکەی نێرەی ببوایە ئەیان کرد بە بەشی خواکانیان، ئەگەر بەچکەی مێینەی ببوایە ئەیانکرد بە بەشی خۆیان. ئەگەر بەیەك جار دوو بەچکەی ببوایە یەکێکیان نێرو ئەوی تریان مێ بوایە نێرەکەیان سەرئەبڕی و ئەیان ووت: لکاوە بە برای خۆیەوە.

﴿ وَلا حامٍ ﴾ وە خوا نەی کردوە بە دەستوری ئاینی (حام) بە هوشترێك ئەڵێن بپارێزرێ. عەرەبەکان دەستوریان وابوو هوشترێکیان هەبوایەو نێر بوایەو لە پشتی ئەو هوشترە (١٠)ە سەر هوشتری لێ پەیدا ببوایەو وازیان لێ ئەهێناو لە ئاوو لەوەڕگا نەیان ئەگێڕاوە، ئەیان ووت پارێزراوی پشتی خۆیەتی. خوای مەزن ڕونی کردەوە ئەو شتانە پەیوەندیان بە ئاینەوە نی‌یە، ئەوانە هەموویان ڕەوان لە هەموو ڕویەکەوە وە وەك لەوەو پێش، بە پڕوپاگەندەو نوسراو قەدەغە نابن.

﴿ وَلكِنَ الذِينَ كَفَرُوا يَفْتَرُونَ عَلَى اللهِ الْكَذِبَ وأكثَرَهُمْ لا يَعْقِلُونْ ﴾ وەبەلام ئەو کەسانە باوەڕیان نەهێناوەو ئەو شتانەیان قەدەغە کردووە دروستی ئەکەن بە بوختان و بەبێ بەڵگە درۆو ئەیدەن بەسەر خواداو ئەڵێن: ئەو شتانە خوا بڕیاری داوە لەسەریان و، زۆرتر

لەو بێ باوەڕانە نازانن و ئاگاداریان نی‌یە لە بارەی کارە ڕەواکان و کارە قەدەغەکراوەکان، عەقڵ بەکارنایەرن هەتا کاری ڕەواو ناڕوا جوێ بکەنەوە، جگە لە لاسایی کردنەوەی پێشووەکانیان فێری هیچ شتێ تر نەبوون، ئەو یاسا خراپانە لەوانەوە بۆ ئەمان هاتوە، بۆیە خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَإذا قِيلَ لَهُمْ تَعالَوْا إلى ما أنْزَلَ اللهُ وَإلى الرَّسُولِ ﴾ وەهەرکاتێ بێژرابێ بەوان، ئێوە وەرن بۆلای شتێ خوا ناردویەتیە خوارەوە لە کارە قەدەغەکراوەکان و کارە ڕەواکان لە قورئاندان و وەبۆلای نێردراوی خوا کە قورئانی بۆ هاتوەو پێویستە بڕوا بە گفتوگۆکانی بکەن و یاسایی ئایینن.

﴿ قالُوا حَسْبُنا ما وَجَدْنا عَلَيْهِ آباءَنا ﴾ ئەیان ووت: بەسە بۆ ئێمە شتێ ئێمە دەستان کەوتووەو باوکەکانمان لەسەری بوون، باوەڕمان بە جگەی ئەوانە نیە.

﴿ أوَ لَوْكانَ آباؤُهُمْ لا يَعْلَمُونَ شَيْئاً ولا يَهْتَدونَ ﴾ ئایا چۆن بەسیانە شتێ باوکەکانیان لەسەری بوون ئەگەر باوکەکانیان هیچ شتێ نەزانن و ڕانموویی وەرنەگرن. بێگومان ئەوان نەزان و ڕێگەیان ون کردووە، ئیتر چۆن لاساییان ئەکەنەوە.

عەرەبەکان باوەڕیان بە بوونی خوا هەبووە بە گوێرەی ئەوەی کە ئەو شتە قەدەغەکراوەیان داوەتە پاڵ خوا، لەگەڵ ئەوەیشدا خوا ناوی بەبێ باوەڕ بردوون، چونکە ئەو قەدەغەکردنەیان بە درۆو بە بوختان داوەتە پاڵ خوا. کەواتە هەر کەسێ بداتە پاڵ خوا شتێ بەهەوەسی خۆی بەبێ بەڵگەیە لە فەرمودەی خواو پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ ئەو کەسە بەبێ گومان بەبێ باوەڕ ئەژمێرێ. ئەو جۆرە کردەوانە لای زانایانی یاساناسینی ئایینی بەکارێکی تازە پەیدا بوو دائەنرێ (البدعه). هەرشتێ لەو بابەتە بێ گومڕاییەو گومڕایش ئەبێتە هۆی چونی نێو ئاگر.

دوای ئەوەی خوا ڕونی کردەوە چۆنێتی ئەو بێ باوەڕانە لەلاسایی کردنەوەی باوکەکانیان، دوای ئەوە فەرمان پێ ئەدا بە پەرستنی خوا، بۆیشمان ڕون ئەکاتەوە هیچ کەسێ بەهۆی گوناهی کەسێ ترەوە سزای نادرێ. وەئەفەرموێ:

﴿ يا أَيُّها الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنْفُسَكُمْ لا يَضُرُّكُمْ مَنْ ضَلَّ إِذا اهْتَدَيْتُمْ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە خۆتان بپارێزن بابەندی چاککردنی ڕەوتی خۆتان بن و بێ فەمانی خوا مەکەن، زیان بە ئێوە ناگەیەنێ کەسێ لە ڕێگەی ڕاست لای دابێ لە کاتێکدا ئێوە ڕانموونیتان وەرگرتووە، بەهۆی فەرماندانتان بە چاکەو بە خراپە نەکردن.

﴿ إِلَى اللهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعاً فَيُنَبِّئُكُمْ بِما كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ بۆلای خوا ئێوە گەڕانەوە ئێوە بە گشتی لە پاشە ڕۆژدا بە چاك و خرابتان، دوایی خوا هەواڵ ئەدا بە شتێ ئێوە ئەیکەن لە چاك و لە خراپ پاداشت و تۆڵەی خۆتان وەرئەگرن بەبێ کەم و کوڕی بە دادپەروەرانەوە.

ئەو ئایەتەی دوایی بە گوێرەی ڕواڵەت وامان پیشان ئەدا کاتێ ئادەمیزاد ڕانموونیان وەرگرت هەر ئاگایان لە خۆیان بێ و بە تەنها و پێویست نییە لەسریان داوا بکەن لە کەسی تر چاکە بکەن و ڕێگە بگرن لە خراپە کردن، هەر خۆی لێپرسراوە. ئەوەی ڕاستی بێ لە ماناکردنی ئەو ئایەتە ئەمەیە: پێویستە لەسەر مرۆڤ فەرمان بدا بە چاکە کردن، ئەگەر سود بەخش بوو زۆر باشە، خۆئەگەر سودی نەبو ئەو کەسە پێویستی سەرشانی خۆی جێبەجێ کردووە.

کەواتە مانای وانییە فەرماندان بە چاکە کردن و خراپە نەکردن پێویست نییە، ئەو ئایەتە یارمەتی ئەوە دەدات فەرمان دان پێویست نییە. زانایان بۆ ماناکردنی ئەو ئایەتە خۆیانیان ماندوو کردووە.

ئەگێڕنەوە دوو پیاوی گاور بە ناوی تەمیمی کوڕی ئەوسی داری و عەدی کوڕی بەداء بازرگانیان ئەکرد لە نێوان مەدینەو شامدا، چوە دەرەوە لەگەڵ ئەوان بۆ بازرگانی (بودەیلی کوڕی ئەبی ئەمریم) کە موسڵمان، لە ڕێگەدا بودەیل نەخۆش کەوت و ڕای سپارد ئەو داراییە لەگەڵ یەتی بدەنەوە بە خێزانەکەی، لە نێو شتەکانیدا جامێکی زیوی بەنرخی تێدا بوو نەخشێنرابوو بە زێڕ بەبێ ئاگاداری هاوڕێکانی نامەیەکی نوسیی و هەموو شتەکانی تۆمارکردبوو، خستبوویە نێو شتەکانی، بودەیل کۆچی دوای کردو هاوڕێکانی

جامەکەیان فرۆشت و نرخەکەیان بۆ خۆیان هەلگرت چونەوە بۆ مەدینەو شتەکانیان دایەوە بە خێزانی بودەیل، کاتێ نامەکەیان خوێندەوەو جامەکەیان نەدی و داوایان کردو گاورەکان وتیان: جامی زیوی تێدا نەبووە، ڕوداوەکەیان بردە خزمەت پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ئەویش ئەمیم و عەدی بانگی کرد، دوایی نوێژی عەسر شوێند دان کە خەیانەتیان نەکردوە، دوای پێغەمەر بەرەڵای کردن بۆ ڕونکردنەوەی ئەو مەبەستە خوا دەفەرموێ:

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ شَهَـٰدَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ حِينَ ٱلْوَصِيَّةِ ٱثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ أَوْ ءَاخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ إِنْ أَنتُمْ ضَرَبْتُمْ فِى ٱلْأَرْضِ فَأَصَـٰبَتْكُم مُّصِيبَةُ ٱلْمَوْتِ ۚ تَحْبِسُونَهُمَا مِنۢ بَعْدِ ٱلصَّلَوٰةِ فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ إِنِ ٱرْتَبْتُمْ لَا نَشْتَرِى بِهِۦ ثَمَنًا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ۙ وَلَا نَكْتُمُ شَهَـٰدَةَ ٱللَّهِ إِنَّآ إِذًا لَّمِنَ ٱلْـَٔاثِمِينَ ﴿١٠٦﴾ فَإِنْ عُثِرَ عَلَىٰٓ أَنَّهُمَا ٱسْتَحَقَّآ إِثْمًا فَـَٔاخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا مِنَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْأَوْلَيَـٰنِ فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ لَشَهَـٰدَتُنَآ أَحَقُّ مِن شَهَـٰدَتِهِمَا وَمَا ٱعْتَدَيْنَآ إِنَّآ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٠٧﴾ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِٱلشَّهَـٰدَةِ عَلَىٰ وَجْهِهَآ أَوْ يَخَافُوٓا۟ أَن تُرَدَّ أَيْمَـٰنٌۢ بَعْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ ۗ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱسْمَعُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴿١٠٨﴾

﴿ يا أيها الذِيْنَ أمَنُوْا شَهادَةٌ بَيْنَكُمْ إذا حَضَرَ أحَدُكُمْ الْمَوْتَ حينَ الْوَصِيية ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە شایەتی دانی نێوان ئێوە بۆ یەکتری و دەرکەوتنی مەبەستتان هەر کاتی دەرکەوت بۆ کەسێ لە ئێوە نیشانەی مردن لە کاتی سپاردندا. (الوصیه).

﴿ أثْنانِ ذوا عَدْلِ مِنْكُمْ أو أخَرانِ مِنْ غَيْرُكُمْ ﴾ بریتی‌یە لە دوو کەسی خاوەنداد لە ئێوەی موسڵمان و خزمانی خۆتان، چونکە خزم باشتر لە فرمانی ئێوە ئاگادارن یا دوو کەسی تر لە جگەی هاوئایینی خۆتان ئەگەر موسڵمانتان دەست نەکەوت. لە کاتی دەست نەکەوتنی دوو پیاوی داد پەروەر، دروستە دوو پیاوی تر لە جگەی دادپەروەران.

﴿ إنْ أنْتُمْ ضَرَبْتُمْ في لأرْضِ فأصابَتْكُمْ مُصِيبَةَ الْمَوْتْ ﴾ ئەگەر ئێوە چوون بۆ کاروان و بۆ بازرگانی لە زەویی جگەی خانەی خۆتان، دوایی توشی ئێوە بوو سەرەتای مردن و بۆ دارایی خۆتان دوو کەستان کرد بە سپاردە بۆ خۆتان و داراییەکانتان دایە دەستیان بیدەنەوە بە خێزانەکانتان، دوایی ئەوەی داراییەکانتان دایەوە بەوان هەندێکیان گومانتان لەو کەسە پەیدا کرد.

﴿ تَحْبِسُونَها مِنْ بَعْدِ الصَلاةْ ﴾ ئێوە ئەو دوو کەسانە ڕاگرن لە پاش نوێژکردن و لەلای کۆمەڵێ لە ئادەمیزاد ئیتر هەر نوێژێ بێت. زوربەی زانایان دەڵێن: ئەو نوێژە نوێژی عەسرە، چونکە لەو کاتەدا زوربەی کارکردن کۆتایی پێ دێت.

﴿ فَيُقسِمانِ باللهِ إنْ أرَبْتُمْ لا نَشْتَري بِهِ ثَمَناً ولو كانَ ذا قُرْبى ﴾ دوایی ئەو دوو کەسە سوێند بخۆن بەخوا ئەگەر ئێوە گومانتان پەیدا کرد لەو دوو کەسە کە ڕاست ناکەن لەو شتەی ئەی گێڕنەوە لەو ڕاسپاردەیە بەر لە مردن کراوە، چۆنێتی سوێند خواردنەکە بەم جۆرەبێ: ئێمە ناکڕین بەو سوێندە هیچ نرخێ لە سوودی ئەم جیهانەو، با ئەو کەسە سوێندی بۆ ئەخۆن خزمە نزیکی ئێمەبێ.

﴿ وَلا نَكْتُمُ شَهادَةَ اللهِ إنّا إذَا لَمِنَ ألا ثِمينَ ﴾ وە ئێمە داناپۆشین شایێتی دانێ خوا فەرمانی پێدابێ. بە ڕاستی ئەگەر ئێمە بیشارینەوە ئەو کاتە ئێمە گوناهبارانین .

تەفسیری زمناکۆیی

لەو ئایەتەوە وامان بۆ دەرئەکەوێ سوێندانی شایێ گومانی لێ بکرێ بە گوێرەی یاسا دروستە. هەندێ لە زانایان ئەلێن: ئەو سوێندانە بۆ جگەی موسڵمانە، ئەگەر ئەو کەسانە موسڵمان بوون سوێند نادرێن، بۆیشمان ڕون ئەبێتەوە سوێند خواردن بە جگەی خوا قەدەغەیە.

﴿ فَإِنْ عُثِرَ عَلَى أَنَّهُمَا اسْتَحَقَّا إِثْمًا فَآخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا ﴾ دوای ئەگەر ئاگاداری پەیدا کرا لەسەر ئەوەی بە ڕاستی ئەو دوو ڕاسپێرراوانە شایستە ئەوەن گوناهیان کردبێ و بەدرۆ سوێندیان خواردووە، دوایی دوو کەسی تر لە خزمانی مردوەکە بۆ بەسەر گرتنەوەی مافی خۆیان هەڵئەسن و جێگەی ڕاسپێردراوەکان ئەگرنەوە. ئەو دووکەسانەی.

﴿ مِنَ الَّذِينَ اسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ الْأَوْلَيَانِ ﴾ لە کەسانێکی ئەتۆبن و ئەو دوو کەسە شایستەبن و میرات گری مردوکەو، دوو کەسە پێشوەکان زیانیان داوە بەسەریانا بەدرۆ،

﴿ فَيُقْسِمَانِ بِاللَّهِ لَشَهَادَتُنَا أَحَقُّ مِنْ شَهَادَتِهِمَا ﴾ دوایی ئەو دووکەسەی جێگەی دوو کەسە گومان لێ کراوەکان ئەگرنەوە سوێند بخۆن بە ڕاستی شایێتی دانی ئێمە ڕاستترە لە شایێتی دانی ئەو دوو کەسەی پێشوە گومان لێ کراوانە. هەندێ زانایان ئەڵێن: بەیەکەوە نوسانی ووشەکانی ئەو ڕستەیە زۆر گرانە.

﴿ وَمَا اعْتَدَيْنَا إِنَّا إِذًا لَمِنَ الظَّالِمِينَ ﴾ وە ئێمە لە سنوری خوا دەرنەچووین لەم سوێند خواردنەمانا، ئەو دوو کەسەی تر لە سنور دەرچوون. بە ڕاستی ئەگەر ئێمە لە سنور دەربچین ئەو کاتە ئێمە لە ستەمکارنین و ستەمان لە خۆمان کردوە. کاتێ ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە عەمرِی کوڕی عاس و موتەلیبی کوڕی دەداعەی خزمانی بودەیل دوای نوێژی عەسر سوێندیان خواردو جامەکەیان دایە دەستاین .

﴿ ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يَأْتُوا بِالشَّهَادَةِ عَلَى وَجْهِهَا ﴾ ئەو فەرماندانە بە گەڕانەوە سوێند خواردن بۆلای میراتبەران و بۆلای کاربەدەستانی مردوەکە، شایستە ترە لە هەموو کەسێ کەشایەتی بدەن بە جۆرێ ڕاستی ئەو شایتیە هەڵیان گرتووە.

﴿ أو يَخافُوا أنْ تُرَدَّ أيْمانٌ بَعْدَ أيْمانِهِمْ ﴾ يا شايەنترە لەوەی ڕاسپێرراوەکان بترسن کە سوێند خواردنە کە بگەڕێەوە بۆلای میراتبەرانی مردوە، دووایی ڕاسپێراوەکان ئابڕوویان بچێ بەهۆی دەرکەوتنی خەیانەتەکەیان و، بژاردنی ئەو شتەی شاردویانەتەوە.

﴿ وَاتَّقُوا اللهَ واسْمَعُوا وَاللهُ لا يَهْدِي القَوْمَ الفاسِقِينَ ﴾ وە ئێوە لە خوا بترسن و سوێندی درۆ مەخۆن و شایەتی بەڕاستی بدەن و، فەرمانەکانی خوا ببیسن و چاکیان وەربگرن و، خوا ڕانموویی کۆمەڵی دەرچووان لە سنور ناکاو خوا ناپەرستن، ڕێگەی بەهەشت لەخۆتان مەگرن، بە تایبەتی شایەتی ڕاست بدەن.

یاسای خوا بە جۆرێ داڕێژراوە کاتێ باسی هەندێ لە فەرمانداانەکەی خۆی کرد، دوایی باسی ئەو شتانە ئەکا پەیوەندییان بە خواوە هەبێ بە تەنها، یا باسی پێغەمەران شی ئەکاتەوە، یا باسی ڕوداوی ڕۆژی دوایی ئەکا، بۆ ئەوەی گوێ گران تەمێ خواربن و فەرمانەکانی خوا وەربگرن، بۆیە لێرەیش کە باسی هەندێ لە فەرماندانی خۆی کرد باسی ڕۆژی دوایی ئەکا و ئەفەرموێ:

يَوْمَ يَجْمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبْتُمْ قَالُواْ لَا عِلْمَ لَنَآ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١٠٩﴾ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱذْكُرْ نِعْمَتِى عَلَيْكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا وَإِذْ عَلَّمْتُكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ بِإِذْنِى فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْرًا

بِإِذْنِي وَتُبْرِئُ الْأَكْمَهَ وَالْأَبْرَصَ بِإِذْنِي وَإِذْ تُخْرِجُ الْمَوْتَىٰ بِإِذْنِي وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ عَنكَ إِذْ جِئْتَهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ إِنْ هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١١٠﴾ وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى الْحَوَارِيِّينَ أَنْ آمِنُوا بِي وَبِرَسُولِي قَالُوا آمَنَّا وَاشْهَدْ بِأَنَّنَا مُسْلِمُونَ ﴿١١١﴾

﴿ يَوْمَ يَجْمَعُ اللهُ الرُسُلَ فَيَقُولُ ماذا أجِبْتُمْ ﴾ ئێوه خۆتان بپارێزن لـه ڕۆژێ خـوا کـۆ ئەکاتەوە هەموو نێرراوەکانی خۆی، و دوایی خوا ئەفـەرموێ بـە نێرراوەکـان بـە چ شـتێ وولاّمی ئێوه دراوەتەوە لەلایەن نەتەوەکانتانەوە لـــە جیـهاندا کاتـێ ئێـوە بـانگی ئـەوانتان ئەکرد بۆلای پەرستنی من.

﴿ قالُوا لا عِلْمَ لَنا إنَكَ أنْتَ عَلاّمُ الغُيُوبِ ﴾ پێغەمەرەکان ووتیان: هیچ زانیارییـە نیـیـە بۆ ئێمە بەشتی تۆ ئەیزانی، بەڕاستی ئۆ ئەزانی بەو شتانە دیارنین، دوایی تۆ ئەزانی بـە شـتێ وولاّمی ئێمەیان پێ دابێتەوەو بەوەی ئاشکرایان کردووە بۆ ئێمە و بەشتێ پەنهانیان داوە لە دلّیانا، ئێمە شتێ نادیاری نازانین و هەندێ شتێ دەرکـــەوتوو ئـەزانین و تـۆ هـەموو شـتێ ئەزانێ.

ئەو فەرمودەی خوای مەزنـە لـەو ئایەتـەدا زۆر ترسـناکە لـەو بارەیـەوە خـوا هـەموو ئادەمیزاد لەو ڕۆژەدا کۆئەکاتەوە بۆ پرسیار لێ کردنیان بەر لە دەرچونی فەرمانی خـوا بـە لێ بوردنیان و لێ نەبوردنیان، چونکـە خـوا لـەو ڕۆژەدا هەریەکـە لـە پێغەمـەران لەگـەڵ نەتەوەکانیان ڕوبەرو ئەکا، بە پێغەمەرەکان ئەفەرموێ: ئەمانە چ شتێکیان بە ئێوە ووتوە، بۆ ئەوەی بیانویان نەمێنێ.

پرسیار/ بەڕاستی پێغەمەران ئەزانن بەکەسێ باوەڕی نەهێنابێ و جەنگی لەگەڵ کردبێ ئیتر چۆن بڵێن: ئێمە هیچ شتێ نازانین؟

وەڵام/ مەبەستیان ئەوە نی‌یە هیچ نەزانن. بەڵکو مەبەستیان ئەوەیە زانینی ئەوان بەرانبەر بە زانینی خوا وەك نەبوون وایە، چونکە پێغەمەران بەشێکی کەمی ئەوان ئەزانن بەڵام خوا نهێنی ئەوانیش ئەزانێ.

دوای ئەوەی بە کورتی داوای وولاّمی کرد لە پێغەمەران، بە درێژی لەنێو هەموویاندا باسی عیسا ئەکاو بیری ئەخاتەوە لە پاشەڕۆژدا ئەو چاکەیە داوێتی بە عیسا و دایکی ئەفەرموێ:

﴿ إِذْ قالَ اللهُ يا عيسى ٱبْنَ مَرْيَمَ إذكُرْ نِعْمَتِي عَلَيْكَ وَعَلَى والدِتكَ ﴾ ئەو ڕۆژە بریتییە لەو کاتە خوا ئەفەرموێ: ئەی عیسای کوڕی مەریەم: تۆ بیری چاکەی من بکەرەوە بەسەرخۆ تو بەسەر دایکتەوەکە ڕێزداری ناو ژنانی سەردەمی خۆی بۆ هەڵبژێررا، چاکەکانی ئەمانەن:

﴿ إِذْ أَيَدْتُكَ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ ﴾ کاتێ من یارمەتی تۆم دا بە گیانی پاك کە جبرەئیلەو ئەو فریشتەیە کە من ڕەوانەم کردوە بۆلای پێغەمەرەکان هەتا یارمەتیان بداو بەهێزیان بکا لەسەر ڕاوەستانیان بۆ گەیاندنی فەرمانی خوا، دایکی تۆمان پاك کردەوە لە بوختانی خراپ.

﴿ تُكَلِمُ النّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلاً ﴾ تۆ گفتوگۆ ئەکەی لەگەڵ ئادەمیزاد لە ناو بێشکەدابوی و منالّ بوی ئەوەیش کارێکی بە هەموو کەس نەکراوە، بۆ ئەوەی دایکت پاك بکەیتەوە لە بوختان و بە داوێن پاك بناسرێ و، گفتوگۆ ئەکەی کاتی پیاوەتی بۆ ڕاگەیاندنی فەرمانی خوا. یانێ گفتوگۆی کاتی منالّیت وەك گفتوگۆی کاتی پیاوەتیتە لە تەواوی ئەقڵدا بەبێ جیاوازی زانایان ئەڵێن: وشەی (کهلا) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە عیسا لەمەدوا دێتە خوارێ چونکە عیسا بەرزکراوەتەوە بەر لەوەی بگاتە کاتی کەهلی،

کەهل بە ئادەمیزادێ ئەڵێن تەمەنی لە (٣٠) ساڵ بەرەو ژوورو هەتا (٤٠) ساڵی. ئیبنو عەباس ئەڵێ: عیسا تەمەنی (٣٠) ساڵ بووە خوا کردی بە پێغەمەر (٣٠) مانگ دوای گەیاندنی فەرمانی خوا وەك پێغەمەر بەرزکراوەتەوە.

بۆ زانین: گومان بردن بەوەی کە عیسا پێغەمەر بووە لە بێشکەداو لە کۆشی دایکیا، چونکە گفتوگۆی کردووە، ئەو گومانە نەزانین و بوختانە، چونکە گفتوگرکردنی عیسا لە کۆشکی دایکیا بۆ ڕزگارکردنی دایکە لە بوختانی جوەکان. نەك لەبەر ئەوەی کە فروستادەیە، خوا هەموو داواکارێکی لەسەر منداڵ هەڵگرتوە، چۆن داوایی لێ ئەکرێ بە مداڵی؟ ئادەمیزادیش فەرمان لە مناڵ وەرناگرن، ئەوەی باسمان کرد بیروڕای زوربەی زانایانی موسڵمانانە.

ئەو ئینجیلانە جێگەی بڕوان لای گاورەکان بڕیانداوە کە عیسا کراوە بە پێغەمەر لە تەمەنی (٣٠) ساڵدا. ئینجیلی (لوقا) فەسڵی سێ، ژمارە (٢٣).

﴿ وَإِذ عَلَمْتُكَ الكِتابَ وَالْحِكْمَةَ ﴾ وە تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە من تۆم فێری نامەی پێغەمەرە پێشوەکان و نوسینمان کردی بە پێنوس و، تۆمان فێری دەستورو پەروەردەکردنی ئادەمیزادو بەڕێوەبردنیان کردی لە ژیانی ڕۆژانەیانداو هاندانیان بۆ پەیڕەوی فەرمانی خوا.

﴿ والتّوراةَ وَالأنْجِيلَ ﴾ وە تۆمان فێری ناوەڕۆکی تەواراتی نامەی نێرراوو بۆلای موسامان کردی، فێری هەندێ کاری نهێنی خواییمان کردی سەرەڕای زانیاری ژیانی ڕۆژانەی ئەم جیهانە. فێری ناوەڕۆکی نامەی ئینجیلمان کردی کە نامەی نێرراوی خوایە بۆلای تۆ، فێری زانیاری خوا ناسیم کردی جگەی زانیاری ئەمڕۆ.

﴿ وَإذْ تَخْلَقُ مِنَ الطِينِ كَهَيْئَةِ الطَيْرِ بأذني فَتَنْفُخ فِيها فَتَكُونُ طَيْراً بِأذْنِي ﴾ وە بیری ئەو کاتە بکەرەوە تۆ دروست ئەکەی وێنەی شێوەی باڵندیە لە خاك بە هۆی دەستوری منەوە، دوایی تۆ فو ئەکەی بە شێوەی ئەو باڵندەیەدا، دوایی ئەبێ بە باڵندەیەکی زیندوی خاوەن گییان بەهۆی دەستوری منەوە .

﴿ وَتُبْرِىءُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ بِأِذْنِي ﴾ وە تۆ ڕزگار ئەکەی ئادەمیزادێ بە کوێری لە دایك بوبێ لە نەخۆشی کوێری و ڕزگار ئەکەی و پاکی ئەکەیتەوە کەسی بەڵەکاوی لە نەخۆشی بەڵەکی بەهۆی دەستوری منەوە.

﴿ وَإِذْ تُخْرِجُ الْمَوتى بِأِذْني ﴾ وەبیری کاتێ بکەرەوە تۆ دەرئەهێنی مردوەکان لە گۆڕەکانیان و زیندو ئەبنەوە بە گیانێکی تازەوە بەهۆی دەستوری منەوە.

وێنەی ئەو ئایتە لە باسی ئایەتی (٩) ی سورەتی ئالی عیمراندا مانای کراوە. دووپات کردنەوەی ووشەی (بِأِذْني) چوارجار نیشانەی ئەوەیە کە دروست کردن و زیندوبونەوەو ڕزگارکردن هەر بە دەستی خوایە بە تەنها.

﴿ وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِي إِسْرائِيلَ عَنْكَ إِذْ جِئْتَهُمْ بِالْبَيِّناتِ ﴾ تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە من بەرگریم کرد لەتۆ بەنی ئیسرائیلەکان کاتێ چوی بۆلایان بە چەندین بەڵگەی ڕونەوەو بە چەندین کاری بە هەموو کەس نەکراو کاتێ نیازی کوشتنی تۆیان کرد.

﴿ فَقالَ الذِيْنَ كَفَرُوا مِنهُمْ إنْ هذا إلاّ سِحْرٌ مُبِينٌ ﴾ دوایی ووتیان کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێنابوو: ئەو ڕزگارکردن و زیندوکردنەو ئەو کارە بە هەموو کەس نەکراوانە کە عیسا دەریان ئەخا بۆ ئێمە جادوێکی ڕون و ئاشکرایە، پوچن و ئێمە بڕوامان پێیان نیە. لەگەڵ ئەو هەمووە کارە پەك خرانە جوەکان هەوڵی کوشتنی عیسایانداو ناویان ئەبرد بە درۆزن و جادوگەر، بۆوختانی زۆر نارەوایان هەڵبەست بۆ دایکە ڕاست گۆکەی. عیسا هیچ سوچێکی نەبوو جگە لەوەی گفتوگۆی ڕاستی ئەکرد، بانگی ئەکردن بۆلای پەرستنی خواو فەرمانی پێ ئەدان پەیڕەوی ڕاستی بکەن.

ئەو کارە خراپانە هەرچەندە لە ڕەوشتی جوەکانە. بەڵام تەنها هەر ئەوان بەو جۆرە نین، زوربەی ئادەمیزاد دوژمنایێتی خۆیان دەرئەبڕن دەربارەی ئەو کەسانە ڕانموییان ئەکەن بۆلای چاکەو ئاواتیان ڕانمویی ئەوانە.

﴿ وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلى الْحَوار يين أنْ أمَنُوا بِي وَبِرَسُولِي ﴾وە بیری ئەو کاتە بکەرەوە من خستمە نێودڵی هاوڕێ پاك و هەڵبژێرراوەکان و ئەو کەسانە نیازیان پاکە لە دۆستایێتی

تۆدا کە باوەڕبهێنن بە من و بە نێرراوی من کە عیسایەو، فەرمانم بەواندا کە تۆ فروستادەی منی لەو کاتەدا کە جوەکان تۆیان بەدرۆ ئەخستەوە.

بۆ زانین: (الوحی) هاتووە بە چەند مانایە: هاتوە بە مانای خستنە نێو دڵ، مەبەست لێرەدا ئەو مانایەیە.

﴿ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَٱشْهَدْ بِأَنَّنَا مُسْلِمُونَ ﴾ هاوڕێ نیاز پاکەکانی عیسا ووتیان: ئێمە باوەڕمان هێناوە بە خوایێتی تۆو بە پێغەمەرایێتی عیساو، تۆ ئەی خوایە شایێتی بدە بە ڕاستی ئێمە موسڵمانین و فەرمانبەرداری تۆین و نیازمان پاکە. خۆیشمان شایێتی بۆ یەکتری ئەدەین.

پ- بۆچی خوای مەزن باسی عیسای کردووە بە تەنها چاکەی لەگەڵ کردووە لە جگەی پێغەمەران کەچی خوا چاکەی بێ ئەندازەی بەخشیوە بە هەموو پێغەمەران.

و- بەڕاستی خوا چاکەی کردووە لەگەڵ هەموویان و بە کورتی باسی هەموویانی کردووە. بەڵام بە تایبەتی ڕوی فەرموودەی ئەکاتە لای عیسا بە درێژی، چونکە پەیڕەوانی عیسا لە سنور لایانداوە لە بارەی عیسا و کردویانە بەخوا. بەڵام پەیڕەوانی پێغەمەرەکانی تر پێغەمەرەکانی خۆیانیان نەکردوە بەخوا، بۆ ئەوە بەڵگە دابنرێ لەسەر لادەرانی سنوری خوا.

هاوڕێ دڵسۆزەکانی عیسا هەرچەندە بە نهێنی و بە ئاشکرا، بەبێ گومان باوەڕیان هێنابوو. بەڵام هەرچۆنێ بن ئامادەمیزادن و شایستەی هەموو کارێکن لە چاك و لە خراپ دوایی ویستیان بەردەوامبن لەسەر باوەڕو نەکەونە گومانەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا ووتیان بە ڕاستی باوەڕمان هێناوە بە عیسا، داوایان لە عسا کرد خوانێکی پڕ لە خوردەمەنی لە ئاسمانەوە بێتە خوار بۆیان، بۆ ئەوەی دڵیان بە یەکجاری ئارام بگرێ وێنەی ئیبراهیم پێغەمەر داوای کرد لە خوا چۆن مرو زیندو ئەکەیتەوە؟ بۆئەوەی دڵی ئارام پەیدا بکا، بۆ ڕون کردنەوەی ئەو مەبەستەو داخوازی هاوڕێکانی عیسا فەرموی:

إِذْ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَن يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ قَالَ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُواْ نُرِيدُ أَن نَّأْكُلَ مِنْهَا وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعْلَمَ أَن قَدْ صَدَقْتَنَا وَنَكُونَ عَلَيْهَا مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿١١٣﴾ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ ٱللَّهُمَّ رَبَّنَآ أَنزِلْ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ تَكُونُ لَنَا عِيدًا لِّأَوَّلِنَا وَءَاخِرِنَا وَءَايَةً مِّنكَ وَٱرْزُقْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿١١٤﴾ قَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ فَمَن يَكْفُرْ بَعْدُ مِنكُمْ فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١١٥﴾

﴿ إذْ قالَ الْحَوارِيّونَ يا عِيسى ابْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أنْ يُنَزِلَ عَلَينا مائِدَةً مِنَ السَّماء ﴾ تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە هاوڕێ نیاز پاکەکانی عیسا وتیان: ئەی عیسای کوڕی مریەم ئایا پەروەردەکەری تۆ وولاّمی پاڕانەوەی تۆ ئەداتەوە کە بەنێرێتە خوارەوە بۆسەر ئێمە خوانێکی پڕ لە خواردەمەنی لە ئاسمانەوە؟.

دووایی عیسا پێ ناخۆشبوونی خۆی دەربڕی، دەربارەی ئەو پرسیارەی هاوڕێکانی کەوای نیشان ئەدا گومانیان هەبێ و بە پاکی باوەڕیان نەهێنابێ، باوەڕداران شایانی ئەوە نین جۆرە پرسیاری وا بکەن بۆیە:

﴿ قالَ فَاتَّقوا اللهَ إنْ كُنْتُمْ مُؤمِنِينَ ﴾ عیسا ووتی: دوایی ئێـوە لـە خـوا بترسـن و ئـەم جۆرە داخوازیانە مەکەن ئەگەر ئێوە باوەڕداران، ئەم پرسیارەی ئێوە لە شـێوەی پرسـیاری پێشوەکانتان ئەچێ‌کە داوایان لە موسا ئەکرد، باوەڕداری ڕاستی شـایانی داخـوازی وانیـە بکرێن لەخوا. لە ژیانی بونەوەراندا شتی وا نەگونجاوە، لەگەڵ ئەوەیشدا ئێوە باوەڕتان بـە پێغەمەرایێتی من هێناوە.

پ- ئەو ئایتە وامان بۆ دەرئەخا کە هاوڕێکانی عیسا باوەڕدارنەبوون، ئایەتی (١١١)ی پێشەوەی ئەم سورەتە وائەگەیەنێ باوەڕداربوون و باوەڕیان بێگومان بووە بەخوا؟

و- زۆرتر لە زانایان وولامی ئەو پرسیارەیان داوەتەوە بەم جۆرەی خوارەوە:

ئایەتی (١١٢) دژی ناوەڕۆکی مانی (١١١) پێشەوە نیە ! چونکە مەبەسـتیان ئـەوەبوو باوەڕەکەیان بەتین تر ببێ لە ڕێگەی هەست و ڕواڵەتەوە، دوای باوەڕهێنانیان لـە ڕێگـەی ئەقڵ و بەڵگەوە. بە وێنەی پرسیاری ئیبراهیم لە خوا کە باسمان کرد.

﴿ قالُوا نُرِيدُ أنْ نَأكُلَ مِنْها وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنا ﴾ هـاوڕێ دڵسـۆزە نیـاز پاکـەکانی عیسـا ووتیان: ئێمە ئەمانەوێ کە ئێمە بخۆین لە خواردەمەنی ئەو خوانە، وەدڵمان ئاسـودە ببـێ و ئارام بگرێ و ببەسترێتەوە بە توانای خواوە بە ڕاستی و بێ گومان، بـەجۆرێ باوەڕهێنـانی زمانیمان لە کانگای باوەڕی دڵمانەوە دەرچوبێ بەبێ جیاوازی.

﴿ وَنَعْلَمَ أنْ قَدْ صَدَقْتَنا وَنَكُونَ عَلَيْها مِنَ الشّاهِدِينَ ﴾ وە ئێمە بزانـین کـە تـۆ ڕاسـتت کردووە لەگەڵ ئێمە کە تۆ پێغەمەری خوایی و ئێمە داوای هەر شتێ بکەین لـەخوا پێمـان ئەبەخشێ و فەرموتە من نێرراوی خوام و، ئێمە ببین بە شایەت لەسـەر هـاتنی ئـەو خوانـە هەرکاتێ داوامان لێ بکرێ لەلایەن جوەکانەوە، بە چاوی خۆمـان ئەوانـە ببینـین نـەك بـە بیستن، پاشان ئێمە هەواڵ بدەین بەو کەسـانەی خۆیـان ئـەو خوانـەیان نـەدیوە، هـەتا بـێ باوەڕان باوەڕ بهێنن و باوەڕداران دڵیان ئارام بکرێ بـا لـەو خواردەمەنیـەیان نـەخواردبێ وێنەی ئێمە.

بەراوردێ لە نێوان هاوڕێکانی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ لەگەڵ هاوڕێکانی پێغەمەرەکانی تر:

هاوڕێکانی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ باوەڕیان هێناو داوای هیچ شتێکیان لە پێغەمەر نەکرد لە خواردەمەنی و جگەی خواردەمەنییە بەشێوە نەگونجاوبن لەگەڵ سروشتا، لە گەرمەی جەنگدا ئەیان ووت: ئەی فروستادەی خوا: برۆ بەلای ئەو شتەو خوا ئەیەوێ و گوێی لە ئێمە مەگرە.. بەو کەسەی تۆی بە ڕاستی ناردوە: ئەگەر تۆ فەرمان بدەی ئێمە خۆمان بخەینە نێو دەریا خۆمانی تێ فڕێ ئەدەین، عەمری کوڕی ئەلجەموحی هاورێ پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بە قاچی شەلەوە ویستی بچێتە دەرەوە لەگەڵ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بۆ جەنگی ئوحود، کوڕەکانی هەوڵی ئەوەیاندا ڕێگە لە چونی بگرن، ڕوداوەکەیان بردە خزمەت پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ووتی: ئەمەوێ بە قاچی شەلەوە بچمە بەهەشت، پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ڕێگەی پێدا بۆ چونە دەرەوە، دوایی عەمر خۆی و چوار کوڕو برای ژنەکەی کوژران، ژنەکەی تەرمەکانیانی دابەسەر هوشترێکا، پاش کۆتایی هاتنی جەنگ بردنی بۆ نێو مەدینە ژنانی مەدینە توشی بون و ووتیان: دەنگ و باس چییە، ژنەکەی ووتی: پێغەمەری خوا زۆر چاکە، ووتیان: ئەم تەرمانە چین؟ ووتی: مێردەکەمو چوار کوڕم و براکەی من خوا ڕێزی گرتوون لە جەنگدا کوژراوون و لە ڕێگەی خواداو ئەیان بەم بۆ ناشتن لە گۆڕستاندا، ئەوانەی باسمان کردن وێنەی دلۆپێ ئاون لە زەریای خۆشەویستی هاوڕێکانی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بۆ پێغەمەرو ئاینی بەرزی ئیسلام.

بەلام هاوڕێکانی عیسا ئەیان ووت: ئێمە خواردنمان ئەوێ لە ئاسمانەوە بێتە خوارێ و ئێمە بیخۆین، هاڕێکانی موسا ئەیان ووت بە موسا: خۆت و پەروەردەکەری خۆت بچن بۆ جەنگ بکەن و ئێمە لێرە دائەنیشین، ئەوانەی باسکرن بۆ هاوڕێکانی عیساو موسا مشتێکن لە خەرواری لە داخوازی ئەوان.

نابێتە خۆهەڵکێشان ئەگەر ببێژرێ: هیچ پێغەمەرێ لە پێغەمەران هەرگیز سەرکەوتنیان بە دەست نەهێناوە بە هۆی هاوڕێکانیانەوە، بەو ێنەی ئەو سەرکەوتنە پێغەمەری ئیسلام بە

دەستی هێناوە بەهۆی دڵسۆزی و لەخۆ بردنی هاوڕێکانی، هـەر پـەیمانێکیان بدایـە ئـەیان بردە سەر، ئەوەیش نهێنیەکە بۆ: خۆیێتی و گەورەیی پەیامی ئایینی ئیسلام.

کاتێ عیسا بۆی دەرکەوت مەبەستی هاوڕێکانی پاکەو بێگومانە لە داخوازیەکانیانا.

﴿ قالَ عِيسى ابْنُ مَرْيَمَ اللهُمَ أنْزِلْ عَلَيْنا مائِدَةً مِنَ السَّماءِ ﴾ عیسا کوڕی مریەم ووتی: ئەی خوا بنێرە خوارەوە بەسەر ئێمەدا خوانێکی پڕ لە خواردەمەنی لە ئاسمانەوە.

﴿ تَكُونُ لَنا عِيداً لاِّ وَلِنا وَآخِرِنا وَآيَةً مِنْكَ ﴾ ڕۆژی هاتنە خوارەوەی ئەو خوانە ببێ بە ڕۆژی جەژن و خۆشی بۆ ئێمەی ئەم سەردەمەو نەوەکانی دوای ئێمە. بێـژراوە: ئـەو ڕۆژە ڕۆژی یەك شەمەبو بۆیە گاورەکان کردویانە بە جەژن بـۆ خۆیـان و، ئـەو خوانـە ببـێ بـە نیشانەیە لـەسەر توانا تۆو پێغەمەرایێتی من.

﴿ وَأرْزُقْنا وَأنْتَ خَيْرُ الرازِقِينَ ﴾ وەتۆ ببخشە بـە ئێمـە ئـەو خوانـە و سـوپاس کـردن لـەسەر ئێمەو، تۆ چاکترین کەسانێکی خاوەن بەخشندەیی.

بەکورتی عیسا کاتێ بۆی دەرکەوت هاوڕێکانی بەردەوامن لـەسەر داواکـاری خۆیـان، زانی مەبەستیان لەو داوایەدا پاکەو نایانـەوێ پـەکی بخـەن، پاڕایـەوە لـە خـوا بـە وێنـەی پاڕانەوەی بەندەیێکی بێ دەستەڵات، بۆ ئەوەیش هەموو گومان بەرێ بەدرۆبخاتەوە کە ئەیان ووت: عیسا بەشێکی هەیە لە هاوردنە خوارەوەی ئەو خوانەو خۆی کردویەتی نەك خـوای تاك و تەنها.

﴿ قالَ اللهُ إنِي مُنَزِلُنا عَلَيْكُمْ فَمَنْ يَكْفُرْ بَعْدُ مِنْكُمْ ﴾ خوا فەرموی: من بەڕاستی ئەنێرمـە خوارەو ئەخوانە بەسەر ئێـوەدا. دوایـی هەرکەسـێ بـاوەڕ نـەهێنێ لـە ئێـوە دوای ناردنـە خوارەوەی ئەو خوانە کە کارێکی پەك خەرەو بەزۆرکەس نەکراوە.

﴿ فَإنِي أعَذِبُهُ عَذاباً لاّ أعَذِبُهُ أحَداً مِنَ العالَمِينَ ﴾ دوایی من بەڕاستی سزای ئەو کەسـە ئەدەم بە سزایێ بەجۆرێ بێ من سزا نادەم بەو جۆرە سزایە هیچ یەکێ لە بونەوەران.

پوختەی مانای ئەو ئایەتە بەم جۆریە: خوای مەزن پاڕانەوەکەی لـە عیسا وەرگـرت بـۆ ئەوەی هاوڕێکانی باوەڕیان بەتین تربێ بە عیساو بڕوایان کەم و کـوڕی پـەیدا نـەکا، لـە

کاتی سەرپێچیدا بەڵگەو بیانویان نەمێنێ و شایستەی سزای بێ وێنەبن کاتێ وەرگەڕان لە ئایین، چونکە خۆیان پێش نیازییان کردووە، هەرکەسێ وولآمی پێش نیازیان درایەوە هەموو ڕێگەی بیانویان لێ ئەبەسترێ کە پەشیمان بویەوە لە باوەڕهێنان.

فەرمودەی زانایان لە بارەی خوان و داواکردنی خوان زۆر زۆرە: ئایا داواکەرەکان خاوەن باوەڕبوون یا خاوەن گومان؟ ئایا خوا نەکە لە کاتی دواکردندا هاتە خواریانە؟ هاوڕێکانی عیسا لەو خوانەیان خواردیانە؟ ئەوانەیان پاش گەزبونەوە لە باوەڕهێنان ئایا خوا کردنی بە مەیمون و بەراز؟ خوا باسی هیچ شتێ لەوانەی نەکردوە بە ڕونی.

بەڵام ئەو شتەی پێویستبێ لەسەر ئێمە ئەبێ ئێمە باوەڕی تەواومان هەبێ کە ئەو ڕوداوانە پەیدابوون، ئەو گفتوگۆیانە کراوە لە نێوان عیسا و هاوڕێکانیدا، ئیتر شیکردنەوەیان بۆ ئێمە لە پایە پێویست کراوەکانی سەرشانی ئێمە نیەو هەواڵەی زانیاری بێ وێنەی خوایە. تاقمێ لە گاوەرەکان ئەیان ووت: بە ڕاستی عیسا و دایکی عیسا هەردووکیان خوان، بۆیە خوای مەزن لەو بارەوە پرسیار لە عیسا ئەکاو ئەفەرموێ:

وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ سُبْحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِى بِحَقٍّ ۚ إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ ۚ تَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِى وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِكَ ۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَآ أَمَرْتَنِى بِهِۦٓ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۚ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ ۖ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِى كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ

عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴿١١٧﴾ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١١٨﴾

﴿ وَإِذْ قالَ اللهُ يا عِيسى ٱبْنَ مَرْيَمَ ﴾ تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە خوا فەرموی بە عیسا کوڕی مریەم: ئەو بانگەکردنەی عیسا لەلای خوای مەزنەوە زانایان جیاوازن بۆ کاتی ئەو بانگ کردنە: هەندێکیان ئەڵێن: لە ڕۆژی دواییدا ئەبێ. هەندێ تریان لایان وایە لەو کاتەدا بووە خوا بەرزی کردەوەی بۆ ئاسمان.

﴿ أَنْتَ قُلْتَ للناسِ اتَّخِذُوني وَأُمِّي إِلَهَيْنِ مِنْ دُونِ اللهِ ﴾ ئایا تۆ ووتوتە بە ئادەمیزاد: ئێوە من و دایکم بکەن بە دوو خوا لە جگەی خوا. خوای مەزن بو پرسیارە مەبەستی عیسا نیە بە تایبەتی، چونکە خوا خۆی ئەزانێ و ئاگادارە بەشتێ عیسا وتوێتی. بەڵکو مەبەستی خوا ئەوەیە بەڵگەدانێ لەسەر ئەو کەسانە بوختانیان ئەکردو لایان وابوو کە عیسا و دایکی دوو خوای جیاوازن لە جگەی خوای مەزن.

﴿ قالَ سُبْحانَكَ ما يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ ما لَيْسَ لِي بِحَقٍ ﴾ عیسا ووتی پاك و خاوێنی بۆتۆیە لەوەی جگەی تۆ خوای تر هەبێ، ئەوەی دراوەتە پاڵ من بوختان و درۆیە، نابێ و شایستە نیە بۆمن کە من شتێ بڵێم ڕاست نەبێ، ئەوەی عیسا ووتی زۆر ڕاستە چونکە عیسا پێغەمەربوەو پێغەمەر پارێزراوە لە هەڵخلیسکان و گوناە، بەڕاستی عیسا نێرراوی خوایە بۆ جەنگ کردن لەگەڵ هاوبەشدانەران بۆ خواو بانگی یەکێتی بۆ خوا بڵاوبکاتەوە، ئیتر چۆن داوای خوایەتی ئەکاو بانگی ئادەمیزاد ئەکا بۆ پەرستنی خۆی.

﴿ إِنْ كُنتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ ﴾ ئەگەر من ئەو شتە نارەوایەم ووتبێ بەڕاستی تۆ ئەو شتەت زانیوە، یانێ من پێویستم بە بیانو هێنانەوە نیە، چونکە خۆت ئەیزانی نەم ووتوە، ئەگەر ووتبێتم خۆت زانیوتە.

﴿ تَعْلَمُ ما في نَفْسي وَلا أعْلَمُ مافي نَفْسِكَ إنَكَ أنْتَ علاّمُ الغيُوبِ ﴾ تۆ ئـەزانی بەشـتێ لە دەرونی مندایەو شاراوەتە لـە دڵماو، من نازانم بە شتێ شاراوەتەوەو دیارنیەو هـەرخۆت ئەیزانی و لای خۆتە. بەڕاستی تۆ هەر تۆی هەموو نهێنیە بزانی کە جگەی تۆ نایانزانێ.

ووشەی (نفس) بەکارئەهێنرێ بە مانـازیندەیی بونـەوەران بـە گشـتی، هـاتوە بـە مانـا هەرشتێ وەك ئەبێژرێ ئەمە هەر ئەو شتە (هذا هو نفسه). هاتووە بـەمانای شـتێ وەك لـەو ڕستەیەدا هاتووە.

﴿ ما قُلْتُ لَهُمْ إلاّ ما أمَرْتَني بِهِ أنِ أعْبُدُوا اللهَ رَبي وَرَبَكُمْ ﴾ من نەم ووتوە بە ئـادەمیزاد مەگەر تۆ فەرمانت دابێ بەو شتەکە پێویستە ئێوە خوا بپەرستن کە بریتیە لـە پەروەردەکەری من و لـە پەروەردەکەری ئێوە.

﴿ وَكُنْتُ عَلَيْهِمْ شَهِيداً ما دُمْت فِيهِمْ ﴾ وەمن ئاگادر بووم بەسەریانەوە، من قەدەغـەم کردبوو لـەوان کە ئەو شتە نارەوایانە بلێن و ئاگاداری باوەڕداران و بێ باوەڕان بووم لـەو ماوەیەدا من لـەناویانا بووم.

﴿ فَلَما تَوَفيْتَني كُنتَ أنْتَ الرَقِيبَ عَلَيْهِمْ وَأنْتَ عَلَى كُـلِ شَـيْءٍ شَـهِيدٌ ﴾ دوایـی تـۆ کاتێك منت وەرگرتووەو ڕەوانەکردنی من بۆ سەر زەوی کۆتـایی پـێ هـات، تـۆ خـۆت بووی بە ئاگادار بەسەریانەوە، من نازانم چ شتێکتان کردووە لـە پـاش مـن و، تـۆ بەسـەر هەموو شتێکا ئاگاداری و هیچ شتێ لە تۆ وون نابێ.

﴿ إنْ تُعَذِبُهُمْ فأنَهُمْ عِبادُكَ وَإنْ تَفعِر لَهُمْ فَأنِكَ أنْتَ العَزيزُ الْحَكيمُ ﴾ ئەگەر تۆ سـزایان بدەی دوایی بە ڕاستی ئەوان بەندەی تۆن و هیچ ڕەخنەیە لـەسەر خاوەن و گەورەی ئـەوان ناگیرێ و تۆ لـە هەموو کەس میهرەبان تری، ئەوان شایسـتەی ڕەخنـەگرتن نـین لـە تـۆو، ئەگەر تۆ لـەوان خۆشببـی، دوایی بە ڕاستی تۆ زۆر گەورەو بەدەستەڵاتی، هەموو شتێ لـە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ لـە سزادان و لـێی خۆشبوون.

کاتێ عیسا ڕونی کردەوە ئەو کارە پوچەی گاورەکانی لـەسەری بوون لـە هاوبەشـدانان بۆخوا، خوای مەزن فەرموی:

قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوْمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدْقُهُمْ ۚ لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١١٩﴾ لِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا فِيهِنَّ ۚ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌۢ ﴿١٢٠﴾

﴿ قالَ الله هذا يَوْمُ يَنفَعُ الصادِقِينَ صِدْقُهُمْ ﴾ خوا ئەفەرموێ لە پاشەڕۆژدا: ئەم ڕۆژەیە سوود ئەبەخشێ بەڕاست گۆیان ڕاستیەکەیان کە لە جیهاندا پەیدا بوە لەوانەوە. لە ڕۆژی دواییدا ڕاستی ووتن سود بەخش نیە، جگەی ڕاستی ناتووانرێ شتێ ببێژرێ بەڵگو ئادەمیزاد سود وەرئەگرێ لە پاشەڕۆژدا بەو ڕاستیە ئەمرۆ بیڵێ نەك لەو ڕۆژەدا.

﴿ لَهُمْ جَنّاتٌ تَجْري مِنْ تَحْتِها الأنْهارُ خالِدِينَ فِيها أبَدَاً ﴾ بۆ ئەو ڕاست وێژانە هەیە چەندین بەهەشت ئەچێ بەژێر درەختەکانیاو بەم لاولای کۆشکەکانیا نا چەندین ڕوباری ئاویی شیرین و بەتام بەردەوامن لەنێو ئەو بەهەشتانەدا هەتا هەتایە.

﴿ رَضِيَ الله عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ ذلِكَ هُو الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴾ خوا ڕازیە لەو ڕاست وێژانەوخۆشی ئەوێن بەهۆی کرداری چاکیانەوە، وە ئەوانیش خوایان خۆش ئەوێ و ڕازین لەخوا بەهۆی ئەو پاداشتەوە وەریان گرتووە لەبەر ڕاست ووتنیان، ئەو چونەیان بۆ ناو ئەو بەهەشتانە ڕزگاربوونی زۆر گەورەیە بۆیان چونکە خۆشی پاشەڕۆژ بەردەوامە، خۆشی جیهان نامێنێ و بەزویی کۆتایی پێ دێ.

﴿ لله مَلْكُ السَماواتِ وَالأرْضِ وَما فِيهِنَّ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾بۆ خوا بە خاوەنیەتی و پاشایەتی ئاسمانەکان و زەوی و شتێك لەنێو ئەواندایە، بە ئادەمیزادو بە جگەی ئادەمیزادەوە بە پێغەمەران و جگەی پێغەمەران، خوای مەزن ئاگادارتان ئەکا بەو ئایەتە لەسەر بوختان و درۆکردنی گاورەکان کە باوەڕیان وایە عیسا و دایکی عیسا خوان لە جگەی خوا، وەخوا توانای بەسەر هەموو شتێکا هەیە، دارایی و پاشایەتی ئەبەخشێ بەهەر کەسێ ئارەزۆی هەبێ بەبێ پرسیار.

## ﴿ سورەتی ئەلئەنعام ﴾

ژمارەی ئایەتەکانی (١٦٥) ئایەتن. لە مەکە هاتوەتە خوارەو جگە لە ئایتەکانی (٢٣، ٩١، ٩٣، ١١٤، ١٥١، ١٥٢، ١٥٣، ٢٠) ئەو نۆ ئایەتانە لە مەدینە هاتونەتە خوارەوە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ ۖ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن طِينٍ ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلًا ۖ وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ ۖ ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ ﴿٢﴾ وَهُوَ ٱللَّهُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَفِى ٱلْأَرْضِ ۖ يَعْلَمُ سِرَّكُمْ وَجَهْرَكُمْ وَيَعْلَمُ مَا تَكْسِبُونَ ﴿٣﴾

### ﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

### بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿ الْحَمْدُ للهِ الذي خَلَقَ السَماواتِ والأرْضَ ﴾ هەموو سوپاس و ستایش بۆ خوایەکی ئەوتۆیە دروستی کردووە ئاسمانەکان و زەوی.

﴿ وَجَعَلَ الظُلْماتِ وَالنُورَ ﴾ وەخوا دروستی کردووە چەندین تاریکی و ڕوناکی بە، توانای بێ وێنەی خۆی. ئەو ڕستەیە بۆمانی ڕون ئەکاتە کە تاریکی بەر لە ڕوناکی دروست کراوە، تاریکیش زۆرن: وێنەی تاریکی شەو. تاریکی دەریا. جێگەی تاریك.

هەموو شتێ تاریکیکەی جیاوازە لە تاریکی شتێ تر. بەلاّم ڕوناکی هەریەك جۆرەو یەك ژمارەیە چونکە هەر یەك هۆی هەیە ئەویش ئاگرە، هەرچەندە ئەبێژرێ ڕوناکی خۆر. ڕوناکی ئەستێرە. هەروەها، ئەوان نابنە هۆی زۆری ڕوناکی. هەروەها ئەو ڕستەیە گومانی ئاگر پەرستەکان پوچ ئەکاتەوە کە گومانیان وایە خوا ڕوناکی دروست کردوە. شەیتان تاریکی دروست کردوە.

﴿ ثُمَ الذِيْنَ كَفَرُوا بِرَبِهِمْ يَعْدِلُونَ ﴾ لە پاش ئەو هەمووە بەلّگە ڕونانە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە پەروەردەکەری خۆیان ئەکەن بە هاوتای بتەکان و بەرانبەری ئەوانیان ئەکەن بۆ پەرستنیان کە توانای هیچ شتێکیان نیەو ناتوانن زیان و سوود نەبەخۆیان و نە بە جگەی خۆیان بگەیەنن. زۆر جێگەی سەر سوڕمانە ئەو بەلّگە بەهێزانە کار نەکەنە سەر ئەقلّی بت پەرستان و ئەو دلّەی ئەوتۆیان کوێرە لە ئاستی ڕاستی و وای دائەنێن بۆخوا هەیە هاوتاو وێنەیە بۆ پەرستن و سوپاس کردن.

﴿ هُوَ الْذي خَلَقَكُمْ مِنْ طِينٍ ثُمَ قَضى أجلاً ﴾ خوا کەسێکی ئەوتۆیە ئێوەی دروست کردووە لە قوڕ. یانێ ئادەمی باوکی ئێوە کە ئادەمە ڕاستەو خۆ لە قوڕ دروست کراوەو ئێوەیش لە ئاویی ئەو دروست کراون. لە پاشا خوا فەرمانی داوە بە دیاری کردنی ماوەیە بۆ کۆتایی پێ هاتنی ژیانتان، دوای ئەو ماوەیە ئێوە ئەمرن.

﴿ وَأجَلٌ مُسَمّى عِنْدَهُ ﴾ وە لەلای خوا هەیە ماوەیەکی دیاری کراوو ناوبراو بۆ زیندوبونەوەتان لە پاش مردنتان لە ڕۆژی دوایدا، جگە لە خوا کەس نازانێ چ کاتێ دەست پێ ئەکا.

بە کورتی خوا فەرمانی داوە بە دووماوەی ناوبراو بۆ هەموو ئادەمیزاد (١) ماوەیەکیان دوایی دێت بە مردنی ئەو کەسەو دواتر ئەزانرێ چەندە ژیاوە (٢) ماوەیەکی تری ناوبراو هەیە کە کاتی زیندووبونەوەیانە لە پاشە ڕۆژدا. جگە لە خوا کەسی تر نازانێ چ کاتێ دەست ئەکاو ماوەی هاتنەکەی چەندەی ماوە، ئەو کاتەیش کۆتایی پێ نایە.

﴿ ثُمَّ أَنْتُمْ تَمْتَرُونَ ﴾ لە پاش ئەو بەڵگانە لەسەر تواناى خوا ئێوەی بێ باوەڕ گومان پەیدا ئەکەن و بەدرۆی ئەزانن زیندوبونەوەی پاشە ڕۆژ، لەگەڵ ئەوەیشدا ئێوە لە نەبوونەوە پەیدا کراون، زۆر ئاسانترە لای خوا جارێ ترگیان بکاتەوە بە بەرتا بە کۆکردنەوەی ئەو شتانە لە لەشی ئێوەدا بڵاوبونەتەوە بەسەر زەویدا. زۆر جێگەی سەرسوڕمانە گومان پەیدا بکرێ لە زیندوبونەوەی ئادەمیزاد لە ڕۆژی دواییدا بەو ئاسانیە لەگەڵ ئەوەیشدا ئەو خوایە ئەم گەردونە گەورەی دروست کردووە! ئەبێ زیندوبونەوە چ گرانیەکی تێدابێ بۆ خوا؟

﴿ وَهُوَ اللهُ فِي السَّماواتِ وَفِي الأَرْضِ يَعْلَمُ سِرَّكُمْ وَجَهْرَكُمْ وَيَعْلَمُ ما تَكْسَبونَ ﴾ وە خوا ئەو خوایە هەر بە تەنها ئەو شایستەی پەرستنە لە ئاسمانەکان و لەنێو زەویدا، جگەی ئەو کەس شایانی پەرستن نیە. خوا ئەزانێ بە نهێنی ئێوەو ئەیشزانێ بە ئاشکرایی ئێوە، یانی ئەو شتانە پەنهانتانداوە لە دڵتاناو ئەوانەیش بە زمان و بەکردار ئاشکرای ئەکەن خوا ئەیانزانێ و، ئەزانێ بە شتێ ئێوە ئەیکەن لە چاکەو لە خراپە، لە پاشە ڕۆژدا پاداشتان ئەداتەو تۆڵەتان لێ ئەکاتەوە.

ئەو سێ ئایەتانەی ڕابوردن بەڵگەن لە سەر یەکێتی گەورەی خوا: بە ئایەتی یەکەمیان تێمان ئەگەیەنێ ئاسمانەکانی و زەوی دروست کردوە. بە ئایەتی دووەم ئاگادرمان ئەکاتەوە ئادەمیزادی دروست کردووە لە قوڕ، لە پاش مردنیان جارێ تر زیندویان ئەکاتەوە. بە ئایەتی سێهەم پێمان ئەناسێنێ زانیاری خوا دەوری داوە بە هەموو شتێ نهێنی و ئاشکرادا بنچینەکانی بڕوا بە خوا سێ شتن: دانانی خوا بە تاکو بە تەنها. باوەڕ بە پێغەمەران. زیندوبونەوە. ئەو سێ ئایەتانەی پێشوو باسی یەکێتی بەڵگەکانی کرد، لەم سێ ئایەتەی دوایدا باسی پێغەمەرایەتی ئەو کەسانەمان بۆ ئەکا پێغەمەرایەتی بە درۆ ئەخەنەو.

وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ آيَةٍ مِّنْ آيَاتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴿٤﴾ فَقَدْ كَذَّبُوا بِالْحَقِّ

لَمَّا جَآءَهُمْ فَسَوْفَ يَأْتِيهِمْ أَنۢبَٰٓؤُا۟ مَا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٥﴾ أَلَمْ يَرَوْا۟ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مَا لَمْ نُمَكِّن لَّكُمْ وَأَرْسَلْنَا ٱلسَّمَآءَ عَلَيْهِم مِّدْرَارًا وَجَعَلْنَا ٱلْأَنْهَٰرَ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمْ فَأَهْلَكْنَٰهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴿٦﴾

﴿ وَما تَأتِيهِمْ مِنْ آيةٍ مِنْ آياتِ رَبِهِمْ إلاّ كانُوا عَنْها مُعْرِضِينَ ﴾ وەنایە بۆلای بێ باوەڕان هیچ ئایەتێ لە ئایەتەکانی پەروەردە کەریانەوە لەسەر یەکێتی خـواو لەسـەر زیندووبونـەوەو لەسەر پێغەمەرایەتی موحەمەد ﴿ ﷺ﴾ مەگەر ئەوان واز ئەهێنن لە نـاوەڕۆکی ئـەو ئایەتـە تەماشای بەڵگەکانیان ناکەن و بەدرۆی ئەخەنەوە.

یانێ بە ڕاستی بێ باوەڕان واز لە بەڵگەی ڕاسـت ئـەهێنن و خۆیـانی لێ لا ئـەدەن بـێ ئەوەی ئاوڕێکی بۆ بدەنەوە بە وردی، هەتا سەرشۆڕی فـەرمانی ناوەڕۆکـەکانی بـن.بـەڵام ئەوان وازیان هێناو لایاندا لە ڕاستی بەر لەوەی تەماشـایان بکـەن و بیـان خوێننـەوە، لـە خۆیان بایی بوون.

بۆ زانین: ئەو ئایەتەو چەندین ئایەتی تر بەڵگەن لەسەر ئـەوەی کـە بـە ڕاسـتی ئیسـلام لەسەر بەکارهێنانی ئەقڵ و سەربەستی دامەزراوە. بۆ هیچ کەسێ شایستە نیە لەهـەر پلـەو پایەو پیشەیەکدا بێ کە داوا بکا لە جگەی خۆی بەبێ بیرکردنەوە خۆی بدا بە دەستییەوەو سەر شۆڕی گفتوگۆکانی بێ بە کوێرانەو بەبێ بەڵگە هێنانەوە بۆی. ئەوەتە خوای گەورەی دروست کەری هەموو بونەوەران پێویستی نـەکردووە لەسـەر بـەندەکانی خـۆی باوەڕبـە

خۆی بکەن و سەرشۆڕی فەرمودەی نامەکانی و پێغەمەرەکانی بن بە کوێرانەو بەبێ بەڵگە، بەڕاستی خوا بەڵگە ئەهێنێتەوە بۆ ئادەمیزاد لەسەر ئەو شتەی فەرمانی پێ ئەداو بانگی بۆئەکا، داوا لە هەموو ئاقڵێ ئەکا تەماشای ئەو بەڵگانە بکەن و بە قوڵی لێیان ووردببنەوە فەرماندانی خوا لە کاروباری فەرمودەی خۆیا ڕەنگ ئەداتەوە لە وێنەی هەموو زانایەکی دادپەروەر، هەرچەندە دووریشە بەراوردی دروست کراوانی خوا بکرێ لەگەڵ دروست کەری خۆیان.

﴿ فَقَدْ كَذَّبُوا بِالْحَقِ لَما جاءَهُمْ فَسَوْفَ يَأْتِيهِمْ أبناء ماكانُوا بِهِ يَسْتَهْزِؤُونَ ﴾ دوایی بە ڕاستی بێ باوەڕان باوەڕیان بە ڕاستی نەهێنا کاتێ چوبو بۆلایان و بەدرۆیان ئەخستەوە قورئان و ئەو ڕاستیە چوبو بۆلایان، دوایی دێت بۆلایان هەواڵەکانی شتێ ئەوان گاڵتە ئەکەن بەو شتە کە ڕاستی قورئانی پیرۆزە کاتێ لە دوا ڕۆژدا سزایان ئەدرێ.

ئەو هەواڵانە هەندێکی لە جیهاندا دەرئەکەوێ لەو کاتانەدا توشی نەگبەتی ئەبن بە هۆی ئابرو چونیانەوە کە چاویان بە ئاڵای شەکاوەی ئیسلام ئەکەوێ، تواناو شکۆی موسڵمانان لە گەشەکردندا ئەبێ، لە پاشە ڕۆژیشدا دەرئەکەوێ کاتێ تۆڵەی درۆکانیان لێ ئەسێنن.

ئادەمیزاد لە بێ باوەڕیدا سێ بەشن: (١) ئەو کەسانەن خۆیان لە ئاستی ڕاستی گێل دەکەن، گرنگی پێ نادەن و باوەڕی پێ ناهێنن. بەڵام وەك یارمەتی نادەن دژیشی ناوەستن. (٢) ئەو کەسانەن باوەڕ بە ڕاستی ناکەن و بەدرۆی ئەخەنەوە. بەڵام گاڵتەی پێ ناکەن و ڕاڕان. (٣) ئەو کەسانەن ڕاستی بەدرۆ ئەخەنەوە دژی ئەوەستن و گاڵتەی پێ ئەکەن و جەنەبازی ئەکەن. کەواتە سزای یەکەمیان سوکترە لە دوهەمیان، سزای دووهەمیان سوکترە لە سزای سێهەمیان. هەریەکەیان بە گوێرەی کردەوەی خۆیان دادپەروەرانە سزای خۆیان وەرئەگرن، مەبەست لە ترساندن و هەڕەشەکردن بەو ئایەتەی پێشو بەشی سێهەمیانەو لەمەو پاش ئەگا بە پاداشتی بێ باوەڕی و گاڵتە کردنەکەی.

عەرەبەکان زوربەی هەواڵی بەسەرهاتی گەلی عادو سەمودو لوتیان ئەزانی بەبوّنەی هاتو چوّیان بوّ شوێنەکانیان، نیشـانەی مانـەوەی جێگـەکانیان ئـەبینی گفتوگـوّی ئـەوانیان بـوّ یەکتری ئەگێڕایەوە، زۆربەباشـی ئـەیانزانی ئـەو گەلانـە خـوا لـەناوی بـردوون، چونکـە پێغەمەرەکانی خوّیانیان بوّ دروّخستبووەوە بوّ ڕونکردنەوەی ئەو باسە خوا ئەفەرموێ:

﴿ أَوْ لَمْ يَرَوْا كَمْ اَهْلَكْنا مِنْ قَبْلِهِمْ مِنْ قَرْنٍ ﴾ ئایا ئەو بێ باوەڕانە نازانن ئێمە لە پێـش ئەوانەوە زۆر گەلمان لەناوبردون لە دانیشتوانی خولەکان.

زانایان لە مەبەست لە مانای ووشەی (قرن) بیریـان جیـاوازە: هـەندێکیان لایـان وایـە بریتی‌یە لەسەد ساڵ، هەدنێ تریان ئەڵێن: هەشتا سـاڵە، ئـەوەی شـایەنی باسـە و نزیکبـێ ئەمەیە: نەبەماوەی زۆر یا کەم ناوی نەبراوە، ئەوی بە فراوانی بۆی دانرابـێ مەبەسـت لـە خولەك ئەمەیە: دانیشتوان لەو ماوەیەدا کۆتایی بەتەمـەنیان دێ و جێگـە چـۆڵ ئـەکن بـۆ دانیشتوانی تر کە جێگەیان بگرنەوە. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: (قـرن) بریتی‌یـە لـە (٧٠) ساڵ یا (٦٠) ساڵ – ٤٠ – ١٢٠) ساڵ. یا (٢٠) ساڵ.

ئەو ئایەتە هانی ئەو کەسانە ئەدا کە پێغەمەریان بە درۆ خستۆتەوە و هەڕەشەیان لێ ئـەکا تەمێ خواربن بە لەناوبردنی گەلانی ڕابردوو کە بەڕاسـتی ئـەو گەلانـە سـامان و هێزیـان زۆرتربووەو هۆی پەیداکردنی سامانیان لە عەرەبەکان فراوانتربووە. وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ مَكَّناهُمْ فِي الأرضِ ما لَمْ نُمَكِنْ لَكُمْ ﴾ ئێمە بەخشـیومان بـەو گەلانـە جێگەیـە لـە زەوی‌دا و پێمان دابوون هێزو کەرەسەی وا بتوانن بـەکاریان بـهێنن شـتێکی ئـەوتۆ ئێمـە فەرمانمان بەخشیوە بە ئێوە لە خۆشی و تەمەنی درێژو مانەوەتان لەو جێگەیەدا.

﴿ وَأَرْسَلْنا السَماءَ عَلَيْهِمْ مِدْراراً وَجَعَلْنا الأنهارَ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهِمْ ﴾ وە ئێمە ڕەوانەمان کردبوو بۆ سەریان باران لە ئاسمانەوە بە زۆری و پەیاپەی بێ بڕانەوە لە کاتی پێویسـتی‌دا، بەو بۆنەوە بەرهەم و دانەوێڵەی زۆریان پەیدا ئەکردو، ئێمە گێڕابوومان بۆ ئەوان چـەندین ڕوبارێ ئەڕۆیشت بەژێر درەختی ئەو گەلانەدا بەم لاو لای کۆشکەکانیاندا.

﴿ فَأَهْلَكْنَاهُمْ بِذنوبهم ﴾ دوایی ئێمە ئەو گەلانەمان لە ناوبردن بەهۆی گوناهەکانیانەوەو، ئەوانە نەگەیشتنە فریایان و ڕێگەی نەمانی بۆ نەگرتن بەهۆی بێ سوپاسیانەوە، باوەڕیان بە پێغەمەرەکانی خۆیان نەهێناو یاغی بوون لە فەرمانی خوا، ئەو کەسەی ئەو گەلانەی لەناوبرد بەو هەمووە تواناو شکۆیەی هەیانبوو، توانای ئەوەی هەیە ئێوەی لاواز لەناو بباو سزای زۆر سەختتان بدا.

﴿ وَأَنْشَأْنا مِنْ بَعْدِهِمْ قَرْناً أَخَرِيْنْ ﴾ وە ئێمە پەیدامان کرد لە دوای ئەوان دانیشتوانی خولێ تر لە جێگەی ئەواندا. کەواتە ئادەمیزادی ژیر ئەوەیە تەمێ خواربێ بە جگەی خۆی بەر لەوەی تەمێ بەدرێ بەبێ ویستی خۆی.

پێغەمەری خوا ﴿ ﷺ﴾ بۆ ماوەی سێزدە ساڵ مایەوە لە مەکە پاش هاتنە خوارەوە سروش بۆلای هەتا کۆچی دوایی کرد بۆ مەدینە، بە درێژای ئەو ماوەیە بانگی دانیشتوانی مەکەی ئەکرد بۆلای باوەڕهێنان بە تاك و تەنهای خواو بە دادپەروەری و ڕێگە گرتن بە هاوبەشدانان بۆ خواو بۆ ستەمکاری، شێوەی بانگەوازەکەی لە جێگەی دانراوی خۆیابوو بۆ ئامۆژگاری، دوای ئەو هەمووە کۆششە کەمێ لە دانیشتوانی مەکە وولامی پێغەمەریان دایەوەو زوربەیان پشتیان تێ کرد، سەرباری ئەوانەیش پەلاماریان داو ئازاریان ئەدا بە دەم و بە دەست و بە پروپاگەندە، لەو ماوەیەدا ئارامی زۆر گرت و خۆی ڕاگرت لەسەر ئازاریان و هانی ئەدان بۆ باوەڕهێنان، بۆ باسی ئەو ڕوداوە خوا ئەفەرموێ:

وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَٰبًا فِى قِرْطَاسٍ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ لَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ وَقَالُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ مَلَكٌ ۖ وَلَوْ أَنزَلْنَا مَلَكًا لَّقُضِىَ ٱلْأَمْرُ ثُمَّ لَا يُنظَرُونَ ﴿٨﴾ وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ مَلَكًا لَّجَعَلْنَٰهُ رَجُلًا وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ ﴿٩﴾ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَحَاقَ

بِٱلَّذِينَ سَخِرُوا۟ مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿١٠﴾ قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ ٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿١١﴾

﴿ وَلَوْ نَزَّلْنا عَلَيْكَ كِتاباً فِي قِرْطاسٍ فَلَمَسُوهُ بأيدِيَهُمْ ﴾ وەئەگەر ئێمە ڕەوانەمان بکردایە بۆسەرتۆ بەیەکجار نامەیە بنوسرایەتەوە لە کاغەزێکداو بیانخوێنایتەوە دوایی ئەو بێ باوەڕانە چاویان بکەوتایە بەو نامەیە و دەستیان لێ بدایە.

﴿ لَقالَ الذِيْنَ كَفَرُوا إنّ هذا الأسْحَرُ مَبَيَنٌ ﴾ بەڕاستی ئەیان ووت کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێنا بە ئەو شتەی تۆ هێناوتە: هیچ شتێ نی‌یە مەگەر جادوێکی ئاشکرایە ئەو جۆرە کارو گفتوگۆیانە وەنەبێ هەر ئەوان وابن بە تەنها. بەڵکو لە زوربەی گەلاندا وێنەیان بەو جۆرە خراپەیەکە خۆیان ئەیکەن و بە باشی دائەنێن پەیدابوون، بگرە لەم سەردەمەی ئێمەدا تاقمێکی زۆر هەن بەوانەی ئەوانەوە واز ناهێنن، بەدرۆی ئەخەنەوە شتێکی وا خۆیان ئەبینن و ئەیکەن نەك بەڵێن: جادوە بەڵکو ئەڵێن هەر نەبووەو نەکراوەو ئەگەر کرابێ بە خراپی نازانن، واتە بە گورك بڵێن: مەڕەو بە ئەژدیها ئەڵێن کۆتری ئاشتی‌یە. بۆ نموونە: بەعسیەکانی عێراق زۆرتر لە (١٠) هەزار کەسیان لە هەڵەبجەو خۆشناوەتی و سێوسێنانیان بە گازی کیمیاوی گوشت و ئەیان ووت ئێمە نەمان کردووە، ئەگەر کرابێ ڕوداوێکی ناوخۆیی‌یەو دژی یاسا نی‌یە، کوشتنی مناڵ و پیرو ژن بە خراپ نەئەزانی.

﴿ وَقالُوا لَوْلا اونْزِلَ عَلَيهِ مَلَكٌ﴾ وەبێ باوەڕان ئەیان ووت ئەگەر موحەمەد ڕاست ئەکا بۆ نایەتە خوار بەسەریا فریشتەیە بڵێ: پێغەمەرەو یاریدەی بداو ئێمە بترسێنێ.

﴿ وَلَوْا أنْزَلْنا لَقُضيَ الأمْرُ ثُمَ لا يَنضَرُونْ ﴾ وەئەگەر ئێمە ڕەوانەمان بکردایەتە خوارەوە فریشتەیە وەك ئەوان داوای ئەکەن و باوەڕیان نەهێنایە بە ڕاستی فەرمانی لەناوچونیان

جێبەجێ ئەکراو ئیشەکە ئەبڕایەوە هەموویان ئەمردن لە چاونوقاندنێکا بە وێنەی گەلانی ڕابردوو، لە پاشا مولّەتیان نەئەدارا چاونوقانێ بۆ پەشیمان بوونەوە و بیانو هێنانەوەیان.

پرسیار- هۆی چی‌یە کە فریشە هاتە خوارەوە پێویستە بێ باوەڕان لە نێو بچن، چۆن هاتنەخوارەوەی قفریشتەکان و لەناوبردنی بێ باوەڕان بەستراوە بەیەکەوە؟

وەڵام- زانایا ئەڵێن ئادەمیزاد هەرکاتێ فریشتەیان بینی کتوپڕ ئەمرن و گیانیان دەرئەچێ، چونکە لە زانیاری هەرە کۆنی خوادا تێپەڕیوە هەرکەسێ فریشتە هات بۆلای و بێ فەرمانی خوای کرد لە ناوی ئەبا. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ وەڵامی ئەو پرسیارە ئەمەی خوارەوەیە.

ئەو لەناوبردنەیان پەیوەستە بە هاتنەخوارەوەی فریشتە لەبەر هۆیەکی نهێنی جگە لە خوا کەسی تر نایزانێ، و ئەو هۆیە ئەقڵ ڕێگەی پێ نابا کەواتە پێویستە لەسەر ئێمە بێ دەنگ بین لەکاتێدا خوا هیچ هۆیەکی نەدرکاندووە.

لەبەر ئەوەی بت پەرستان ئەیان ووت: بۆچی خوا ڕەوانە ناکا بۆلای فریشتەیە، خوای مەزن فەرمووی:

﴿ وَلَوْ جَعَلْنَاهُ مَلَكا لَجَعَلْنَاهُ رَجُلاً ﴾ وەئەگەر ئێمە ئەو فروستادەمان بکردایە بە فریشە، ئێمە ئەو فریشتەیەمان ئەگێڕا بە شێوەی پیاوێکا بە وێنەی جبرەئیل کە ئەهات بۆلای پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ هەتا ئێوە توانای ئەوەتان ببێ تەماشای بکەن.

یانێ ئەگەر ئادەمیزاد فریشتە بهاتایە بۆلایان لەمانەی خوارەوە لەدەرنەئەبو:

یا بە شێوەی فریشتەیی ئەمایەوە یا وێنەی مرۆڤێ بەسەردا ئەکێشرا، بێگومان ناگونجێ لەسەر وێنەی فریشتە بمێنێتەوەو فروستادە بێ بۆلای ئادەمیزاد، چونکە سروشتی فریشتە جگەی سروشت و وێنەی ئادەمیزادە، گەیاندی پەیام پێویستی بەهاوڕەگەزی و لەیەك چون هەیە، فریشتەیش دروست نەکراون بۆ ئەوەی لەسەر زەوی بژین.

کەواتە ئەبێ ئەو فریشتەیە بچێتە وێنەی ئادەمیزادەوە، ئەگەر وایشبێ وێنەی جارانی لێ دێتەوەو بت پەرستان ئەڵێن: ئێمە فریشتەمان ئەوێ و ئادەمیزادمان ناوێ و گیروگرفتەکە

وەك خۆی ئەمێنێتەوە بەبێ وەڵام. ئەوەی شایانی باسبێ ئەو ئایەتە بەڵگەی ڕونە لەسەر ئەمەی کە خوا فەرمودەی خۆی ڕوبێ ئەکا بۆلای ئەو بت پەرستە درۆزنانە بە جۆرێ کە زانایان لەگەڵ هاوسەری خۆیانا بدوێن. نەك بە زۆر پەلاماریان بدرێ.

﴿ وَلَلَبَسْنا عَلَيْهِمْ ما يَكْسِبُونَ ﴾ وە بە ڕاستی ئێمە سەر لێ تێك چونمان ئەدا بەسەریانا بەشتێ ئەوان لێیان تێك بچێ. یانێ ئەگەر ئێمە بمان گێڕایە فریشتە بە وێنەی ئادەمیزادا ئەوانگومانیان ئەبردە ئەو فریشتەیە بە ڕاستی ئادەمیزادە، ئەو شتەی ئەیان ووت بە پێغەمەر دووپاتیان ئەکردەوە، چونکە نەیان ئەزانی فریشتەیە.

خوای مەزن دڵخۆشی پێغەمەر ئەداتەوەو ئەفەرموێ: هەر تۆنیت گاڵتەت پێ کرابێ:

﴿ وَلَقَدْ اُسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِنْ قَبْلِكَ ﴾ وە بە ڕاستی گاڵتە کراوە بە چەند نێراو لە پێش تۆو بەدرۆخراونەتەوە.

گاڵتەکردن بە پێغەمەران و زانایانی ئایینی تەنها ئەو کاتە پەیدا نەبوەو هەر لە کۆنەوە هاتووە. کەواتە تۆ خۆت ئازار مەدە. گەلی نوح گاڵتەیان بە نوح ئەکرد کەشتیەکەی دروست ئەکرد، ئەیان ووت: تۆ دوایی پێغەمەرایەتی بوویت بە دارتاش.

﴿ فَحاقَ بِالَّذِيْنَ سَخِرُوا مِنْهُمْ مَا كانُوا بِهِ يَسْتَهْزِؤُونَ ﴾ دووایی هاتە خوارەوە بۆسەر کەسانێکی ئەوتۆ گاڵتەیان بە پێغەمەرەکان ئەکرد لە بێ باوەڕان سزای شتێ ئەوان بەو شتە گاڵتەیان پێ ئەکرد بەو پێغەمەرانەی پێش تۆو لەناوچون، سزای گەورە توشیان ئەبێ لە پاشە ڕۆژدا، ئێمە ئەو پێغەمەرانە و پەیڕەوەکانیانمان سەرخست.

کەواتە ئەی موحەمەد: تۆیش وێنەی ئەو پێغەمەرانە سەرئەکەوی، گوێ مەدە بەو شتانە توشت ئەبێ لە خزمەکانتەوە، دوای ئەوانە باسکران خوا ڕوئەکاتە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾.

﴿ قُلْ سِيْرُوا فِي الأَرْضِ ﴾ تۆ بڵێ بەو کەسانە بەدرۆت ئەخەنەوە: ئەگەر ئێوە لە گومان دان بۆ سزادانی بت پەرستانی پێشوو بە ڕاستی نازانن ئێوە بڕۆن بەسەر زەویدا، جارێ بۆ یەمەن و جارێکی تر بۆ شام، شوێنەواری عادوسەمورو ببینن و تەمەشای جێگەکانیان بکەن.

﴿ فَأنْظُرْ أكَيْفَ كانَ عاقِبَةُ الْمُكَذِبِينَ ﴾ دوای ئێوه تەماشا بكەن و تەمێ خواربن چـۆن بووه كۆتايي پێ هاتنی ئەو كەسانە پێغەمەرەكانی خۆيانيان بەدرۆخستۆتەوه. ئێمـە بنـەبڕمان كردون، هەندێ لەوانە هۆزەكانی عەرەب، وەك عادو سەمود.

خوای مەزن فەرمان ئەدا بە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ پرسيار لـە بت پەرستەكان بكا:

قُل لِّمَن مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ قُل لِّلَّهِۚ كَتَبَ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَۚ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِۚ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿١٢﴾ ۞ وَلَهُۥ مَا سَكَنَ فِي ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿١٣﴾ قُلۡ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيّٗا فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَهُوَ يُطۡعِمُ وَلَا يُطۡعَمُۗ قُلۡ إِنِّيٓ أُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَسۡلَمَۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٤﴾ قُلۡ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنۡ عَصَيۡتُ رَبِّي عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿١٥﴾ مَّن يُصۡرَفۡ عَنۡهُ يَوۡمَئِذٖ فَقَدۡ رَحِمَهُۥۚ وَذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٦﴾

﴿ قُلْ لِمَّنْ مَّا فِي السَماواتِ والأرْضِ ﴾ تۆ بڵێ بۆ چ كەسێكە شتێ لـە ئاسمانەكان و لـە زەويدان لـە ڕوی دروست كردن و خاوەنيەتيان، ئەو پرسيارە بۆ ئەوەيە سەركوتيان بكا لە

پەرستنی ئەو بەردانەدا کە نەزیان و نە سودیان بۆکەس نیە لە دواییدا خوا فەرمان ئەدا بە پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ ئەگەر وولاّمی پرسیارەکەیان دایتەوە ئەوا باشە، ئەگەر نەیاندایەوە.

﴿ قُلْ لله ﴾ تۆ بلّێ: ئەو شتە بۆ خوایە کە تاك و تەنهایەو خاوەنی هەموو شتێکەو هەردوولامان ئەزانین و ئێوە ناتوانن بلّێن: بۆخوا نیە.

پرسیار/ کە وەلاّمەکە بەو شێوەیە بێ و ئەوان وەلاّم نەدەنە چ سودێ هەیە لەو پرسیارە؟

وەلاّم/ مەبەست لەو پرسیارە ڕاکێشانی دوژمنە بۆ ئەوەی بڕیاربدەن بە هاتنی ڕۆژی دوایی و بەلّگەدانێ لەسەریان کە خوا دروست کەری بونەوەرانێ و هەر خۆی خاوەنیانێ. توانای هەیە ئەوان لەناو بباو جارێ تر دروستیان بکاتەوە.

﴿ كَتَبَ عَلَى نَفْسِهِ الْرَحَمَةَ ﴾ خوا پێویستی کردوە لەسەر خۆی لە ڕوی گەورەیە و میهرەبانی خۆیەوە بەزەیی و وەرگرتنی پەشیمان بونەوە لێ بوردن لە گوناهی ئادەمیزاد بەمەرجێ باوەڕ بهێنن، بەزەیی خوا پێشی خەشمی کەوتووە، لە میهرەبانی خوایە ڕانمویی ئادەمیزاد ئەکا بۆ ناسینی خۆیی و تاك و تەنهایی ئەو، بەلّگەی بێگومانی لەسەر داناوە، لە میهرەبانی خوایە سزای تاوانبارانی دوواخستوە هەتا ڕۆژی دوایی، وەك ئەفەرموێ:

﴿ لَيَجْمَعَنَكُمْ إلى يَوْمَ القِيامَةِ لارَيْبَ فِيهِ ﴾ بەڕاستی خوا ئێوە کۆئەکا بۆلای ڕۆژی هەلّسانەوە لە گۆڕەکانتان بۆ پرسیارکردنتان لەو شتانەی کردونتان، هیچ گومانێ لە پەیدابونی ئەو ڕۆژەدا نیە، چونکە لەو ڕۆژەدا مافی ستەم لێ کراو لە ستەمکار ئەسێنرێ، سزای خراپەکاران ئەدرێ بە گوێرەی خراپەکانیان و بەس، پاداشتی چاکەکەران ئەدرێتەوە بە دوپات و بەزۆرتریش، ئەگەر ئەو ڕۆژە نەبێ مافی ستەم لێ کراو بە خۆڕایی ئەڕوا.

﴿ الذِينَ خَسِرُوا أَنْفُسَهُمْ فَهُمْ لا يُؤمِنُونَ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆن زیانیان داوە لە خۆیان و ئەو سەرمایە چاکە سروشتیە هەیان بوەو ئەقلّە تواوەکەی خۆیانیان لەناو بردو نەیان خستەکار، دوایی باوەڕ نایەرن بەهۆی ئەو زیاندانە لە خۆیان.

ئادەمیزاد دروست کراوە لەگیان و لە لەش و هەریەکەیان یاریدەی یەکتری ئەدەن. ئادەمیزاد ناژی بە شێوەیەکی چاك هەتا کار نەکەن بۆ گیان و لەشی خۆیان بەیەکەوە، هەرگاتێ کار بکا بۆ گیان بە تەنها وواز لە کەرەسە و دارایی بهێنێ، یا کار بکا بۆ کەرەسەو دارایی بەبێ گیان، لە بنچینەدا زیانی لە بوون و ژیانی خۆی داوە، هەرکەسێ بەو جۆرەبێ.فڕی بە ئیسلامەوە نیە.

﴿ وَلَهُ ما سَكَنَ فِي الْيْـلِ وَالنَـهار وَهُـوَ السَـمِيعُ الْعَلِيـمُ ﴾ وەبۆ خوایە شتێ ئارامی گرتووەو جێگەی گرتووە لە شەو ڕۆژدا و هەر خوا خاوەنیەتی و، خوا هەموو شتێ ئەبیستێ و هەموو شتێ ئەزانێ.

پرسیار/ لە ئایەتی پێشودا ئەوە مەبەستە زانراوە هۆی دووبارە کردنەوەی بەم ئایەتە چیە؟

وەلام/ ئایەتی پێشوو بۆمان ڕون ئەکاتەوە کۆبونەوەی ئادەمیزاد لە بارەی کاتەوە، ئەم ئایەتە بۆمان ڕون ئەکاتەوە کۆبونەوەیان لە جێگەو لە شوێنێ، هەردولایان جێگەن بۆ هەموو بونەوەران، ئادەمیزادیش بەبێ کات و بەبێ جێگە ناژین و، پێویستی بە هەردووکیان هەیە.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتانە ڕابواردن ئەمەیە: کۆمەڵێ لە بێ باوەڕانی قورەیش ووتیان: ئەی موحەمەد: بۆمان دەرکەوتووە ئەم کارە تۆ دەستت داوەتێ پێویستی بە دارایی هەیە. کەواتە ئێمە لە ڕێگەی پیتاك کۆکردنەوە لە هەموو گەورەکانی هۆزی قورەیش دارایی زۆر بۆتۆ کۆئەکەینەوە هەتا توببی بە خاوەنی سامانی خۆت لە نێو هاوسەرانی خۆتا، بەو مەرجەی واز لەو ئاینەی خۆت بهێنی و پەشیمان ببیتەوە. خوای مەزن فەرموی: هەرشتێ شەوو ڕۆژ بیان گرێتەوە لە خواوەیە، ئەگەر بیەوێ پێغەمەری خۆی لەهەموو کەس ساماندارتر ئەکا، کەواتە من پێویستم بە سامانی ئێوە نیە، بۆیە خوا ئەفەرموێ:

﴿ قُلْ أَغَيْرَ اللهِ أَتَخِذُ وَلِياً فاطِرِ السَّماواتِ وَالْأرْضِ ﴾ موحەمەد تۆ بلێ: ئایا من جگەی خوا وەربگرم بە دۆست و سەرداری خۆم و بیپەرستم؟ چۆن من داوای یارمەتی لە جگەی

خوا بکەم کە دروست کەری ئاسمانەکان و زەویە بەم شێوە رێك و پێکە و سەرسورێنەرانەوە ئەبینرێن.

﴿ وَهُوَ يُطْعِمُ وَلا يُطْعَمُ ﴾ وە خوا خواردەمەنی دەرخواردی هەموو گیانداران ئەداو بۆیان ئەرەخسێنێ و، خوا خواردەمەنی دەرخوارد نادرێ و پێویستی بەکەس نیەو خواردەمەنی ناخوا، جگەی ئەو کەسی تر زیان و سوود نابەخشێ.

ئەی موحەمەد: پاش ئەوەی بەلگەو نیشانەت بۆیێ باوەڕان هێنایەوە لەسەر پێویستی پەرستنی خوا بە تەنها و لەسەر ئەوەیش جگەی خوا ناکرێ بە پەرستراوو یاریدەر ڕوبکەرە بت پەرستان بەم جۆرە:

﴿ قُلْ إِنِّي أُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَسْلَمَ ﴾ تۆ بڵێ: بەڕاستی من فەرمانم پێدراوە کە من یەکەم کەس بم سەر شۆڕی فەرمانی خوا بم و موسڵمان بم و خۆم بدەم بەدەستەوە بۆ فەرمانی خواو هیچ کەسێ پێشم نەکەوێ لە باوەڕ هێناندا، چونکە من یەکەمین داواکەری ئەو مەبەستەم ئەگەر بەو شێوەیە نەبم ئەبێ من بکەومە ڕیزی ئەو کەسانە فەرمان بدەن بە دانیشتوان و خۆم فەرمانبەردار نەبم، ئەوەیش دورە لەو کەسانەوە خوا هەڵیان بژێری بۆ گەیاندنی پەیامی خوا بە ئادەمیزاد.

﴿ وَلا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴾ وە بێژراوە بە من کە تۆ لەو کەسانە مەبە هاوبەش دائەنێن بۆخوا. یانێ من فەرمانم پێدراوە هاوبەش دانەنێم بۆخوا، دوایی ئێوە چۆن داوا ئەکەن لەمن کارێکی ناشایستە، خوا بەم جۆرەی خوارەوە فەرمانم پێ ئەداو ئەفەرموێ:

﴿ قُلْ إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴾ تۆ بڵێ: بەڕاستی من ئەترسم ئەگەر بێ فەرمانی پەروەردەکەری خۆم بکەم لە سزای ڕۆژێکی زۆر گەورە کە ڕۆژی دواییە، نە فرۆشتن و کڕین و نە پیتاك و یارمەتی دەرنیە بۆ هیچ کەسێ، ئیتر ئێوە چۆن داوای کاری ناشایستەم لێ ئەکەن.

پێغەمەران گوناه کردنیان لێ ناوەشێتەوە. بەڵام مەبەست ئەمەیە: کە یەکسانی بدرێ بەسەر هەموو کەسێکدا لە ئادەمیزاد لەبەردەم خوادا بەبێ جیاوازی، خوا بەهەشتی دروست کردووە بۆ ئەو کەسانە فەرمانبەرداری خوان و لەخوا ئەترسن، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لە هەموو کەس زاناترو چاك ترو لە خواترسترە.

﴿ مَنْ يُصْرَفْ عَنْهُ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمَهُ وَذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴾ هەر کەسێ لابدرێ لەو سزایە لەو ڕۆژەدا، دوایی بە ڕاستی خوا میهرەبانی کردوە لەگەڵ ئەو کەسە لەو ڕۆژە گەورەیەداو، ئەو میهرەبان و بەزیی خوایە ڕزگاربونێکی گەورەیەو هیچ ڕزگارکردنێ وێنەی ئەو نیە کە بچێتە ناو بەهەشت و ڕزگاری بێ لە ئاگری دۆزەخ.

لە پاش ئەوانەی باسکران خوای مەزن بۆمانی ڕون ئەکاتەوە کە هیچ کەسێ جگەی خوا خاوەنی سود نیە بۆ ئادەمیزادو ئەفەرموێ:

وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٧﴾ وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٨﴾ قُلْ أَىُّ شَىْءٍ أَكْبَرُ شَهَٰدَةً ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ شَهِيدٌۢ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۚ وَأُوحِىَ إِلَىَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ ۚ أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ ٱللَّهِ ءَالِهَةً أُخْرَىٰ ۚ قُل لَّآ أَشْهَدُ ۚ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ وَإِنَّنِى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿١٩﴾

﴿ وَإِنْ يَمْسَسْكَ اللهُ بِضُرٍّ فَلا كاشِفَ لَهُ إِلاَّ هُوَ ﴾ وەئەگەر خوا بگەیەنێ بە تۆ زیانێ لە سەختی لە هەژاری و گرانی و ناخۆشی، دوابی هیچ کەسێ لانابا ئەو زیانەو رێگەی رێگەی لێ ناگرێ مەگەر خوا لایانبا. نەك ئەو شتەی بێ باوەڕان ئەیان پەرستن.

پرسیار/ کە هەموو ناخۆشیەکاری خوابێ و بە دەست ئەوبێ: نەك بەدەست ئادەمیزاد. هەروەها لابردن و رزگاربوون لە ناخۆشی بەدەست خوابن، ئیتر کۆشش و کردەوە سودیان چیە؟

وەلام/ کۆشش پێویستە بە گوێرەی ئەقڵ وەرگرتن، بە گوێرەی ئەقڵ ئادەمیزاد بەبێ کردەوە کاری ناچێتە سەر، هەروەها بە گوێرەی وەرگرتن لە فەرمودەی خواو پێغەمەرەوە ﴿ﷺ﴾. فەرمودەکانی ئەوان و بیربۆچونی زانایان نایەنە ژمارە کە کۆشش و کردار پێویستن بۆ وەرگرتنی بەر هەموو پاداشت.

بێگومان خوا زیان و ئازاری هیچ کەسێ لە بەندەکانی خۆی ناوێ، چۆن ئەبێ وانەبێ؟ کە خوا ئەفەرموێ: من ستەم ناکەم لە بەندەکانی خۆم. کەواتە مەبەست لە ناخۆشی و زیان لەو ئایەتەدا ئەو شتەیە پاداشتی بەندەی پێ بداتەوە لەسەر کردەوەکانیان یا تاقیان ئەکاتەوە هەر لەبەر سوودی ئەوە بەندەیەی، ئەوانەیش دژی دادپەروەری و میهرەبانی خوانین، گونجاو نیە بۆ خوا گۆشش کەران و ناکۆشش کەران وەك یەك تەمەشا بکا.

﴿ وَإِنْ يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾وەئەگەر خوا بەتۆ بەگەیەنێ چاکەیە لە لەش ساغی و هەرزانی و خواردەمەنی و سامانی زۆرو پلەو پایە، دوایی خوا بەسەر هەموو شتێکا توانای هەیە. یانێ کەس ناتوانێ چاکەو زیان و گەورەیی و میهرەبانی خوا بگێڕێتەوە.

﴿ وَهُوَ القاهِرُ فَوْقَ عِبادِهِ وَهُوَ الحَكِيمُ الخَبِيرُ ﴾ وەخوا توانا لەسەرەوەی بەندەکانی خۆیەتی ئەوان لە خوارەوەی توانای خوان و دروستی کردوون بێ ویستی ئەوان، ئەیشیان مرێنێ و لەناویان ئەبا بەبێ پرس و ویستی ئەوان و، خوا هەموو شتێ لە جێگای شیاوی خۆیا دائەنێ ئاگاداری کردەوەی نهێنی بەندەکانی خۆیەتی.

هەندێ لە گێل و گەوجەکانی بت پەرستانی مەکە وەتیان بە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾: بە ڕاستی جوەکان و گاورەکان شایەتی نادەن بۆتۆ لەسەر پێغەمەرایەتی تۆ، خـوای مـەزن بـۆ کـپ کردنەوەی دەنگیان ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە. فەرموی:

﴿ قُلْ أيُّ شَيْءٍ أكْبَرُ شَهادة ﴾ تۆ بلێ و پرسیار لە بـت پەرسـتان بکـە: چ شـتێ لـە شایەتی دانی خوا گەورەترە، ئاگاداربوونی خوا لە هەموو ئاگادار دانێ گـەورەترە، دوایـی ئەگەر منجە منجیان کـرد لـە وەڵامدانـەوەدا دوایـی تـۆ گوێچکـەی ئـەوانت ئـاودا بـۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکە.

﴿ قُلْ اللهُ شَهِيدٌ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ ﴾ تۆ بلێ: خوا ئاگادارە لە نێوان من و لە نێوان ئێوەدا و گەورەترە لە بارەی ئاگاداری لە هەموو شتێ، ئاگاداری خوا ڕاستەو شـایەتی جوەکـان و گاورەکان پوچە، جگە وەڵامدانەوەکەی تۆ هەموویان پوچن و ئەوانیش پەکیان ئەکەوێ.

﴿ وَأوحَى إلى هذا القُرْآنُ لأُنْذِرَكُمْ بِهِ وَمَنْ بَلَغَ ﴾ وەبە سروش نێرراوە بۆلای مـن ئـەم قورئانە، بۆ ئەوەی من بە ناوەڕۆکی ئەو قورئانە ئێوەو ئەو کەسەی ناوەڕۆکی ئەو قورئانەی پێ گەیشتووە بترسێنم لەو کەسانەی ئێستاو ئەوانـەی لەمـەودوا پـەیدا ئـەبن هـەتا ڕۆژی دوایی.

ڕستەی (وَمَنْ بَلَغَ) بەڵگەی بێ گومان و ئاشکرایە لەسەر ئەو کەسەی نـاوەڕۆکی ئـەم قورئانەی پێ گەیشت پێویست ئەبێ لەسەری فەرمانبەرداری فەرمانـەکانی بـێ عـەرەب و جگەی عەرەب هەتا کۆتـایی پـێ هـاتنی جیـهان. بەڵگەیشـە لەسـەر ئـەوەی هەرکەسـێ بانگەوازی پێغەمەرو قورئانی پێ نەگەیشتبێ خاوەنی بیانوە بۆ وەرنەگرتنی ئـایینی ئیسـلام، لە باسی ماناکردنی ئایەتی (١١٥)ی سـورەتی ئـالی عیمـران بـە درێـژی ئـەو باسـە ڕون کراوەتەوە.

قورئانی پیرۆز ئاگادار دانە لەلایەن خوای مەزنەوە لەسەر پێغەمەرایەتی موحەمەد ﴿ﷺ﴾ چونکە قورئانی پیرۆز بەرەنگاری بت پەرستان ئەگا بە گشتی و بەوان ڕائەگەیەنێ کە ئێـوە

ناتوانن وێنەی ئەو قورئانەیا سێ ئایەتی دابنێن با هەموو کەسانێ خۆیان ئەیانەوێ بانگی بکەن، هەوڵیشیانداوە بۆیان نەچوە سەر، ڕون بویەوە ئەو قورئانە فەرمودەی خوایە، لە دواییدا خوا سەرزەنشتی کردن لەسەر پەرستنی پتەکان و فەرموی:

﴿ أَئِنَكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ اللهِ آلِهَةَ أُخْرى ﴾ موحەممەد تۆ بلێ: ئایا ئێوەی بت پەرستان و بێ باوەڕان بە پێغەمەرایەتی شایەتی و ئاگاداری ئەدەن کەلەگەڵ خوا چەندین خوای تر هەن، ئێوە چۆن شتی وا ئەڵێن پاش ڕون بونەوەی بەڵگە لەسەر یەکێتی خوا؟

لە دوایدا خوا فەرمان ئەدا بە پێغەمەری خۆی شایەتی و ئاگاداری نەدا بە وێنەی ئاگاداری ئەوان و ئەفەرموێ:

﴿ قُلْ لا أَشْهَدُ ﴾ تۆ بلێ: من شایەتی و ئاگاداری نادەم بە وێنەی ئاگاداری ئێوە بت پەرست کە لەگەڵ خوادا هەیە چەندین خوای ترو من هەرگیز ئەو شایەتیە نادەم، پاش ئەوەی خوای مەزن فەرمانی تر ئەدا بە پێغەمەری خۆیی و ئەفەرموی:

﴿ قُلْ إِنَما هُوَ إِلَهٌ واحِدٌ وَإِنَنِي بَرِيءٌ مِمّا تُشْرِكُونَ ﴾ تۆ بلێ: بەڕاستی هیچ خوایە نییە مەگەر خوایەکی تەنها بۆ پەرستن و، بەڕاستی من بێزارم لەو شتەی هاوبەشی پێدائەنێن بۆ خواو بێزارم لە پەرستنی ئەو بتانە ئێوە ئەیانکەن بە هاوبەشی خوا.

لە پاش ئەو باسانەی پێشوو خوای مەزن ڕونی ئەکاتەوە کە بێ باوەڕان جگە لەوە نەزان و گێل و ڕەگەز پەرستن هیچ شتێ تریان نەکردووە بە پیشەی خۆیان و ئەفەرموێ:

ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمُ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٠﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓ ۗ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢١﴾ وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَيْنَ شُرَكَآؤُكُمُ

ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ ﴿٢٣﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ كَذَبُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ ۚ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾

﴿ الذِينَ آتَيْناهُمْ الكِتابِ يَعْرِفونَهُ كَما يَعْرِفُونْ أبْنأَهُمْ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ ئێمە بەخشیومانە بەوان نامەیەکە تەوارات و ئینجیلە لە جوەکان و گاورەکان کە گومانیان وایە باس و شێوازی موحەمەد لە نامەکانیانا نەنوسراوە، ئەوان موحەمەدە ئەناسن بەو دیمەن و شێوازەوە لە نامەکانیانایە هەروەك ئەوەی کوڕەکانیان ئەناسن. بەڵام ئەوان باسی پێغەمەر ئەشارنەوەو نیشانی نادەن بەکەس، ئەو مەبەستە لە زۆر شوێنی قورئاندا باسی کراوە. لە ئایەتی (١٤٦) ئەلبەقەرە. ئایەتی (١٥٧) ی ئەلئەعراف. ئایەتی (١٩٧) شوعەرا. بە زۆری ئەو باسە لە مانای ئایەتی (١٤٦) ئەلبەقەرەدا بە درێژی باسی کراوە.

بۆ زانین: لە کارە پێویستەکان نیە کە خاوەن نامەکان کاتێ پێویستە باوەڕبهێنن دەستیان بکەوێ کە خاوەن نامەکان ڕاستی پێغەمەر بزانن و بیانناسین و نوسرابێ لە تەورات و ئینجیلدا چونکە هەرکەسێ لە ئاینی ئیسلام بکۆڵێتەوە بە لێکۆڵینەوەیەکی ڕاستی بە ووردی باوەڕ ئەهێنێ بە ئایینی ئیسلام بە جۆرێ گومانی تێدا نەبێ کە هەر ئاینی ئیسلام ڕاستە، ئەزانێ پوختەی ئایینی ئیسلام و نیشانەکەی لە سەر ووشەی (لا إلـه إلاّ الله ) دا دەرئەکوێ بۆ یەکسانی ئادەمیزادو نرخ بۆ دانانی لەسە بنچینەی کارکردن و نیازی پاك نەك لەسەر بنچینەی دارایی و پلەو پایەو ڕەگەزایەتی. لەئەستۆ گرتنی کۆمەڵایەتی و بەرپرسیاری هەموو کاربەدەستێکە بانگی ژێر دەستەکانی خۆیان بکەن بۆ لای ئیسلامەتی و ئاشتی و پێش کەوتن، بەبێ ئەوەی بزانرێ خاوەن نامەکان پێغەمەر ئەناسن وەك چۆن کوڕی خۆیان ئەناسن.

دوای ئەوە خوا ڕونی کردەوە ئەو شتانەی کە پێویستە ئاشکرا بکرێن لە لۆمەکردنی بێ باوەڕان و بێزکردنەوە لەوان بە هۆی هاوبەشدانان بۆ خوای مەزن پێمان ئەفەرموێ:

﴿ وَمَنْ أظْلَمُ مِمَّنِ آفْتَرى علَى الله كَذِباً ﴾ وە چ کەسێکە ستەمکارتر لە کەسێ بوختان بکاو بەدرۆ بیدا بەسەر خوادا، وێنە بت پەرستان ئەڵێن: فریشتەکان کچی خوان و بتەکان بۆیان ئەپاڕێنەوە لای خوا. جوەکان ئەڵێن: عوزەیر کوڕی خوایە، گاورەکان ئەڵێن: عیسا کوڕی خوایە.

بە هیچ جۆرێ جیاوازی نیە لە نێوان ئەو کەسانە هاوبەش دائەنێن بۆ خواو لە نێوان بە درۆو بە بوختان نامەکانی خوا ئەگۆڕن بەدەستیان قەس و ئەیشزانن، لە نێوان ئەوانەیشدا بە درۆ ئەڵێن: ئێمە لە خزمەت خوادا بۆ مەردم ئەپاڕێتەوە، لە نێوان ئەوانەدا ئەڵێن: خوا هەر نیە، ئەوانە هەموویان بێ باوەڕو گوناهبارن بە گوێرەی نامەی خواو فەرمودەی پێغەمەرو پێك هاتنی هەموو موسڵمانان.

﴿ أوْكَذَبَ بِأياتِهِ إنَهُ لا يُفْلِحُ الظّالِمون ﴾ یا باوەڕی بە ناوەڕۆکی ئایەتەکانی قورئان نەبێ و ئەڵێن. قورئان جادوەو ئەفسانەیە. بەڕاستی ڕزگاری نابێ ستەمکاران و بێ باوەڕان سەرەڕای ئەوەیش ستەمکاتر لەوان نیە.

﴿ وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعاً ثُمَ نَقُولُ لِلذِينَ أشْرَكُوا أيْنَ شُرَكاؤُكُمْ الذِينَ كُنْتُمْ تَزْعُمُونَ ﴾ وە تۆ بیری ئەو ڕۆژە بکەرەوە ئێمە کۆئەکەینەوە بێ باوەڕان هەموویان بە پەرستراوەکانیان و بە خۆیانەوە. لە پاشا ئێمە ئەڵێین بە کەسانێکی ئەوتۆ هاوبەشدائەنێن بۆ ئێمە بە چەندەها شتی ناڕەوا: لە چ جێگەیەکن هاوبەشەکانی ئێوە، ئەوانەی ئەوتۆ ئێوە گومان ئەبەن هاوبەشی ئێمەن و لەلای ئێمە بۆتان ئەپاڕێنەوە؟

بۆ زانین: ئەو کەسانەی باوەڕیان بە خوا هەیە دوو بەشن: (١) هەیانە باوەڕیان بە یەکێتی خوا هەیە. ئەوانە ناوئەبرێن بە خوا یەك دانەرەکان (٢) هەیشیانە باوەڕیان بەخوا هەیەو بەلایانەوایە خوایێکی تر هاوبەشیەتی ئەوانەو ئەو کەسانەن ئەڵێن: خوا هەر نیەو وەك

یەکوان بەبێ جیاوازی، چونکە هاوبەشدانان بۆ خوا لە ناوەڕۆکا بڕیاردانە لەسەر نـەبوونی خواو بەڕاستی وێنەی نیە هاوبشەی نیە.

پرسیار/ بۆچی خوا فەرموی: لە چ جێگەیەکن هاوبەشەکانتان، نەیفـەرموە: لـە کوێـن هاوبەشەکانی من. زۆر ئاشکرایە هاوبەشیان ئەدایە پاڵ خوا نە ئەپاڵ خۆیان؟

وەڵام/ لەبەر ئەوەیە: هاوبەشدانەرەکان هـەر ئـەو کەسـانەن سـازاندویانە هاوبەشـێکی ئەوتۆ کە هەر نەبوەو شوێنەواریشی نەبووە لەبەر ئەو پەیوەندییـەی، ئـەوان بـە هاوبەشـەوە پاڵدانی بەوانەوە دروستە، واتە ( لأدنى ملابسة ).

﴿ ثُمَ لَمْ تَكُنْ فِتْنَتُهُمْ إلاّ أنْ قالُوا وَاللهِ رَبنا مـا كُنّـا مُشْـرِكِينْ ﴾ لـە پاشـا بیانویـان بـۆ نەمایەوە بۆ وەڵام دانەوەیان مەگەر ئەوە کە ئەیان ووت: سوێندمان بەخوا پەروەردەکـەری ئێمە هاوبەشمان دانەناوە بۆ تۆو درۆمان بۆ ئەکەن. ئەوان بەو سوێندە لـەو ڕۆژەدا هـەوڵی ئەوە دەدەن خۆیان ڕزگار بکەن لەو کارە خراپە کردویانە، بۆیە پەنا ئەبەنە بـەر درۆکـردن و سوێندی درۆ خواردن و وا ئەزانن ئەو ڕۆژەیش وەك ڕۆژانی جیـهان بـەدرۆ ڕزگاریـان بێ.

پرسیار/ ڕستەی ( وَاللهِ رَبِنـا مـا كُنـا مُشْـرِكِينْ ) چـۆن ڕێـك ئەکـەوێ لەگـەڵ ( وَلا يَكْتُمُونَ حَدِيثاً ) وەبێ باوەڕان هیچ ڕووداوێ ناشارنەوە کە کردبێتیان لە جیهاندا. ئایـەتی (٤٢) ی سورەتی نیساء؟

وەڵام/ لە ڕۆژی دواییدا بێ باوەڕان چەندین جێگەی ڕاوەستانیان هەیە کە لـە هـەندێ کاتا ئەتوانن درۆ بکەن و هەندێ شت بشارنەوە بەر لەوەی ئەندامـەکانیان شـایەتی بـدەن لەسەر ئەو کارانەی کردویانە کەواتـە ڕسـتەی ئـەم ئایەتـەی ئێرە بـۆ ئـەو کاتـە هاتۆەتـە خوارەوە. لە هەندێ جێگەدا ناتوانن درۆ بکەن و هەر کارێکیان کردبێ درۆیان بۆ ناکرێ و ئەی لێن بەبێ پێچ و پەنا. کەواتە ڕستەی ئایـەتی (٤٢)ی نیسـاء بـۆ ئەمـەیان هاتونەتـە خوارەوە .

پرسیار/ هەرکاتێ ئادەمیزاد لە ڕۆژی دوایدا توانای درۆو سوێند خواردنـی هـەبێ وەك ئەمڕۆ، ئیتر چۆن ڕۆژی دووایی پێی ئەوترێ خانەی ڕاستی و بـە ئـەمڕۆ ئـەبێژرێ خانـەی درۆکردن.

وەڵام/ جیاوازی نێوان ئەم دوو خانەیە بەم جۆرەیە: بەڕاستی درۆکردن لەم ڕۆژەدا وائەبێ زیان و ئازار لە خاوەنەکەی دوربخاتەوە یا سودی پێ بگەیەنێ. بەڵام لە ڕۆژی دواییدا درۆکردن و سوێند خواردن بە هیچ جۆرێ سود بەخش نین و سزا ناگێڕنەوە.

﴿ اُنْظُرْ كَيْفَ كَذَبُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَضَلَّ عَنْهُمْ ما كانُوا يَفْتَرُونَ ﴾ تۆ تەماشا بکە چۆن سزای درۆکانیان لەسەر خۆیان پێویست ئەکەن. ئەڵێن ئێمە هاوبەشمان دانەناوە بۆ خوا، خۆیان ئاگادارن لەسەر هاوبەشدانان بەردەوامبوون هەتا کاتی مردنیان و وونبو لەوان شتێ بوختانیان پێ ئەکرن و ئەیاندا بەسەر خواداو ئەیان کردن بە هاوبەش بۆ خواو ئەیان ووت: بتەکان بۆمان ئەپاڕێنەوە لای خواو یارمەتیمان ئەدەن لە ڕۆژی دووایدا.

ئەبوو سوفیان وەلیدی کوڕی موغەیرەو فەزی کوڕی حەرس و عەتبەو شەیبەی کوڕانی ڕبیعەو ئەبو جەهل کۆبونەوەو گوێیان لە خوێندنەوە قورئان بوو لەلایەن پێغەمەرەوە ووتیان بە نەزر ئەو پیاوە چ شتێ ئەڵێ؟ ووتی نازانم ئەوە نەبێ دەمی ئەجوڵێنێ. وەك بزانم چیرۆك و نوسراوی پێشوەکان ئەڵێ کە من وێنەی ئەوەم بۆ باس کردوون لە فارسەکانەوە: بۆ ڕونکردنەوەی ئەو مەبەستە خوا ئەفەرموێ:

وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِي آذَانِهِمْ وَقْرًا وَإِن يَرَوْا كُلَّ آيَةٍ لَّا يُؤْمِنُوا بِهَا حَتَّىٰ إِذَا جَاءُوكَ يُجَادِلُونَكَ يَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ هَٰذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴿٢٥﴾ وَهُمْ يَنْهَوْنَ عَنْهُ وَيَنْأَوْنَ عَنْهُ وَإِن يُهْلِكُونَ إِلَّا أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٦﴾

﴿ وَمِنْهُمْ مَنْ يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ وَجَعَلْنا عَلَى قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَنْ يَفْقَهُوا وَفِي آذانِهِمْ وَقْراً ﴾
وەهەندێ لە بێ باوەڕان کەسێك گوێ ئەگرێ بۆلای تۆ کاتێ تۆ قورئان ئەخوێنی. بەڵام سود نابەخشێ نەبەخۆیان و نە بە جگەی خۆیان و، ئێمە داومانە بەسەر دڵیانا چەندین پەردە هەتا لەو قورئانە نەگەن و نەیزانن و لایان ناخۆشبو لێی تێ بگەن، چونکە ئەوان لە سەرەتاوە بڕیاریاندابوو لەسەر بێ باوەڕی و نەزانینی قورئان، لە خۆ بایی بوبون بەردەوامبون لەسەریان و، ئێمە دامان نابوو لە گوێچکەیانا گرانی و قورسایی هەتا ڕاستی نەبیسن، وێنەی ئەو کەسانەیان لێ هاتبوو لە هیچ شتێ نەگەن و نەیبیسن.

پرسیار/ بەراستی ئەو ئایەتە بە گوێرەی ڕواڵەت خوا دڵی ئەوانی کوێر کردوەو گوێچکەی کەڕ کردوون. کەواتە شایستە خراپەو سزانین، چونکە ئەبرێن بەرێوە بەزۆرو سەربەست نین؟

وەڵام/ بەو بۆنەوە دڵی ئەو بێ باوەرانە لە قورئان ناگاو سودی وەرناگرێ، گوێچکەیان نابیسێ بە جۆرێ بیزانن ڕاستە ببیژرێ چەندین پەردە بەسەر دڵیانەوەیەو کوێچکەیان گرانە بە گوێرەی سروشتی خۆیان، لە بەر ئەوەی خوا دڵو گوێچکەی دروست کردوە بەڕاستی پەیوەست کردنی کەڕی پەردەدان بدرێتە پاڵ خوا. بەڵام بە گوێرەی پەیدابوونیان لەبێ باوەڕانەوە جێگەی خۆیەتی ئەوان بەرپرسیاربن، چونکە ئەوان باوەڕیان بە ڕاستی بەڵام بە گوێرەی پەیدابونیان لەبێ باوەرانەوە جێگەی خۆیەتی ئەوانە بەرپرسیاربن، چونکە ئەوان باوەڕیان بەراستی نیەو بەردەوامن لەسەری بەویستی خۆیان. لەماناکردنی ئایەتی(٧) سورەتی ئەلبەقەرە باسی ئەوانە کراوە.

ئەوەی شایەنی ئاماژە بێ ئەو ئایەتە بەئاشکرایی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئیسلام بەراوردی هیچ شتێ ناکا بەو شتەی لەناوی خۆیایەتی. بەڵکو تەماشای بەرهەم و نیشانەی ئەکا. یانێ چاوو گوێچکە جێبەجێ کەری کاری ئەقڵن و ئەقڵیش نەخشە کێشی کارکردنە، دوایی هەر کاتێ کارکردن پەیدا نەبو، بون و نەبونی هەمو هەستەکان یەکسانە، بە جۆرێ تر

ئیسلام شتێ ناوەکیو دەرەکی نیە، هەمو شتێ هۆیە بۆ سودی ئادەمیزاد بۆ هەڵسوراندنی گوزەرانیان و نەهێشتنی گیروگرفتیان و ئیسلام شاراوەی نیە.

پێغەمەر نهێنی پڕو پوچ ویژانی دەرخست لەوانە کە خاوەنی پلەو پلیەو دارایی بون، چونکە دوای ئەو دەرکەوتنەکەوتنە جوجوڵ و هەستیانۆ بەنەمانی خۆیان کرد، بۆیە پەلاماری درۆی زۆر گەورەیان داو ئەیاندایە پاڵ قورئان، بۆ ڕون کردنەوەی ئەو مەبەستە خوای مەزن دەفەرموێ:

﴿ وَإنْ يَرَوا كُلَ آيَةٍ لا يُؤْمِنُوا بِها ﴾ وەئەگەر ئەو بێ باوەڕانە ببینن هەمو نیشانەو کارێکی پەك خەریان ئەوان باوەڕ بەو نیشانەیە ناکەن و باوەڕ بەتۆ نایەنن لەبەر کینەی دڵیان و لاسایی کردنەوەی پێشوەکانیانی بۆ ئەو شتانە لەوانەوە وەریان گرتوون.

﴿ حَتى إذا جاؤُوكَ يُجادِلُونَكَ يَقُولُ الذِينَ كَفَرُوا إنْ هذا إلاّ أساطِيرُ الأَوَلِيْنَ ﴾ بە درۆ خستنەوەی ئەوان نیشانە ڕونەکان گەیاندنیە رادەیە هەتا کاتێ ئەوان هاتن بۆ لای تۆ گفتوگۆ بکەن لەگەڵ تۆ بە جۆرێ پەکت بخەن ئەڵێن کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە: ئەو قورئانە هیچ شتێ نیە جگەی ئەوەی نوسراوی گەلانی رابوردوانە بەبێ گومان ئەیشیانزانێ ئەو قورئانە ڕانموییی کەرە بۆلای شتێ ڕاست و دروستە. بەڵام ئەوان گومان و درۆی زۆر بەدەست ئەهێنن بۆ ئەوەی ئادەمیزاد ڕابکێشن بەرەو ڕێگەی خراپ و ڕێگەی ڕاستیان لێ وون بکەن و بەرەوکاری پوچ بیانبەن، بەبێ جیاوازی بە وێنەی یاساو پرۆگرام و دەستوری دەست کردی ئەم سەردەمەی ئێمە.

﴿ وَهُمْ يَنْهَوْنَ عَنْهُ وَيَنْأَوْنَ عَنْهُ ﴾ وە ئەو بێ باوەڕانە ڕێگرن و قەدەغەی ئادەمیزاد ئەکەن لە باوەڕ کردن بە قورئان و پەیڕەویی کردنی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ و، خۆیشیان دورئەخەنەوە لە باوەڕ هێنان. یانێ نەخۆیان باوەڕ ئەهێنن و نە ئەیش هێڵن کەسی تر باوەڕ بهێنێ.

لە هەوڵدان بۆ پەیداکردنی ئاژاوەو کینە بۆ پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾، لەشکر سازی بۆ جەنگ لەگەڵ پێغەمەر، لەبەر هیچ هۆیە نەبوو جگەی خراپی و نالەباری خۆیان.

﴿ وَإِنْ يُهْلِكُونَ إلاّ أنفُسِهِمْ وَما يَشْعُرُونَ ﴾وەلەناو نادەن ئەو بێ باوەڕانە بەو کارە خراپانەیان و ئەو فێڵ کردنانەیان لە ئیسلام مەگەر لە خۆیان و، هەست ناکەن و نازانن کە زیانی ئەوان سەر ناکێشێ و تێپەڕ ناکا بۆلای جگەی خۆیان. یانێ بازنەی خراپە سوڕی خواردو کەوتە ملی خۆیان و لەناوی بردن، هەندێکیان لە ڕۆژی بەدردا کوژران و لەناوچون. ئەوانی تریان بەسەر شۆڕی خۆیان دا بە دەستەوە لە ڕۆژی ڕزگارکردنی مەکەی پیرۆز خوای مەزن جارێ تر باسی چۆنیەتی ئەو کەسانە ئەکا باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نیەو بە درۆی ئەخەنەوە، لەو ڕۆژەدا سزایە ئامادەکراوە بۆیان و، ئەی بینن لەگەڵ ئەو پاداشتەی ئامادەکراوە بۆ باوەڕداران و ئەفەرموێ:

وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ وُقِفُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُوا۟ يَٰلَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٧﴾ بَلْ بَدَا لَهُم مَّا كَانُوا۟ يُخْفُونَ مِن قَبْلُ ۖ وَلَوْ رُدُّوا۟ لَعَادُوا۟ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿٢٨﴾ وَقَالُوٓا۟ إِنْ هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٢٩﴾ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ وُقِفُوا۟ عَلَىٰ رَبِّهِمْ ۚ قَالَ أَلَيْسَ هَٰذَا بِٱلْحَقِّ ۚ قَالُوا۟ بَلَىٰ وَرَبِّنَا ۚ قَالَ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٠﴾ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً قَالُوا۟ يَٰحَسْرَتَنَا عَلَىٰ مَا فَرَّطْنَا فِيهَا وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ

عَلَىٰ ظُهُورِهِمْ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٣١﴾ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَلَلدَّارُ الْآخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٣٢﴾

﴿ وَلَوْ ترى إِذْ وُقِفُوا عَلَى النّار ﴾ وەئەگەر تۆ ببینی ئەو بێ باوەڕانە کاتێ ڕاوەستێنراون لەسەر ئاگر. یانێ تۆ ئەوان ئەبینی لەو کاتەدا ڕاوەستێنراون لەسەر ئاگر هەتا بە چاوی خۆیان ئەو ئاگرە ببینن، یا نیشانیان بدرێ یا بخرێنە ناوی بۆیان ڕون ئەبێتەوە ئەندازەی ئەو سزایە بۆیان ئامادەکراوە، ئەوەی ڕاستی بێ لەو کاتانەدا کارێکی زۆر سامناك ئەبینن.

﴿ فقالُوا يالَيْتَنا نُرَدُّ وَلا نُكَذِبُ بِآياتِ رَبِنا وَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ دوایی بێ باوەڕان ئەڵێن: ئەی خۆزگایە ئێمە بیگێڕاینایەتەوە بۆلای جیهان و ئێمە بە درۆ نەخینەوە نیشانە ڕونەکانی پەروەردەکەری خۆمان لەسەر ڕاستی قورئان و پێغەمەرو هاتنی ڕۆژی دوایی، پەشیمان ببینەوە لە گوناهەکانمان و، ئێمە ببین بە باوەڕدارو کاری چاك بکەین. بەڵام فرمێسك ڕژاندن و خەفەت خواردن لەو ڕۆژەدا هیچ سودێ نابەخشێ، ئەوەی سودی ببوایە بۆ ئەوان ترسان بوو لە خواو لە سزای خوا بەر لە پەیدابوونی ئەو سزایە بۆیان. لە پاش توشبونیان بەو سزایە وێنەی گریانە بەسەر مردوداو ئاخ هەڵکێشانە بۆ کارێ ڕۆیشتبێ.

﴿ بَلْ بَدالَهُمْ مَا كانُوا يُخفُونَ مِنْ قَبْلُ ﴾ بەڵکو دەرکەوت بۆ بێ باوەڕان شتێ ئەوان پەنهانیاندا بوو لە بێ باوەڕی و کاری خراپ لە پێش ئەم کاتەوە لە جیهاندا کردونیان، لەبەر ئەوەی ئێستا دەرکەوتوون بە هۆی شایەتی دانی ئەندامەکانیانەوە داوای ئەوە ئەکەن بیان گێڕنەوە بۆلای جیهان.

بۆ زانین: لە ڕۆژی دوایدا ڕزگاری نابێ لە سزای خوا مەگەر کەسێ خۆی دەربخا بەڕاستی و بە ڕونی لەم ژیانەی ئێستاداو گفتوگۆی ڕێك بکەوی لەگەڵ کردەوەیاو خۆی بنوێنێ بە وێنەی دەرخستنی خۆی بە لەشی و بە گفتوگۆ کردارییەوە لە تەلەفزیۆن و ئاوێنەدا. بەڵام کەسێ خۆی دەرنەخا بە کردارو بە گفتوگۆیەوە خوا نەبێ کەسێ شاراوەکانی لە بێ باوەڕی و دووڕوی نەزانێ، ئەو کەسە لەمەو پاش سزای بێ باوەڕی و دوڕوی خۆی بۆ دەرئەکەوێ، خۆی لە ناو ئەبا بە خەفەت خواردن لەسەر خراپە کردنەکەی، ئاواتی ڕزگاربون ئەخوازێ، دوایی زۆر دورە ئاواتەکەی بێتەوییی کە بگەڕێتەوە بۆلای جیهان.

﴿ وَلَوْ رُدّوُ العَادُ والِمانُهُوا عَنْـهُ وَإِنَـهُمْ لَكـاذِبُونَ ﴾ وەئەگەر ئەو بێ باوەڕانە دوای ڕاوەستانیان لەسەر ئاگرو دەرکەوتنی کردەوەکانیان بگێڕنەوە بۆلای جیهان بە ڕاستی ئەچنەوە بۆ لای شتێ قەدەغە کرابوو لەوان ئەو شتە لە هاوبەشدانان و گوناه کردن. وە بە ڕاستی ئەوان درۆ ئەکەن لەو بەڵێنە ئەیدەن کە ئایەتەکانی خوا بەدرۆ نەخەنەوەو باوەڕ بهێنن.

بۆ نموونە: زۆر جاران دیومانەو ئەزانین بە دەیان تاوانباران پەشیمان بونەتەوە لە تاوانەکانیان کاتێ ئەوان لە تاریکی گرتوخانەدابوون کەچی کاتێ دەرچوون لە گرتوخانە گەڕاونەتەوە بۆ تاوانەکانیان و گوناهەکانیان.

﴿ وَقالُوا إنْ هِيَ إلاّ حَياتُنا الّدُنيا وَما نَحْـنُ بِمَبْعُوثِـينَ ﴾ وە بێ باوەڕان ئەیان ووت: ژیان و زیندەکانی بۆ ئێمە نیە مەگەر ژیانی ئەم جیهانەو، ئێمە زیندو ناکرێنەوە لەمەوپاش.

یانێ ئەگەر بگێڕینەوە بۆلای ژیانی جیهان بە ڕاستی ئەڵێن و دوبارەی ئەکەنەوە ئەو شتەی لەوە بەروتویانە: کە زیندوبونەوە پرسیارو سزادان نیە.

پرسیار/چۆن ئەڵێن: ژیان هەر ئەم ژیانەیە، بەڕاستی ئەو کارە گرانەیان بینیوەو ئاگریان پیشان دراوەو پەنایان بردوە بۆلای ڕزگاربوون، پەیمانیانداوە نەگەڕێنەوە بۆلای کارە پێشوەکانیان؟

وەلآم/ بەڕاستی ئەوان ئەزانن کە پرسیارو سزا هەن بەبێ گومان. بەلآم ئەزانن ئەگەر ڕاستی بلآوبکەنەوە سەرشۆڕی ڕاستی بن دەست کەوتو پلەو پایەیان لە کیس ئەچێ.

﴿ وَلَوْ ترى إذْ وَقِفُوا عَلَى رَبِهِمْ قالَ آلَيْسَ هذا بِالْحَقِ ﴾ وەئەگەر تۆ ببینی کاتێ بێ باوەڕان ڕائەوەستێنرێن لە ڕۆژی دووایدا لەسەر فەرمانی پەروەردەکەری خۆیان، دوای ئەوەی لە جیهاندا بە درۆیان ئەخستەوە گەیشتن بە فەرمانی خوای مەزن لە پاشەڕۆژدا، پەروەردەکەریان ئەفەرموێ:

لە ڕۆژی دووایدا: ئایا ئەم زیندوبونەوەیە ڕاست نیە؟ ئێوە ئەتان ووت لە جیهاندا: زیندو بوونەوەو کۆکردنەوەو بلآوبونەوە نین پاش مردن.

﴿ قالُوا بَلى وَرَبِنا قالَ فَذُوقُوا الْعَذابَ بِما كُنْتُمْ تَكْفُرُونْ ﴾ ئەیان ووت: بەلێ: ئەوانە هەموویان هەن و، سوێندمان بە پەروەردەکەری خۆمان ڕاستن، خوا ئەفەرموێ: دوایی ئێوە بچێژن ئەم سزایە بە هۆی شتێ ئێوە باوەڕتان بەو شتە نەبوو. ئەمەیە: سزای ئەو کەسانە جیهان هەڵبژێرن بۆخۆیان و ڕێزی بدەن بەسەر پاشە ڕۆژداو ڕاستی ئەشارنەوە.

پرسیار/ خوای مەزن لەم ئایەتەدا ئەفەرموێ: (آلَيْسَ هذا بِالْحَقِ فَذُوقُوا الْعَذابَ) ئەو دوو فەرمودانە چۆن ڕێك ئەکەون لەگەڵ ئایەتی (١٧٤) ی سورەتی ئەلبەقەرە کە ئەفەرموێ: (وَلا يُكَلِمُهُمْ اللهُ يَوْمَ الْقِيامَةِ) خوا گفتوگۆ ناکا لەگەڵ بێ باوەڕان لە ڕۆژی هەڵسانەوە لە گۆڕەکان؟.

وەلآم/ مەبەست لە ناوەڕۆکی ئایەتی (١٧٤) ئەمەیە کە خوا گفتوگۆیان لەگەڵ ناکا بەشتێ دڵخۆشیان بکا. بەڵکو گفتوگۆیان لەگەڵ ئەکا بەشتێ خەفەتیان بداتێ.

﴿ قَدْ خَسِرَ الذِيْنَ كَذَبُوا بِلِغاءِ اللهِ حَتى إذا جاءَتْهُمُ السّاعَةَ بَغْتَةً ﴾ بە ڕاستی زیاند مەندبوون کەسانێکی ئەوتۆ بڕوایان نەبووە بە گەیشتنی فەرمودەکانی خوا لە زیندوبوونەوەو پرسیار و وولآم و ئەو گەیشتنەیان بەدرۆ ئەخستەوە هەتا کاتێ هات بۆلایان ڕۆژی دوایی بە کوتوپڕی و کەس نازانێ ئەو ڕۆژە چ کاتێ دێت، ئەو ڕۆژە ناوبراوە بە

(السّاعة) لەبەر بە گورجی و بە پەلە پرسیار تەواو ئەبێ. لە کاتێکدا بێ باوەڕان زیانۆمەند ئەبن. باوەڕداران ڕزگاریان ئەبێ و بە خۆش گوزەرانی ڕائەبوێرن.

﴿ قالُوا يا حَسْرَتَنا عَلَى ما فَرَّطْنا فِيها ﴾ ئەو کەسانەی بڕوایان بە زیندو بوونەوە نەبووە ئەڵێن:

ئەی پەشیمان بوونەوە خەفەت بۆ ئێمە لەسەر شتێ ئێمە لە کیسی خۆمانماندا لە جیهانداو تەمەنی خۆمانماندانا لەسەر گوناە کردن و بێ فەرمانی خوا.

﴿ وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزارَهُمْ عَلَى ظُهُورِهِمْ أَلا ساءَ ما يَزِرُونَ ﴾ وەئەو بێ باوەڕانە هەڵئەگرن گوناهەکانی خۆیان بەسەر پشتیانەوە. مەبەست لەو هەڵگرتنە ئەمەیە: کە گوناهەکانیان لکاوە بەوانەوە جوێ نابێتەوە لەوان، ئەو کەسانە خراپترین کەسن و بگرە چوارپێ لەوان چاکترە، چونکە چوارپێ هیچیان لە گوناە بەسەر پشتەوە نیەو بە ئاسایش ئەژین و دووای پرسیار لەناو ئەچن. بەڵام ئەو بێ باوەڕانە بە گوناهەکانیانەوە ئەچن بۆ ناو ئاگری دۆزەخ، ئێوە ئاگاداربن و بزانن خراپ شتێکە ئەو بێ باوەڕانە هەڵیان گرتووە لە گوناهەکانیان ئەو ڕستەیە گەورەترین هەڕەشەیە بۆ بێ باوەڕان.

﴿ وَمَا الحَياةُ الدُّنيا إلاَّ لَعِبٌ وَلَهْوٌ ﴾ وەنیە ژیان زیندەگانی جیهان کە ئێوەی تێك داوە مەگەر یاری کردن و خۆخەریك کردنە بەشتێکەوە ئادەمیزاد خەریك ئەکا بەبێ سوود. لە ماناکردنی ئایەتی (١٨٥) لە سورەتی ئالی عیمراندا وێنەی ئەو ڕستەیە ڕابوردووە.

﴿ وَلَلدارُ الأخِرَةِ خَيْرٌ لِلذِينَ يَتَقُونَ ﴾ وە بە ڕاستی خانوی ڕۆژی دوایی کە بەهەشتە چاکترە بۆ کەسانێکی ئەوتۆ لە خوا ئەترسن و خۆیان ئەپارێزن لە هاوبەشدانان بۆ خواو لە یاری کردنی بێ سودو خۆ خەریك کردن بە جیهانی بڕاوە.

﴿ أَفَلاَ تَعْقِلُونْ ﴾ ئایا بۆ ئێوە بیر ناکەنەوە عەقڵ ناخەنە کار کام یەکێ لەو دوو شتانە چاکە: خانویی ڕۆژی دوایی یا ئەم جیهانە، هەتا ئێوە باوەڕ بهێنن.

دوای ئەوانەی پێشوو خوا دڵی خۆشی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ئەداتەوە لەسەر ئەوەی ئەویان بە درۆ ئەخستنەوە، دوای ئەویش بەڵگەی ڕونی لەسەرداناون. ئەفەرموێ:

قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحْزُنُكَ ٱلَّذِى يَقُولُونَ ۖ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُوا۟ عَلَىٰ مَا كُذِّبُوا۟ وَأُوذُوا۟ حَتَّىٰٓ أَتَىٰهُمْ نَصْرُنَا ۚ وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ ۚ وَلَقَدْ جَآءَكَ مِن نَّبَإِى۟ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٣٤﴾ وَإِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكَ إِعْرَاضُهُمْ فَإِنِ ٱسْتَطَعْتَ أَن تَبْتَغِىَ نَفَقًا فِى ٱلْأَرْضِ أَوْ سُلَّمًا فِى ٱلسَّمَآءِ فَتَأْتِيَهُم بِـَٔايَةٍ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى ٱلْهُدَىٰ ۚ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٣٥﴾ ۞ إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسْمَعُونَ ۘ وَٱلْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٣٦﴾ وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يُنَزِّلَ ءَايَةً وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٧﴾

﴿ قَدْ نَعْلَمُ إِنَهُ لَيَحْزُنَكَ الذِي يَقُولُونَ ﴾ بەڕاستی ئێمە ئەزانین بەڕاستی تۆ خەفەتبار ئەکا شتێکی ئەوتۆ بێ باوەڕان ئەیلێن: لەبە درۆخستنەوە تۆ لەمەوپێش و ئێستاش بە تۆیان ئەوت: شێت و هۆنراوە بێژو جادوگەرو جگەی ئەوانیش.

﴿ فَإِنَهُمْ لا يَكَذِبُونَكَ وَلكِنَ الظّالِمينَ بِآياتِ الله يَحْجَدُونَ ﴾ دوایی بە ڕاستی ئەو بێ باوەڕانە لەنێو خۆیاناو لە پاش ملەو لە دەرونی خۆیانا تۆ بە درۆ ناخەنەوە، ئەزانن تۆ

ڕاستی و بە چاکت ئەناسن کە تۆ ڕاست ویژی، بەلاّم ئەو بێ باوەڕانە ستەم لە خۆیان ئەکەن باوەڕ بە ئایەتەکانی نامەکەی تۆ نایەرن بە ئاشکرایی، ئەگینا ئەزانن تۆ ڕاست ئەکەی. هەرکەسێ جەنگ بکا لەگەلّ کەسێکی ڕاست ویژ لەبەر ئەوەی لەسەر ڕاستیە. بێگومان جەنگ لەگەلّ ڕاستیەکە ئەکا لە ناوەڕۆکا نەك لەگەلّ خاوەنی ڕاستیەکە، هەرکەسێ جەنگ لەگەلّ پێغەمەر بکا و بە سوکی دانێ لەبەر ئەوەیە پەیامێکی هێناوە. بە ڕاستی کالّتە بەو کەسە ئەکا پەیامەکەی داوە بەو فروستادەیە کە خوای مەزنە، نەك بەو کەسە پەیامەکە ئەگەیەنێ کە فروستادەکەیە. بت پەرستانی مەکە بەر لە ڕەوانەکردنی پێغەمەر ناوی ئەویان ئەبرد بە ڕاست گۆو ئاسایش خواز، کاتێ کە کرا بە پێغەمەرو پەیامی خوای پێ دراو بەلّگەی لەسەر دانا دەستیان کرد بە جەنگ کردن لەگەلّیا بە بوختان کردن و ئەیان ووت:

جادوگەرو شێت و شاعیرە. کەواتە بە درۆخستنەوەی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بە درۆخستنەوەی خوایە لە ناوەڕۆکا. نەك بەدرۆخستنەوەی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ دوبارە خوا دلّخۆشی پێغەمەر ئەداتەوەو ئەفەرموی:

﴿ وَلَقَدْ كُذِبَتْ رُسُلٌ مِنْ قَبْلِكَ فَصَبَرُوا عَلَى ما كُذِبُوا حَتى أتاهُمْ نَصْرُنا ﴾ وە بەڕاستی بە درۆ خراونەتەوە چەندین نێرراوێ لە پێش تۆتو بون و ئازاریان دراوە لەسەر گەیاندنی پەیام دوایی ئەو فروستادانە ئارامیان گرتووە لەسەر شتێ ئەوانی پێ بە درۆخراوەتەوە ئازاریان دراوە. کەواتە تۆیش ئارام بگرە لەسەر بە درۆخستنەوەی خۆت و ئازاردانت هەتا کاتێ هات بۆلای ئەو نێرراوانە یاریدان و سەرخستنی ئێمە بۆ ئەوان، بە هۆی ئەو شتەوە بەلّێنم پێدابوون ئەگەر ئارام بگرن یارمەتیان ئەدەم و باوەڕداران سەرئەخەم، لەگەلّ تۆیش بەو جۆرە ئەکەین.

ئەو جۆرە ڕوداوانە بەسەر ژیانی ئادەمیزادا ئەسوڕێتەوە. بۆ نمونە ئەبینرێ ئەمرۆ پالّەوان بازیە لە نێوان چاکەو خراپەدا، لە نێوان گەلانی ژێر دەستەو ستەمکارانی ڕەگەز پەرست،

لە نێوان دوڕوی و ڕاستیدا، ناگونجێ ئەو کەسانە یارمەتی ڕاستی و سەربەستی ئەدەن لەلایەن دوژمنانی خۆیانەوە توشی ئازار نەبن، هەرگیز ڕاستی و سەربەستی سەرنەکەوتوون و سەرناکەون بەبێ خۆ ڕاگرتن و ماندوبوون و فیداکاری لەو ڕێگانەدا، خۆیان و خێزان و دارایی و پلەو پایەو ئاسایش و خۆشی خۆیان نەکەن بە قوربانی بۆ ڕاستی و سەربەستی، لە دواییدا بەبێ گومان بە ئاواتی خۆیان ئەگەن، بۆ ڕون کردنەوەی ئەو مەبەستە خوا ئەفەرموی: ﴿ وَلا مُبَدِلَ لَكَلِماتِ اللهِ ﴾ وە هیچ گۆڕانێ نیە بۆ فەرمودەکانی خواو بۆ بەڵگەکانی خوا کە یارمەتی خاوەن باوەڕان ئەداو بێ باوەڕان لە ناو ئەداو یاریدەی پێغەمەران ئەدا. نەبیسراوە بە وێنەی ئەم سەردەمەی ئێمە کە ستەمکارانی پێشوو بە ئەندازەی ستەمکارانی ئێستا بە ئاواتی خۆیان گەیشتبن، ئەوەتە ستەمکارانی ئەم سەردەمەی ئێمە لە هەموو جێگە گرنکەکاندا بنکەی سەربازی و بنکەی جەنگیانداناوە، هێلانەی کاول کردنیان ئامادە کردووە. بە هەموو چەکی نالەبار خۆیانیان چەکدار کردووە، دەستیان گرتوە بەسەر سامان و گیان و پیتی گەلانی هەژاردا، دەستیان گرتووە بەسەر بانگەکان و جێگەی گۆڕینەوەی پارەو دراوی زۆر لە هەرێمەکاندا، شوێنی بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەو گۆڤارو چاپەمەنیان داگیر کردووە لە زۆر شوێندا، بە جۆرێ دەستەڵاتیان پەیدا کردوە مرۆڤێ پاك و خاوێن و ئاسایش خوازبێ بە دەرەکی ئاوارەی ئەزانن، بۆی ناگونجێ وشەیەکی سەربەستانە و دادپەروەری بڵاو بکاتەوە، یا لە ئێزگەی ڕادوێ و کەناڵەکانی تەلەفزیۆن و بەرنامەیە بەخش بکا. بەڵام ناپاکان و ستەمکاران و لە ئایین وەرگەڕاوەکان و دوژمنانی ئایین و نیشتمان بۆ هەر جێگە بڕۆن و بیانەوێ مەبەستی خراپی خۆیان بڵاوبکەنەوە ڕێگەیان لێ ناگیرێ و ڕۆژباشیان لێ ئەکەن و ڕێزیان ئەگرن، ئەوەیش لە بەر ئەمەیە: خوا پەرستان و فیداکارانی ڕێگەی ڕاست و چاك یا نەماون یا ئەگەر مابن زۆر کەمن و بێ دەنگ دانیشتوون.

﴿ وَلَقَدْ جاءَكَ مِنْ نَبأ الْمُرْسَلِينَ ﴾ وە بە ڕاستی هاتوە بـۆلای تـۆ هـەواڵی بەسـەرهاتی نێردراوەکانی خوا کە بە چ شێوەیەکی خراپ ئازاردراون لەلایـەن گەلەکانیانـەوە، لەبـەر ئەوەی ئارامیان گرتوە خوا سەری خستوون، ئەو جـۆرە کارانـە نـە دەستوری خوایـن و ئەڕۆن و ناگۆڕێن.

هەرسێ کوڕەکانی عامیرو چەند کەسێ تر هاتنە خزمەت پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ داوایان کـرد لـە پێغەمەر نیشانەیەو کارێکی پەك خەری وەك پێغەمەرەکانی بهێنێ باوەڕت پێ ئەکەین، بـۆ ڕون کردنەوەی ئەو مەبەستە خوا فەرموی:

﴿ وَإنْ كانَ كَبُرَ عَلَيكَ إعْراضُهُمْ فَإنِ أسْـتَطَعْتَ أنْ تَبْتَغـى نَفَقـاً في الأرضِ أو سُـلْماً في السَماءِ فَتأتِهِمْ بأيةٍ ﴾ وەگەر گـران و گەورەیـە لەسـەر تـۆوەو گـەڕانی بـێ بـاوەڕان لـە وەرگرتنی ئایینی ئیسلام، دوایی ئەگەر تۆ توانات هەبوایە کە تۆ پەیدا بکەی کونێ لـە نێـو زەویدا بڕوێتە ناوی و بیێتە دەرێ و بەڵگە بۆ ئەوبێ باوەڕانە بهێنێ، یا پەیژەیە پەیدا بکـەی بۆ ئاسمان بەرز ببێتەوە بۆلای و بەڵگەیان بۆ بێنێتە خوارەوە بۆ ئەوەی باوەڕ بە ئاینی ئیسلام بهێنن، بێگومان تۆ توانای ئەو کارانەت نیە، دوای تۆ بڕۆی بۆلایان بە بەڵگەو نیشانەیەکی گەورەوەو تەنگە تاویان بکەی باوەڕ ناهێنن، کەواتە تۆ خەفەت مەخۆو ئارام بگـرە لەسـەر ئازاریان هەتا خوا فەرمانی خۆی لەواندا ئەنجام بدا.

﴿ وَلَوْ شاءَ اللهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى الْهُدى فَلا تَكُنَنَ مِنَ الجاهِلِينَ ﴾ وەئەگـەر خـوا ئـارەزۆی هەبوایە بەڕاستی بێ باوەڕانی کۆ ئەکردەوە لەسەر ڕاموویی و یاریدەی ئەدان لەسـەر بـاوەڕ هێنان بە زۆر. بەڵام ئەو کارە نرخی بۆ دانانرێ لە بازاڕی بەندایەتیداو ئەبێ باوەڕ هێنان لە دڵەوە دەرچێ بەبێ زۆرکردن.

دوایی تۆ لەو کەسانە مەبە نەزان و نەخوێنەواربن و خۆت ماندو مەکەو خەفـەتبار مەبـە لەسەر وازهێنانی ئەوان لە ئاین. بێگومان پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ نەزان نیە، چونکە ڕەوشـتەکانی ئەو لە قورئانەوە دەرچوە. بەڵام ئەو فەرمودەیە بۆ خوا دروسە، چونکە لە دروست کـەری بونەوەران دەرچوە بۆلای گەورە ترینی ئادەمیزادو جێگەی سەر بەزیە بۆ پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾.

بۆ زانین:خوای مەزن زۆر لەکەس ناکا بۆ ئەوەی باوەڕی پێ بهێنێ. بەڵکو واز لە ئادەمیزاد ئەهێنێ خۆی بۆ خۆی ڕێگەیە هەڵبژێرێ، دوایی ئەقڵی پێ داون و ڕێگەی چاك وخراپی نیشانداون و بەڵگەی ڕونی لەسەر داناون، بە تۆپزی دەست ناخاتە کارو باریان، بەشێکی سەربەستی پێ بەخشیون ئەتوانن بەهۆی ئەو بەشەوە چاك وخراپ جوێ بکەنەوە، هەروەك لە جیهاندا چاك وخراپ بۆ ژیانی خۆیان جوێ ئەکەنەوە ئەتوانن بە ئاسانتر ڕێگەی ڕاست بدۆزنەوە.

خوای مەزن هەرچەندە بە ڕستەی (فَلا تَكُنَنَّ مِنَ الجاهِلِينَ) ڕوی پێ کردوە بۆلای پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بەڵام مەبەستی خوا پەیڕەوانی پێغەمەرە ﴿ ﷺ ﴾ ئەگینا پێغەمەر چۆن ئەبێ نەزانبێ؟ کە ڕەوشتی ئەو قورئانبێ وەك باسمان کرد، خوای مەزن ڕێزی پێغەمەری پاراستوەو نەیفەرموە تۆنەزانی. فەرمویەتی: تۆ لە نەزانەکان مەبە، نەزانینی داوەتە پاڵ جگەی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾، ئەو ڕویێ کردنەی خوا بۆلای پێغەمەر گەورەترین شانازیو سەربەرزیە بۆ ئەو. پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ناخۆشی و دڵتەنگی وای توش نەبووە لە لایەن بت پەرستانەوە هەتا خوای مەزن سەرزەنشتی بکا بەو ڕستەی پێشوە.

بەڵام بۆ ئەمەیە: دڵی موسوڵمانان ڕۆشن بکاتەوەو ئامۆژگاریان بکا کە پێویستە ئارام بگرن و دڵ کراوە بن، ئادەمیزاد هەر پلەیەکی هەبێ پێویستە لەسەری ڕەوشتی بەرز بۆ خۆی هەڵبژێرێ، لە هەمویان گرنگتر پشت بەستنە بە خواو ئارام گرتنە لەسەر ئازاری دانیشتوان.

دوایی خوای مەزن بە جۆرێ تر هانی پێغەمەر ئەدا لەسەر ئارام گرتن ئەفەرموێ:

﴿ إنَّما يَسْتَجِيبُ الَّذِينَ يَسْمَعُونَ ﴾ بەراستی کەسانێکی ئەو تۆو وەڵامی تۆ ئەدەنەوە داواکاری تۆ ببیسن بەشێوەیە بیزانن و تەمێ خوار بن. بەڵام بێ باوەڕان وەك مردوان و ڕاستی نابیسن کەواتە تۆ دڵتەنگ مەبە لەگوێ نەگرتنیان کاتێ تۆ قورئان ئەخوێنی بەسەریانا. کەسێ وەڵامی تۆ ئەداتەوە گفتوگۆی تۆ ببیستێ وزیندو بێ، ئەوان دڵیان مردووە ناگونجێ وەڵامت بدەنەوە.

﴿ وَالْمَوْتَى يَبْعَثُهُمُ اللهُ ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴾ وە مردووەکان هیچ شتێ نابیسن کە سودی بێ بۆیان مەگەر ڕۆژێ خوا زیندویان بکاتەوە، ئەو کاتە هەموو شتێ ئەبیسن و سوێند ئەخۆن ئێمە لەو کەسانە نەبووین هاوبەشمان بۆ خوا دانەناوە. لە پاشا بۆلای خوا ئەگێڕرێنەوە، خوا پرسیاریان لێ ئەکا لەو شتانە گوێیان لێ نەکرتووەو خۆیانیان بێ ئاگا کردووە، بە سزاو پاداشتی خۆیان ئەگەن.

بە ڕاستی ئەو کەسانە تۆخۆیانیان بۆ ماندوو ئەکەی کە ڕانموویی وەردەگرن لە تۆی نابیسن بەجۆرێ سودی لێ وەرگرن، چونکە ئەو کەسانە جیهانیانیان کردووە بە خۆشەویستی خۆیان. کەواتە ئەوان وەك مردووان و شایستەی ڕوبۆلا کردن نین، وازیان لێ بهێننەوە بەرەلایان بکە هەتا ڕۆژی دوایی، هەتا بە چاوی خۆیان سزای ناهەمواری خۆیان ببینن و ڕێگە دەرچونیان نەمێنێ.

﴿ وَقَالُوا لَوْ لَا نُزِّلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِنْ رَبِّهِ ﴾ وە بێ باوەڕان ووتیان: بۆ نەنێرراوە بۆسەر موحەمەد نیشانەیەکی پەك خەر لەلایەن پەروەردەکەری خۆیەوەو تەنگیان پێ هەلچنێ هەتا باوەر بهێنن و نەتوان سەرپێچی بکەن. ئەو بەلگانە وەك هوشتری سالح و داردەستی موساو خوانی عیسا با کێوی ئەبو قوبەیس بەسەریانەوە ڕاوەستێنی، یا فریشتەیە بێت بۆلایان و شایەتی بدا موحەمەد پێغەمەرە.

پرسیار/ چۆن ئەو بێ باوەڕانە ئەو شتانەیان ئەووت، لەگەڵ ئەوەیشدا خوا ژمارەیەکی زۆری نیشانەو بەلگەی ڕونی ناردوەتە خوارەوە بۆسەر موحەمەد ﴿ ﷺ﴾.

وەلام/ بە ڕاستی مەبەست لەو بەلگەیە لەو ئایەتەدا ئەو کارە پەك خەرەی ئەوتۆیە بێ باوەڕەکان داوایان ئەکرد بۆیان بە مەرج بۆ باوەڕهێنانی خۆیان بە موحەمەد.

مەبەستیان بەلگەیە نەبۆ قنیات بەکەسێ بکا داوای ڕاستی ئەکا لەبەر ڕاستیەکەی ئەگەر ئەوەیان مەبەست بوایە پێویستیان بەوە نەبوو داوای بکەن، چونکە کاری پەك خەری زۆریان دیبوو لە پێغەمەرەوە ﴿ ﷺ﴾.

﴿ قُلْ إنَّ اللهَ قادِرٌ عَلَى أنْ يُنَزِلَ آيَةً ﴾ تۆ بڵێ: بە ڕاستی خـودا توانـای هەیـە لەسـەر ئەوەی کە بەنێرێتە خوارەوە ئەو نیشانەو بەڵگەیە ئێوە داوای ئەکەن. بەڵام خوا ئـەو ئایەتـە نانێرێتە خوارەوە لەبەر ئارەزۆو هەوەسی ئەوان، خـوا ئەنێرێتـە خـوارەوە شتێ خۆی بـە شایستەی بزانێ بە گوێرەی شیاوی بەندەکانی خۆی بێ.

﴿ وَلَكِنَ أكْثَرَهُمْ لا يَعْلَمُونَ ﴾ وە بەڵام زۆرتر لەو بێ باوەڕانە نازانن خوا بە گوێـرەی زانیاری بێ وێنەی خۆی شتی شیاو بۆ ئەوان ئەنێرێتـە خـوارەوە. ناردنـە خـوارەوەی ئـەو نیشانانە لەگەڵ بـەردەوامبوون لەسـەر بـێ بـاوەڕی ئەبێتـە هـۆی نەگبـەتی بـۆ ئـەوان و قلاچۆکردنیان ئەگەر باوەڕ نەهێنن. وێنەی گـەلانی پێغەمـەرە پێشـوەکان. کەواتـە ناردنـە خوارەوەی ئەو نیشانەیە بۆ ئەوان چاك نیە.

ئەو داخوازیە لەو بێ باوەڕانەوە، وەنەبێ هەر پیشەی ئەوانبێ و بـەس. بـەڵکو وێنـەیان ئێستایش زۆرن. ئەگەر بۆ ئەوان و بۆ هەموو بێ باوەڕانی تـری سـەر زەویـی بـە هـەزاران بەڵگەیان بۆبـهێنرێ بـاوەڕ نـاهێنن، ئـەبێ چ بەڵگەیـە گـەورەتربێ لـە دروسـت کردنـی ئاسمانەکان و زەوی و لـە جم و جوڵـی ئەسـتێرەکان و مانـەوەیان لەسـەر ئـەو پرۆگرامـە تایبەتیە لە جم و جوڵیانـا، لـە دروسـت کردنـی زەوی و کێوەکـان و زەریـا و دەریـا و ڕوبارەکان و کانگای زۆر بە نرخ و بە پـیت لە نێو زەویداو لە دروست کردنی درەخـت و ڕوەك بەهۆی بارانەوە؟

کاتێ خوای مەزن ڕونی کردەوە کە توانای ناردنە خوارەوەی نیشانەو ئەو داخوازییـەی ئەوانی هەیە. پاشان باسی شتێ ئەکا بەڵگە بێ لەسەر توانـای زۆر گـەورەتری خـوا. وەك بەڕێوەبردن و هەڵسوڕاندنی هەموو بونەوەران و دانانی هەموو شـتێ لـە جێگـەی شـیاوی خۆیا. ئەو نیشانەیە ئەوبێ باوەڕانە داوای ئەکەن سەر سوڕهێنەتر نیە لـە دروسـت کردنـی گیانداران و بەڕێوەبردنی کارو ئیشیان. ئەفەرموێ:

وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيۡهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمۡثَالُكُمۚ مَّا فَرَّطۡنَا فِي ٱلۡكِتَٰبِ مِن شَيۡءٍۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ يُحۡشَرُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا صُمّٞ وَبُكۡمٞ فِي ٱلظُّلُمَٰتِۗ مَن يَشَإِ ٱللَّهُ يُضۡلِلۡهُ وَمَن يَشَأۡ يَجۡعَلۡهُ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٣٩﴾

﴿ وَما مِنْ دابَةٍ فِي الأَرْضِ وَلا طائِرٍ يَطِيْر بِجَناحِهِ إلاّ أَمَمْ مِثْالُكُمْ ﴾ وە نیە هیچ شتێ بڕوا بەسەر زەویدا لە گیانداران و، نیە هیچ باڵندەیە بفڕێ بە هەوادا بە هۆی دوو باڵەکانی خۆیەوە، مەگەر چەندین کۆمەڵێکن خاوەنی سروشتی تایبەتی خۆیانن و تەمەن و خواردەمەنی بەسەرهاتیان دیاری کراوە لەلایەن خواو وێنەی ئێوەی ئادەمیزاد، دروستی کردوون و ئەمرن و زیندو ئەکرێنەوە لە ڕۆژی دوایدا وێنەی ئێوە، سوپاسی خوا ئەکەن و بێ ئاگانین لە خوا وێنەی ئێوە. بگرە ئێوە هەتا بە هەزاران خوا نەناسن. بەڵام ئەوان بە گشتی بێ ئاگانین لە خواو بە باشی ئەیناسن.

خوای مەزن بەو ئایەتە ڕونی کردوەتەوە کە بە ڕاستی لە نێوان ئادەمیزادو ڕوێندەو فڕندەکاندا جۆرە لەیەك چونێکمان هەیە. بەڵام خوای مەزن ئەو جۆرەی ئاشکران نەکردووە. ئایا لە دروست کردن و باوەڕ بە خوادایە، یا لەبەڕێوەبردنی هۆی ژیان و هەڵسوڕاندنی کارو باریان بۆ سودی خۆیان لە ژیانبدا، یا هەر بەشێکیان ئەناسرێن بە ناوی خۆیان وێنەی ئێمە بە خێزان و ڕەگەز ئەناسرێن، ئایا لەوانەدا وێنەی ئێمەن یا لە شتی تردا؟. هەرچۆنێ بێ زانایان بە زۆری هەوڵیانداوە بۆ ناسینی سروشتی گیانداران لە ڕۆیندەو فڕندەیاناو چۆنیەتی هەوەس و کردەوەیان، لە ئەنجامدا ئاگادارییان پەیدا کردوە

لەسەر چەندین نهێنی سروشتیان. بە جۆرێ بۆیان دەرکەوتووە کە ئەو نهێنیانە ئەبن بە بەڵگە لەسەر بوونی خوایەکی بەڕێوەبەری خاوەن تواناو هەموو شتێکی لە جێگەی شیاوی خۆیا داناوە. بۆ نمونە: کۆمەڵێ فیلەکان دادگا دائەنێن بۆ ناکۆکی نێویان خۆیان و دادوەر فەرمانی خۆی دەرئەکا لەسەر تاوانبار بە دورخستنەوەی لە کۆمەڵێ خۆیان هەتا بە تەنها بژی لە چۆڵەوانیدا.

کۆمەڵێ قەلەڕەشیش ئەگەر یەکێکیان هەستی بە ترس کرد بە دەنگێکی تایبەتی هاوڕێکانی ئەترسێنێو ئاگاداریان ئەکا، لە کاتی خۆشیدا بە جۆرە دەنگێ تر ئاگاداریان ئەکا، مێش هەنگ و مێرولە کردەوەو سروشتی زۆر سەرسوڕهێنەریان هەیە... بەڵام هەریەکە لەو کۆمەڵە ڕۆیندەو فڕندانە سروشتێکی جیاوازیان لە یەکتری هەیە بۆ بە خێوکردنی بێچووەکانیان و تیمارکردنیان، لە کۆششدان بۆ پەیدا کردنی خواردەمەنی بۆیان، لە پێك هێنان و ئامادەکردنی شوێنی حەسانەوەیان، پەیڕەو پڕۆگرامی تایبەتی خۆیان و نێوان بێچوەکانیان. ئەوانەو چەندین شتی تریان هەیە.

﴿ ما فَرَّطْنا في الْكِتابِ مِنْ شَيء ﴾ ئێمە وازمان لە هیچ شتێ نەهێنا لە نامەی خۆمان و نەمان نوسیبێ، هەموو شتێ لەو نامەیەدا کۆکراوەتەوە نوسراوە بە هەموو جۆرێ کە شیاوی خۆیانبێ. مەبەست لەو نامەیە ئەمانەن:

١- یا ئەو تەختەیە پارێزرراوە لە دەست کاری (اللوح المحفوچ) کە هەموو موشتێکی ڕابوردوو داهاتوی تێدا نوسراوە، چۆنیەتی ئەو لەوحە نهێنیە لای ئێمە مەگەر ئەوەندە بزانین پێی ئەووترێ نامە. خوا ئەزانێ چۆنە.

٢- یا بریتیە لە زانیاری خوای مەزن کە هەموو شاراوەکانی دڵی ئادەمیزادو ئەوانەیش دیارنین ئەیزانێ.

٣- یا بریتی لە قورئانی پیرۆز کە خوای مەزن ئەوەی پێویستبێ بۆ ئادەمیزاد لە بنچینەکانی ئایین و لقەکانی ڕون کردوەتەوە لە قورئاندا بەبێ کەم و کوڕی.

﴿ ثُمَّ إِلَيهِ يُحْشَرُونْ ﴾ لە پاشان لای خوا کۆ ئەکرێنەوە، ئادەمیزادو گیاندارانی تر بە باڵندەو جگەی باڵندەو کۆ ئەکرێنەوە بۆلای خوا هەتا بە جۆرێکی دادپەروەرانە هەموویان مافی خۆیان وەربگرن لە یەکتری یانێ هەرچۆن ئێمەی ئادەمیزاد کۆئەکرێنەوە لە ڕۆژی دواییدا گیاندارانی تریش کۆئەکرێنەوە. بەڵام هەموویان مەبەست و یەك پەیڕەویان نیەو بەرەو جێگەیەکی تایبەتی ئەبرێن لەو ڕۆژەدا کە ئادەمیزاد نای زانن، ئەو شتەی ئێمە بڕیاری لەسەر بدەین ئەمەیە: بەهەشت و دۆزەخ بۆ جگەی ئادەمیزادو جنۆکە دروست نەکراون.

لە پاشا خوای مەزن فەرمودەکەی خۆی دەست پێ ئەکاتەوە دربارەی ئەو کەسانە بەو جۆرە پێویستە فەرمودەکانی خوا نابیسن، ئەو کەسانە وێنەی ئاژەڵن و لە هیچ شتێ ناگەن و پێغەمەریش ئاگادار ئەکا لەسەر کەمو کوڕی ئەو کەسانەو ئەفەرموێ:

﴿ وَالَّذِيْنَ كَذَّبُوا بِآياتِنا صُمٌّ وَبُكْمٌ فِي الظُّلْماتِ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان بە ئایەتەکانی قورئانی ئێمە نیەو بەڵگەکانی ئێمە لەسەر ڕاستی موحەمەدو ئایینی ئیسلام بەدرۆئەخەنەوە کەڕن بانگەوازی تۆ نابیسن و گوێ لە ڕاستی ناگرن کە بەڵگەن لەسەر یەکێتی خواو لاڵن و گفتوگۆی ڕاستی بەدەمیا نایە لە بارەی یەکێتی خوا لە نێو چەندین تاریکدان: تاریکی بت پەرستی و بێ باوەڕی و گوناهباری و دەرچون لە دەستوری خواو لاسایی کردنەوەی نارەوای پێشوەکانیان و ئەوان لەنێو ئەو هەموە تاریکیەدان.

ئەو کەسانە ئەگەر ئامادەییان تێدا بوایەو بیریان بکردایەوە لەو شتانەی چوار لای گیاندارانی گرتوەتەوە ئایانزانی کە چۆن خوای مەزن هەستی وای بەخشیوە بەو گیاندارانە کە خۆیانی پێ ئەبەن بەڕێوە لە وشکایی و لەنێو دەریاو هەوادا. سروشت و تێگەیشتن و زیرەکی وای پێداون جێگەی سەر سوڕمانی ئادەمیزادن. کەواتە ئەو کەسانە ئامادەیی خۆیانیان لە کیسی خۆیانداوە.

﴿ مَنْ يَشأ اللهُ يُضْلِلْهُ وَمَنْ يشأْ يَجْعَلْهُ عَلَى صِراطٍ مُسْتَقِيمْ ﴾ هەرکەسی خوا ئارەزۆی هەبێ لای ئەدا لە ڕێگەی ڕاست و باوەڕ ناهێنێ، ئەبێ بزانرێ کە ئەو کەسە خوا ئەقڵی

داوەتیٚ و بەشێکی سەربەستی داوەتیٚ و چاك و خـراپ لای ڕونـه و بـه ئـارەزۆی خـۆی خراپەی هەلبژاردوه کەواته خوا هەموو شتێکی له جێگەی شیاوی خۆیـا دانـاوه، وه هـەر کەسیٚ خوا ئارەزۆی هەبیٚ دای ئەنیٚ لەسەر ڕێگـەی ڕاسـت و بـاوەڕ بـه ئـایینی ئیسـلام ئەهێنیٚ، چونکه به گوێرەی عەقلی خۆی ڕێگـەی ڕاسـتی بۆخـۆی هـەلبژاردوەو خوایـش یارمەتی داوه.

دانیشتوانی مەکه دوایان ئەکرد له پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾: کاتـیٚ ئێمـه بـاوەڕت پـیٚ ئەکـەین کێوەکانمان بۆ بکەی به دەشتی پان و بەرین و بن به باخ و بێستان و ڕوبـاری ئـاویی تێـدا پەیدا بیٚ، یا نامەیەکت بۆ بیٚ لــه ئاسمانـەوه. ئـەیانزانیٚ ئەوانـه هـەموویان سـودیٚ بـەوان ناگەیەنیٚ، بیرکردنەوه لـه خۆیان سودیان پیٚ ئەبەخشیٚ که هــەرکاتیٚ ئازاریـان توشـی بیـٚ هاواری خوا ئەکەن، ئەبوایه بیانزانیایه ئەو هـاوارەی ئـەوان گـەورەترین بەلگەیـه لەسـەر تەنهایی خوا، بۆ ڕون کردنەوەی ئەو شتانه خوا ئەفەرمویٚ:

قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ أَوْ أَتَتْكُمُ ٱلسَّاعَةُ أَغَيْرَ ٱللَّهِ تَدْعُونَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٠﴾ بَلْ إِيَّاهُ تَدْعُونَ فَيَكْشِفُ مَا تَدْعُونَ إِلَيْهِ إِن شَآءَ وَتَنسَوْنَ مَا تُشْرِكُونَ ﴿٤١﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَتَضَرَّعُونَ ﴿٤٢﴾ فَلَوْلَآ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُوا۟ وَلَٰكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ فَلَمَّا

نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُواْ بِمَآ أُوتُوٓاْ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾

﴿ قُلْ أَرَيْتَكُمْ إِنْ أَتاكُمْ عَذابُ اللهِ أَوْ أَتَتْكُمْ السّاعَةُ ﴾ تۆ بلێ بەو کەسانە واز لە پەرستنی خودا ئەهێنن و، جگەی خودا ئەیەسەنن: ئێوە هەواڵ بدەن بە من ئەگەر هات بۆلای ئێوە سزای خودا بەر لە مردنتان بەو جۆرەی هاتە خواروە بۆ سەر بێ باوەڕانی ڕابردو، یا هات بۆلاتان ترسی سەختی ڕۆژی دوایی.

﴿ أَغَيْرَ اللهِ تَدْعُونَ إِنْ كُنْتُمْ صادِقِيْنَ ﴾ یا لەو کاتانەدا ئێوە ئەپاڕێینەوە لە جگەی خودا لە بتەکان بۆلابردنی سزا لە خۆتان، ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن بتەکان خودای ئێوەن، دوایی ئێوە لەوان بپاڕێنە لە بۆئەوەی ڕزگارتان بکەن.

مەبەست لەو هەمووە ئایەتانە ئەوەیە: بێ باوەڕان لە ڕۆژی دواییدا بێزاری خۆیان دەرئەبڕن لەو شتانە کردویانە بە هاوبەش بۆ خوداو پەلاماری لای خودا ئەدەن.

بە کورتی خوای مەزن لە سروشتی ئادەمیزادا ئامادەیی تێدا دروست کردووە بۆ تێگەیشتن لەسەر بونی خواو تاك و تەنهایی خوا، ئەو ئامادەیە هەرگیز لەوان جوێ نابێتەوە، هەرکەسێ باوەڕی نەهێنابێ خۆی تاوانبارەو بە ئارەزۆی خۆی وازی هێناوە لە بەڵگەو نیشانەی ئاشکرا. کەواتە ئەو کەسە شایەنی سزایە لەبەر کەمتەرخەمی خۆی. پێویستە ئێمە بزانین جیاوازی نیە لە نێوان کەسێ کارنەکا بۆ چاکە بە گوێرەی زانیاری خۆی لەگەڵ کەسێ تر واز لە ڕاستی بهێنێ و دوای کاری پوچ بکەوێ لەگەڵ ئەوەیشدا توانایان هەبێ لەسەر جوێ کردنەوەی ڕانموییی و گومڕایی. بەڵام واز بهێنێ لە ڕاستی و

ڕانمویی لەبەرکەمتەرخەمی خۆی گاڵتە پێ کردن بە ڕاستی . بە ڕاستی زۆر ڕاست و بێ گومانە ئامادەیی ئادەمیزاددا ئەپۆشرێ لە پشتی پەردەی لاسایی کردنەوەو هەواو هەوەس و پەروەردەکردنی باو باپیران و پێشوەکانیانەوە، بە وێنەی داپۆشینی خۆر لە پشتی هەورەوە لەم ڕۆژەدا. بەڵام لە ڕۆژی دوایدا پەردە نامێنێ و هەموو شتێ وەك خۆی ئەبینرێ و جێگەیە بۆگومان نامێنێ.

﴿ بَلْ إِيَّاهُ تَدْعُونَ فَيَكْشِفُ ما تَدْعُونَ إِلَيهِ إنْ شاءَ وَتَنْسُونَ ما تُشْرِكُونَ ﴾ بەڵکو ئێوەی بت پەرست هەر داوا لە خوا ئەکەن نەك لە جگەی خوا بۆ لابردنی شتێ توشی ئێوە ئەبێ، دوایی خوا لائەبا شتێ ئێوە داوای ئەکەن لە خوا بۆ لابردنی ئەو شتە ئەگەر خوا ئارەزۆی هەبێ ئەو شتە لابا لەسەرتان و، ئێوەی بت پەرست لە بیری خۆتانی ئەبەنەوە شتێ ئێوە ئەتان کرد بە هاوبەش بۆ خوا لە بتەکان و وازیان لێ دێنن لە ڕۆژی دوایدا.

خوای مەزن سزای بەندەکانی خۆی نادا هەتا فروستادەی خۆی نەینێرێ بۆلایان و ڕانمویان بکا ڕێگەی خوا پەرستی، بۆ ئەو باسە خوا ڕونی ئەکاتەوە پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بەسەرهاتی گەلانی ڕابردوو کاتێك دژایەتی پێغەمەرەکانی خۆیانیان ئەکرد، بۆ ئەوە بزانرێ ئەوانەی ئێستایش وەك ئەوانیان لێ دێ کە بێ فەرمانی تۆ ئەکەن، وەك خوا ئەفەرموی:

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنا إِلى أُمَمٍ مِنْ قَبْلِكَ ﴾ وە بە ڕاستی ئێمە ڕاوانەمان کردوە بۆلای گەلانی پێشوو چەندین فروستادە هەتا بانگی ئەوان بکەن بۆلای پەرستنی خوا کەچی ئەوان پێغەمەرەکانی خۆیانیان بە درۆ خستۆتەوە. دوایی ئەوان باوەڕیان نەهێناوەو پێغەمەرەکانیان بەدرۆ خستەوە.

﴿ فَأَخَذْناهُمْ بِالْبَأْساءِ وَضَراءِ لَعَلَهُمْ يَتَضَرَعُونْ ﴾ دوایی ئێمە ئەوانمان گرتو سزامان دان. بە ئازاری سەخت و گران و بە نەخۆشی و دەردو ئازاری لەش، بۆ ئەوەی ئەوان بکوڕوزێنەوە لەبەردەم خوادا پەشیمان ببنەوە لە بت پەرستی و داوای لێ بوردن بکەن لە خودا، چونکە ئەو کەسانە کە تووشی زیان ئەبن پەنا ئەبەن بۆلای خوا بۆ ئەوەی ئەو زیانەی لەسەریانە هەڵیگرێ. بەڵام ئەوان بەو جۆرە هەڵناسن.

﴿ فَلَوْلا جاءَهُمْ بَأسُنا تَضَرَعُوْا ﴾ دوای کاتێ هات بۆلایان سزای ئێمە بۆ ئەکوڕوزانەوە. کەواتە بیانویان نیە بۆ واز هێنانیان لە کوڕوزانەوەو پەشیمانبوونەوە.

﴿ وَلكِنْ قَسَتْ قلُبَهُمْ وَزَيَنَ لَهُمْ الشَيْطانُ ما كانوْا يَعْمَلُونْ ﴾ وە بەڵام ئەو بت پەرستانە دڵیان ڕەق و ووشك بووە نەرمی و تەڕای تێدا نەماوە بۆ وەرگرتنی خوا پەرستی، شەیتان بۆیانی ڕازاندبۆوە شتێك کە ئەوان ئەیکەن لە گوناە کردن و درێژەدان بەبێ باوەڕی، بیریان لە شتێ نەئەکردەوە توشیان بووە لە هەژاری و نەخۆشی بەهۆی کردەوە خراپەکانی خۆیانەوە، لە ستەم و گومڕایدا مابوونەو.

ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خوای مەزن پاڕانەوە پەشیمان بوونەوە وەرئەگرێ لە هەموو کەسێ کە پەنای پێ بباو لەبەر توش بوونی هەژاری و ترس و برسێتی.

﴿ فَلَما نَسَوْا ما ذَكِرُ بِهِ فَتَحْنا عَلَيهِ أبوابَ كُلَ شَيءٍ ﴾ دوای هەمو وکاتێ لەبیریان بچوایەتەوە شتێ ئامۆژگاری ئەوانی پێ کرابوو کە واز لە بێ فەرمانی بهێنن و توشبوونیان بە نەخۆشی هەتا تەمێ خوار بن، ئێمە دەرگای هەموو شتێکمان بەسەردا کردنەوە لە ڕابواردن و هەرزانی و لەش ساغی و بەوانە تاقیمان کردنەوە ئایا ئێوە سوپاسی ئێمە ئەکەن و دانیشتوان ئاگاداری سوپاس کردنتان ئەبێ، دوای لابردنی ئەو سزایانە لەسەریان.

﴿ حَتَى إذا فَرِحُوا بِما أوتوْا أخَذْناهُمْ بِغْتَةً ﴾ هەتا کاتێ کەیف خۆش بوون و خۆیانیان لێ گۆڕا بە هۆی ئەو شتەی پێیان بەخشرابوو و دڵی خۆیانیان بەست بەو شتەوەو دەستیان دابووە ڕابواردنی . خراپ بیریان لە خوا پەرستی نەئەکردەوە، ئێمە ئەوانمان گرت کتوپڕو لە ناکاو سزامان توش کردن.

﴿ فإذاهُمْ مُبْلِسُونْ ﴾ دوای ئەو کاتە ئەوان بێ ئومێد بوون لە هەموو چاکەیەك خەفەت باربوون و بەتەمای ڕزگار بوون نەمان و بەڵگەیان بۆ نەمایەوە.

پوختە مانای ئەو ئایەتانەی پێشوو خوای مەزن جارێك ئەوانی توشی هەژاری ئەکردو جارێکی تر بە نەخۆشی هەتا ڕانویی وەرگرن. جارێکی تر بە هەرزانی و لەش ساغی،

وێنەی باوکێکی میهرەبان بۆ کوڕی خۆی بگرە زۆرتر هەتا لە خراپە بگەڕێتەوەو سوپاسی خوا بکەن کەچی ئەوان تەمێ خوار نەبوبون.

﴿ فَقُطِعَ دابِرُ القَومِ الذِيْنَ ظَلَمُوْ والْحَمْدُ لله رَبِ العالَمِينْ ﴾ دوایی بنەبڕ کریا پاش ماوەی ئەو تاقمەو هەموویان لە ناوبران و کەسیان نەمایەوە بە هۆی سزادانی ئێمەوە، هەموو سوپاس بۆ خوای پەروەردەکەری هەموو بونەوەر لەسەر ناوبردنی بێ باوەڕان و ستەمکاران و زەویان لێ پاك کرایەوە، بۆ ئەوەی کەسی تر توشی بێ باوەڕی و ئازاری ئەوان نەبێت.

جارێکی تر خوا ڕوی فەرمودەی خۆی ئەکاتە پێغەمەرو فەرمانی پێئەدا جارێکی تر بیری لە گەلانی ڕابردوو بکاتەوە پێش ئەوەی ئەمانەی ئێستایش وەك ئەوانیان بەسەر بێ و ئەفەرموی:

قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَخَذَ ٱللَّهُ سَمْعَكُمْ وَأَبْصَٰرَكُمْ وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم مَّنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِهِ ۗ ٱنظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ ثُمَّ هُمْ يَصْدِفُونَ ﴿٤٦﴾ قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ بَغْتَةً أَوْ جَهْرَةً هَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا نُرْسِلُ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ۖ فَمَنْ ءَامَنَ وَأَصْلَحَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٤٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَمَسُّهُمُ ٱلْعَذَابُ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٤٩﴾

﴿ قُلَ أرَيْتُمْ إنْ أخَذَ اللهُ سَمْعَكُمْ وأبْصارَكُمْ ﴾ تۆ بڵێ: بە بت پەرستانی مەکە: ئابا ئێوە چ شتێ ئەبیستن و ئەبینن ئەگەر خوا گوێچکە لە ئێوە وەربگرێتەوە گەڕتان بکاو هیچ شتێ نەبیستن، وەچاوەکانتان وەربگێڕێتەوەو کوێر بن و هیچ شتێ نەبینن.

﴿ وَخَتَمَ عَلَى قُلُبِكُمْ مِنْ إلَهٌ غَيْرُ اللهِ يأتِيكُمْ بِهِ ﴾ وە خوا مۆری دا لەسەر دڵی ئێوە داو هۆشتان نەمێنێ چ خوایەکە جگە لە خوای تاك و تەنها بیهێنێ بۆ ئێوە ئەو شتەی وەرگیراوەتەوە لە ئێوە؟.

ئادەمیزاد بە گوێچکە و بە دڵ و بە چاو بووە بە ئادەمیزادو ئەندامی سەرەکین، دوایی ئەگەر ئەوانەیان نەمایەوە وەك نەبووبن وان و ئاژەڵ لەوان چاکترە. بێ گومان خوا خاوەنی توانایە بۆ لەناوبردنی ئەو ئەندامانە، چونکە خۆی بۆیانی دروست کردووە.

﴿ أنْظُرَ كَيْفَ نُصَرِفُ الأياتِ ﴾ تۆ تەماشا بکە ئێمە چۆن دووپات ئەکەینەوە وەچەندین نیشانەی ڕون و ئاشکرا لەسەر تواناو یەکێتی خوا بۆ ئەو بت پەرستانە لە جۆرێکەوە بۆ جۆرێکی تر: جارێك بە ترساندن و هاندانیان، جارێکی تر بە ئامۆژگاری ئاگادارکردنەوەیان، جارێکی تر بە توش کردنی نەخۆشی و هەژاری، جارێکی تر بە خواردەمەنی نایاب هەتا تەمێ خوار بن ئامۆژگاری وەرگرن.

﴿ ثُمَ هُمْ يَصْرِفُونْ ﴾ لە پاشان ئەوان واز ئەهێنن لەو ڕاستیانەو باوەڕ ناهێنن و ئەو بەڵگانە بە درۆ ئەخەنەوەو لەسەر ستەمکاری بەردەوام ئەبن و یاخی ئەبن و لە خۆیان ئەگۆڕێن و خراپەی زۆر ئەکەن... دووبارە بۆ جارێکی تر خوا ئامۆژگاری بێ باوەڕا ئەکاو هەڕەشەیان لێ ئەکا بە سزای خۆی کە توشیان بێ و توانای گەڕانەوەی ئەو سزایەیان نەبێ ئەفەرموێ:

﴿ قُلَ أرَيْتُكُمْ إنْ أتاكُمْ عَذابُ اللهِ بِغِتَةً أو جَهْرَتاً ﴾ تۆ بڵێ: ئایا ئێوە هەواڵ ئەدەن بە من ئەگەر هات بۆلای ئێوە سزای خوا بە کوتوپڕی بەبێ پێشەکی بە تایبەتی لە کاتی خەوتانا لە شەودا، یان بێت بۆلاتان ئەو سزایە بە ئاشکراو خۆتانی بۆ ئامادە بکەن بە پێشکیەکی واوە کە بەڵگەیەکی بەسەر هاتنی ئەو سزایە هەبێت. بە تایبەتی لە ڕۆژدا.

﴿ هَلْ يَهْلَكُ إلا القَومُ الظالِمِينْ ﴾ لەناو نابرێ مەگەر ئەو تاقمەی ستەمکارن لە خۆیان وێنەی ئێوەی بت پەرستن؟ بەڵام پێغەمەر باوەڕداران توشی هیچ ئازارێ نابن ئەگەر منالێ یان باوەڕدارێ لە ناو ببرێ خوای مەزن بە دادپەروەری خۆی پاداشتیان ئەداتەوە لە پاشە ڕۆژدا بە جۆرێ ئەو شتەی ئەمڕۆ توشیان بووە زۆر کەمتربێ لەوەی لە پاشە ڕۆژدا دەستیان ئەکەوێ.

دوایی خوا ڕونی ئەکاتەوە کە پێغەمەران بۆ ئەوە نانێرڕێن بکرێن بە خواو توانای هەموو شتێکیان بێ. بەڵکو ئەنێرڕێن بۆ سوودی بەندەکانی خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَمَا نُرْسِلُ الْمُرْسَلِينَ إلاّ مُبْشرِينَ وَمُنْذَرِينْ ﴾ وە ئێمە ڕەوانەی ناکەین فروستادەکان مەگەر بۆئەوەی موژدەدەربن بە بە هەشت و ترسێنەربن بە ئاگری دۆزەخ.

ئەو شتانەی باسکران پیشەی پێغەمەرانن، ئەو پیشانە هەرچەندە بە ڕواڵەت ئاسانن. بەڵام لە ناوەڕۆکا زۆر گرانن و درێژن، چونکە ژیان و زیندەکانی بێ باوەڕان ئەخەنە مەترسیەوەو ناگونجێ پیشەی پێغەمەران لەگەڵ سودو پلەو پایەی ئەواندا بێت، پیشەی پێغەمەران کۆتایی پێ دێت بە پاداشتی کەسێ باوەڕ بهێنێ و کاری چاکە بکاو بە سزای کەسێ باوەڕ نەهێنێ و نیشانە ڕونەکانی خوا بە درۆ ئەخاتەوە، بۆیە ئەفەرموێ:

﴿ فَمَنْ آمَنَ وَاَصلَحَ فَلا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاهُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ دوایی هەرکەسێ باوەڕی هێنابێ، وەبەردەام بووبێ لەسەر کردنی کاری چاك لەبەر خواو خۆی بیارێزێ لە گوناە کردن و پەرستنی خوا بکا بە یاسای خۆی، دوایی ئەو کەسانە ترسیان لەسەر نیە لە ڕۆژی دواییدا بە سزای بەردەوام و، ئەوان خەفەت ناخۆن بۆ لە کیس چونی پاداشت لە ڕۆژی دواییدا.

﴿ وَالذِيْنَ كَذَبُوْا بِآياتِنا يَمَسُهُمُ الْعَذابُ بِما كانُوا يَفْسُقُونَ ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان بە چەندین نیشانە ڕونەکانی ئێمە ناهێنن کە بەڵگەن لەسەر یەکێتی ئێمەو بە درۆیان ئەخەنەوە، توشی ئەو کەسانە ئەبێ سزا لە ڕۆژی دواییدا بە هۆی ئەو شتەی ئەوان

لە سنوری ئایین دەرچون، سەر شۆڕی فەرمانی من و مـوژدەدان و ترسـاندنی پێغەمـەر نەبوون.

بت پەرستان داوایان لە پێغەمەر کرد هـەواڵی ئـەو شتانەیان بداتـێ لەبـەر چـاو نـین. سەرچاوەی ئاویان بـۆ هـەڵقوڵێنێ، فریشـتە بێنـە خـوارەوە، پێغەمـەر بچـێ بـۆ ئاسمـان و بیروخێنێ بەسەریانا، شتی تری زۆرتری وا کـە پـەیوەندیان بـە پێغەمەرایەتیـەوە نیـە، خـوا ئەفەرموێ:

قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمۡ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ إِنِّي مَلَكٌۖ إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّۚ قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡبَصِيرُۚ أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ ﴿٥٠﴾ وَأَنذِرۡ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحۡشَرُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ لَيۡسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِيّٞ وَلَا شَفِيعٞ لَّعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ﴿٥١﴾ وَلَا تَطۡرُدِ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ مَا عَلَيۡكَ مِنۡ حِسَابِهِم مِّن شَيۡءٖ وَمَا مِنۡ حِسَابِكَ عَلَيۡهِم مِّن شَيۡءٖ فَتَطۡرُدَهُمۡ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٢﴾ وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لِّيَقُولُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنۢ بَيۡنِنَآۗ أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَعۡلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٥٣﴾ وَإِذَا

جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِنَا فَقُلۡ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۖ كَتَبَ رَبُّكُمۡ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَۖ أَنَّهُۥ مَنۡ عَمِلَ مِنكُمۡ سُوٓءَۢا بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ وَأَصۡلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٥٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ وَلِتَسۡتَبِينَ سَبِيلُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿٥٥﴾

﴿ قُلْ لاأقُولُ لَكُمْ عِنْدِي خَذائِنُ اللهِ ﴾ تۆ بلێ بە بت پەرستان من نالێم: بە ئێوە لەلای منە گەنجینەی خوا بۆ بەشکردنی خواردەمەنی بونەوەران و کاروباری پاشە ڕۆژیان بە دەستی منبێ، ئەو شتانە هەموویان بە دەستی خوان بە تەنها و هەر ئەو هەڵسوڕێنەری هەموو بونەوەرانە.

﴿ وَلا أعْلَمُ الْغَيْبَ وَلا أقُولُ لَكُمْ إنِي مَلَكٌ ﴾ وەمن ئەو شتانە نازانم پەنهانن، دوایی من هەواڵ بدەم بەو شتانە ڕابوردن و ئەوانە لەمەو پاش پەیدا ئەبن و، من نالێم بە ئێوە: من لە ڕەگەزی فریشتەکانم و توانام هەیە بەسەر شتێکا ئەوان دەسەڵاتیان بەسەریانا هەیە. ئەو ڕستەیە لەوەوە هاتوە ئەیان ووت: چۆن ئەبێ فروستادە خواردن بخواو بگەڕێ بە بازاڕو ژن بهێنێ، من بەندەیەکم وەك ئێوەو سەرشۆڕی فەرمودەی خوام.

﴿ إنَ أتْبَعُ إلاّ ما يُوحى إلى ﴾ من دوای هیچ شتێ ناکەوم مەگەر شتێ بە سروش و بە خورپەی دڵ فەرمانم پێ بدرێ و بێت بۆلام.

بۆ زانین: بەڕاستی بۆ خوا هەیە چەند نیشانەیە هەر بۆ خوان بە تەنها: هەر خوایە توانای بەسەر هەموو شتێکا بێ، هەموو شتێ هەر ئەو ئەیزانێ. فریشتەکانیش خوا چەند نیشانەیەکی تایبەتی داونەتی: ئەتوانن بچن بۆ ئاسمانەکان، خواردەمەنی ناخۆن و ناخەون و ژن ناهێنن و بێ فەرمانی خوا ناکەن.

بەڵام فروستادەکان ئادەمیزادن بە وێنەی جگەی خۆیان و لەوان جوێ نابنەوە، لە جگەی خۆیان، جوێ ئەبنەوە بە هاتنە خوارەوەی سروش بۆلایان لەلایەن خواوە بە مژدەدان بەو کەسانە وولامیان ئەدەنەوە، بە ترساندنی ئەو کەسانە دژیان ئەوەستن بە سزای ئاگری دۆزەخ. کەواتە هەریەکە لە خواو لە فریشتەکان و لە فروستادەکان نیشانەیەکی تایبەتی خۆیانیان هەیە. تێکەڵاوکردنی نیشانەکانیان لە نەزانینەوەیە.

﴿ هَلْ يَسْتَوِي الأَعْمى والْبَصيرُ أَفَلا تَتَفكَّرُونَ ﴾ تۆ بلێ: ئایا کوێرو چاو ساغ، بێ باوەڕو باوەڕداو ڕێگە ناس و گومڕا، زاناو نەزان وێنەی یەکن، نەزان و گومڕا ئەو کەسانەن نیشانەی خواو فریشتە و پێغەمەر جوێ نەکەنەوە، پێویستە بزانرێ فروستادەکان ئادەمیزادن، هەر شتێ داوا لە ئادەمیزاد بکرێ داوا لەوانیش ئەکرێ، مەگەر بە سروش لەیەك جوێ بکرێتەوە. ئایا ئێوە بیرناکەنەوە پێغەمەران نەخوان و نەفریشتەن.

بەڵکو مژدەدەرو ترسێنەرن، ویژدان و ئەقڵ بخەنە کارو باوەڕ بە خواو بە موحەمەد بهێنن.

﴿ وَأَنْذِرْ بِهِ الَّذِيْنَ يَخافُونَ أَنْ يُحْشَرُوا إِلى رَبِّهِمْ ﴾ وەتۆ بترسێنە بەو سروشە دێتە خوارەوە بۆتۆ کەسانێکی ئەوتۆ لەبەر کەم توێشویی و کەم و کوڕی خۆیان ئەترسن کە کۆئەکرێنەوە بۆلای پەروەردەکەری خۆیان لە ڕۆژی دوایدا کە زۆر سامناك و ترساوییە.

زانایان بیریان جیاوازە: ئایا مەبەست لەو کەسانە ئەترسن ئایا باوەڕدارانە یان بێ باوەڕان ئەوانەیان کە ترساندن کار ئەکاتە سەریان: بەلای هەندێ لە زانایان هەموویان ئەگرێتەوە بێ باوەڕان ئەترسێنرێ بۆ ئەوەی ئەوانەیان ئومێدی باوەڕهێنانیان لێ ئەکرێ باوەڕ بهێنن بە دووپات کردنەوەی ترساندن، باوەڕ دارانیش بۆ ئەوەی باوەڕو زانینیان زۆرتربێ بە ئایین و بە فەرمانی ئایین. کەواتە هەردوولایان ئەگرێتەوە.

﴿ لَيْسَ لَهُمْ مِنْ دُونِهِ وَلِيٌ وَلا شَفيعٌ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴾ نیە بۆ ئەو کەسانە لە جگەی خوا هیچ دۆست و هیچ تکا کارێ بۆ ئەوەی لەو کاتەدا تۆ ئەیان ترسێنی ئومێد وایە ئەوان

لەخوا بترسن و سوودی لێ وەربگرن، چونکە ئەزانن جگەی خوا دۆستیان نیە هەر خوا ڕزگاریان ئەکا.

ساماندارەکانی قورەیش ڕۆیشتن بۆلای پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ تەماشایان کرد عەماری کوڕی یاسیرو خەباب و بیلال و جگەی ئەوانیش لە هەژاران لـە خزمـەت پێغەمـەردان. ووتیـان: ئەی موحەمەد: تۆ دڵت بەمانەوە بەستێ ئێمە چۆن دوای تـۆ ئەکـەوین، تـۆ لـەوان دور بکەرەوە لە کاتی دانیشتنی ئێمە لەگەڵ تۆودا، دوای ڕۆیشتی ئێمە ئەگەر تـۆ ویستت بـا بێنەوە بۆلای تۆ، پێغەمەر بە دڵیا هات و ووڵامی داواکەیان بداتەوەو هـەژارەکان دەربکـا، خوا بۆ ڕون کردنەوەی ئەو کارە فەروی:

﴿ وَلا تَطْرُدِ الذِيْنَ يَدْعُونَ رَبَهُمْ بالفطرةِ والْعَشـيِّ يُرِيـدُونَ وَجْهَـهُ ﴾وە تـۆ دەر مەکـە لەلای خۆت کەسانێکی ئـەوتۆ پەروەردەکـەری خـــۆیان ئەپەرسـتن بـەیانی و ئێـوارە و کاتەکانی تریش مەبەستیان هەر خوایە بە تەنها. نەك پاداشتێ لە پاداشتەکان .

﴿ ما عَلَيْكَ مِنْ حِسابِهِمْ مِنْ شَيءٍ ﴾ هیچ شتێ لەسەر تۆ نیـە لـە پرسـیارکردن لـەو باوەڕدارانەو بەخێر کردنیان و باوەڕ هێنانیان، داوا لەتۆ ناکرێ کـردەوەی ئـەوان بگرینـە ئەستۆی خۆت.

﴿ وَما مِنْ حِسابِكَ عَلَيْهِمْ مِنْ شَيءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ الظّالِمِينَ ﴾ وە هیچ شـتێ لـە پرسیارکردن لەتۆ لەسەر ئەوان نیە، دوایی تۆ ئەوان دەربکەی، دوایی تۆ بــەو بونـەوە لـە ستەمکارانبی. پرسیارکردن لەو هژارانەو لە جگەی ئەوان پەیوەندی بە پێغەمەریەتیوە نیـە و پرسیارکردن لە هەموو کەسێ لەسەر خوایە بە پرسیارکردن لە تۆیش، بەبێ جیـاوازی لـە نێوان تۆو ئەواندا، خوای مەزن ئەوان و تۆیش بەخێو ئەکا، کەواتە تۆ ڕوبکـە بـۆلای ئـەو کەسانە بەیانی و ئێوارە خوا پەرستی ئەکـەن و لەگـەڵیان دانیشـەو ئاوڕمـەدەرەوە بـۆلای گفتوگۆی ساماندارن و ئەوان فێڵ بازن و ئەیانەوێ ئاژاوە بخەنە نێوان تۆو ئەوان و تۆ ببـی بە ستەمکاران کە ستەم لە خۆت بکەی، ئەو باوەڕدارانە چاکترن کە تۆ لەلایان دانیشـی و سودت پێ ئەگەیەنن ئەگەر دەریان بکەی ستەم لە خۆت ئەکەی و لەوانیش.

بۆ زانین: موسڵمانان بڕوای بێگومانیان هەیە بەوەی کە موحەممەد بەڕێزترینی ئادەمیزادە لە هەموو لایەکەوە، لە هەمان کاتا نەدراوەتە دەستی کە پرسیار لەکەس بکا یا سزایان بدا یا پاداشتیان بداتەوە، ئەوانە هەموویان بەدەست خوان بە تەنها. بەو ڕەوشتەو بەو دەستورە بەرزە ئایینی ئیسلام جویَ ئەبێتەوە، بەو بۆنەوە هیچ ڕێگەیەکی جیاواز بۆ هیچ کەسێ دانەنراوە، بە هۆی ئەو ڕەوشتەوە ئێمەی موسڵمان خۆمان بەڕێز ئەزانین خۆمانی پێوە هەڵئەکێشین بەسەر هەموو باوەڕێکی کۆن و تازەدا. بە تایبەتی سۆشیالیست و کۆمۆنیستەکان و ڕەگەز پەرستان و هەموو بیروباوەڕانی تر.

پرسیار/ بۆ ئەبێ وازهێنان لە چاکەیە بۆلای چاکەیە تر دژایەتی هەبێ لەگەڵ بێگوناهی پێغەمەردا کە چاکەی موسڵمان ڕەچاو بکا؟.

وەڵام/ وازهێنان لە کاری چاکتر وەك دانیشتن لەگەڵ هەژاران بۆلای کارێکی بەوێنەی دانیشتن لەگەڵ ساماندااران بە ئومێدی باوەڕهێنانیان دروستە و قەدەغە نیە هەتا دژی بێگوناهی پێغەمەربێ ﴿ ﷺ ﴾ چونکە پێغەمەر ئەگەر هەژارانی دەربکردایە لەبەر ئەوە نەبوو بێز لە هەژاریان بکاتەوە. بەڵکو بەتەمای باوەڕهێنانی سەرۆکەکانی قورەیشبوو دوایی خوا پێغەمەری ئاگادار کرد ئیسلام پێویستی بە تاوانبارو یاخی بووان نیە، ڕۆژێ پەیدا ئەبێ بە کزۆڵی و بێ نرخی سەردانەوێنن بۆ ئیسلام، هەر وایش بوو.

﴿ وَكَذَلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ ﴾ وە بە ێنەی ئەو تاقی کردنەوەیە ئێمە هەندێ لە ئادەمیزاد تاقی ئەکەینەوە بە هەندێ تریان لە بارەی کاری ئاییندا، دوایی ئێمە ئەو هەژارانە پێش ئەخەین لەسەر سەرۆکەکانی قورەیش لە باوەڕ هێناندا.

﴿ لِيَقُولُوا أَهَؤُلَاءِ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنْ بَيْنِنَا ﴾ لەبەر ئەوەی سەرۆك ساماندااران بڵێن: ئایا ئەو هەژارانە چۆن خوا چاکەی ڕژاندوە بەسەریاناو ڕانموییی کردوون و باوەڕیان هێناوە لەنێوان ئێمەدا؟ ئێمە سەرۆك گەورە پیاوانین، ئەوانە هەژارو بێ دەسەڵاتن چۆن ئەبێ ئەوان ڕاست بکەن و لە چاکەدا پێشی ئێمە بکەون؟ دوایی خوای گەورە وەڵامی دانەوە.

﴿ أَلَيْسَ اللهُ بِأَعْلَمَ بِالشَّاكِرِينَ ﴾ ئایا خوا زاناتر نیە بەو کەسانە سوپاس گوزاری خوان و باوەڕ ئەهێنن و یاریدەیان بداو سەریان بخا بەسەر بێ باوەڕاندا.

بۆ نمونە: لە گەلانی پێشوودا کاتێ موساو هارونی برای چون بۆلای فیرعەون بەرگی خوریان لەبەردابوو هەریەکەیان چەکەکەیان دار دەستێ بو بە دەستیانەوە. بە فیرعەونیان ووت: بەڵێنت ئەدەینێ ئەگەر باوەڕ بهێنی پاشایەتی و گەورەیت بەردەوام ئەبێ.

فیرعەون بە دانیشتوان ووت: بۆ سەرتان سوڕنامێنێ لەو مەرجەی ئەوان ئەیدەن بە من بەم شێوەیە ئەوان هەیانە؟ ئەگەر ڕاست ئەکەن بۆ فرە نادرێ بە سەریانا زێڕو زیو، بەڵام خوای مەزن فروستادەکانی خۆی سەرخست و ئەوانی بێ ئابڕۆ کرد. ئەم هەژارانەی موسڵمانانی سەرخست بەسەر ساماندارانی قوڕەیشدا دوای ئەوەی خوای گەورە باسی ئەو هەژارانەی کرد بەوەی کە هەموو کاتێ لە خوا پەرستندان، فەرمان ئەدا بە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ کاتێ ئەو هەژارانە هاتن بۆلای تۆ لە پێشەوە سڵاویان لێ بکا، وەك ئەفەرموێ:

﴿ وَإِذَا جَاءَكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِنَا ﴾ وەهەر کاتێ هاتن بۆلای تۆ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە بە ئایەتەکانی قورئانی ئێمە کە بەڵگەن لەسەر ڕاستی تۆ.

﴿ فَقُلْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ ﴾ دوای تۆ بڵێ بەو باوەڕدارانە: سڵاوی ئاشتیان لێبێ، بۆ ئەوەی هەست بکەن بەڕێزی خۆیان. ئەو ڕستەیە دروشمی موسڵمانانە لە کاتی گەیشتن بە یەکتری، پاڕانەوەیە بۆ بەردەوامی خۆشی و دووربونی برایانی ئایینی لە کارەساتی ناڵەباری هەردوو جیهان، بە ئاسایش و ئارامی بژین لەژێر میهرەبانی خواداو ئاسایش لەگەڵ خەشمی خوادا ناگونجێ، ئەو دروشمەی خوا دیاری کردوە چۆن بەرانبەر ئەکرێ لەگەڵ ڕۆژباش و شەو باش کە دروشمی جگەی خوان، چونکە خوا ئەفەرموێ:

﴿ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ أَنَّهُ مَنْ عَمِلَ مِنْكُمْ سُوءاً ﴾ بە باوەڕداران بڵێ: پەروەردەکەری ئێوە پێویستی کردوە لەسەر خۆی بەزەیی و میهرەبانی کردن لەگەڵ بەندەکانی خۆی و هەرگیز ئەو بەزەییە لەو جوێ نابێتەوە کە بە ڕاستی هەر کەسێ لە ئێوە کارێکی خراپی کردبێ بە نادانی و نەفامی و خۆی توشی گوناه کردبێ.

﴿ ثُمَّ تابَ مِنْ بَعْدِهِ وَأَصْلَحَ فَأَنَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ لە پاشا ئەو کەسە دوای ئەو خراپەیە پەشیمان ببێتەوە لەو خراپەیەو کاری چاك بکا بۆ پاشەڕۆژو، نیازی پاك و پوختبێ بێ دوایی بەڕاستی پەروەردگار خۆش ئەوی لەو کەسەی پەشیمان بوبێتەوە لە گوناهەکانی، خاوەنی بەزەییە بۆ بەندەکانی خۆی.

بۆ زانین: پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ئەفەرموێ: خوا منی بەخێو کردوەو ئامۆژگاری کردووم بە شیرینترین بەخێوکردن و دەرونی پاك کردومەتەوە لە هەموو خراپەیە، چ ئامۆژگاری و بەخێوکردنێ وێنەی بەخێو کردنی دروست کەری ئاسمانەکان و زەویی بێ؟ چ دەرونێ بێ لە دەرونی موحەمەد پاکتر بێ کە خوا پاکی کردبێتەوە؟ بەڕاستی خوای گەورە ئەو دەرونەی پاك کردوەتەوە گەشەی پێ بەخشیوە هەتا بیکا بەجێگای پەیام و ڕەوانەی بکا بۆلای ئادەمیزادو هەموو بونەوەران، بۆ ئەوەی هەمو ڕەوشتی پاك و چاك پەرەپێ بدا.

لەو ئایەتەی پێشوداو لە چەندین ئایەتی تردا خوای مەزن تەمێ پێغەمەری دا پێغەمەری فێری ئەوە کردووە کە چۆن هەڵسێ و گفوگۆ بکا لەگەڵ هەژاران و لاوازاندا؟ بە پێغەمەری ناساندوە ڕویان تێ بکا بە ڕوی گەش و کراوەدا، بەو جۆرەی لەو ئایەتەدا باسی کراوە سلاویان لێ بکا، کاتێ لەگەڵیان دانیشت ئەو هەڵنەسێ هەتا ئەوان هەڵئەسن. هەرکاتێ خوا پێغەمەری خۆی بەو جۆرە بەخێو کردبێ، ئێمەش پێویستە لەسەرمان دوای ئەو بکەوین و چاو لەو بکەین و ڕێزی کەس نەگرین لەبەر دارایی پلەو ڕەگەزو ڕەنگ، ڕێزی هەموو کەس بگرین لەبەر ئایین و ڕەوشتی بەرزیان. زانایانی مێژو ڕونیان کردۆتەوە کە ژیان و ڕێزی ئادەمیزاد پێش هاتنی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ زۆر دابەزی بو، لە پاشا پێغەمەر بەرزی کردەوە بۆ پۆپەی. بەداخەوە نەختە نەختە دابەزیوە هەتا ئەم سەردەمەی ئێمە کە ئادەمیزاد نرخی بۆ دانانرێ و مافی مرۆڤ پێشێل کراوە. بە تایبەتی لە ئەمەریکاو ڕوسیاو زۆرتر لە جێگەکانی تر جگە لە ڕەگەزو سەرمایە داری و پارتایەتی نرخ بۆ هیچ شتێ تر دانانرێ، لە زۆربەی کیشوەرەکان بیروباوەڕ دەربڕین خەفە کراوە بە تایبەتی بیروباوەڕی پاکی ئیسلام.

لای ئایینی ئیسلام ڕەگەزو ڕەنگ و پلەو سامان و جگەی ئەوانیش نرخیان بۆ دانانرێ جگە لە خواپەرستی هیچ شتێ تر ڕێزی بۆ دانانری، ئاینی ئیسلام پێویستی کردوە لەسەر موسڵمانان هەر لە پێغەمبەرەوە ﴿ ﷺ ﴾ هەتا بچوکترین موسڵمان ڕێگە بدەن بە هەموو کەس بچنە لایان و بە گەورەو بچوکیانەوەو مافی مرۆڤایەتی خۆیانیان بدرێتێ. بەبێ دەرگاوان و بەبێ پەردەدار، ڕێگەیان پێ بدرێ بە ئارزۆی خۆیان بدوێن، بیرو باوەڕو نزاو سکاڵای خۆیان دەربڕن. بەڵام پاپای گاورەکان و سەرۆکە ئاینەکانی تر هیچ کەسێ خەو بە دانیشتنی لایانەوە نابینێ جگە لە شالیارو گەورە پیاوان، پێویستە لە پێشەوە کات و جێگەو ماوەی دانیشتنیان دیاری بکرێ، بە وێنەی سەرۆك و پاشاکانی ئەم سەردەمەی ئێستا، هەزار هەوڵ بدرێ بۆ هەژاران و لاوازان و ئاوڕیان بۆ نادرێتەوەو ناگەنە لایان و مافیان بە فیڕۆ ئەچێ.

﴿ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ الأيَاتِ ﴾ وەهەر بە وێنەی ئەو ڕون کردنەوەیە ئێمە ڕون ئەکەینەوە ڕەوشتی خوا پەرستان سو تاوانباران و ئەوانەی بەردەوامن لەسەر تاوان کردن و پەشیمان ئەبنەوە بۆلای خوا، ئێمە درێژە ئەدەین بە ئایەتەکانی قورئان لە باسکردنی ڕەوشتی هەموو تاقمێ لەوانەو پەردە لەسەر ڕویان لائەدەین،

﴿ وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ الْمُجْرِمِينَ ﴾ وەلەبەر ئەوەی بۆ تۆو موسڵمانان و هەموو ئادەمیزاد ڕون ببێتەوە ڕێگەی تاوانباران، بە وێنەی ڕون کردنەوەی ئەو کەسانەی ڕانمویان وەرگرتوە، پێویستە تۆیش لەگەڵ پەیڕەوانی خۆتا بە گوێرەی کردەوەی خۆیان لەگەڵیانبی. خوای مەزن لە ئایەتی پێشودا ڕونی کردەوە ڕێگەی تاوانباران، لەمەو دوایش ڕونی ئەکاتەوە ڕێگەی پەرستنی جگەی خواو ئەبێتە هۆی تاوانباری، ئەفەرموێ:

قُلْ إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ قُل لَّآ أَتَّبِعُ أَهْوَآءَكُمْ قَدْ ضَلَلْتُ إِذًا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾

قُلْ إِنِّي عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي وَكَذَّبْتُم بِهِۦ ۚ مَا عِندِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِۦٓ ۚ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۖ يَقُصُّ ٱلْحَقَّ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْفَٰصِلِينَ ﴿٥٧﴾ قُل لَّوْ أَنَّ عِندِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِۦ لَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٨﴾

﴿ قُلْ إنـي نُـهيتُ أنْ أعْبُـدُ الذِيـنَ تَدْعُـونَ مِـنْ دُونِ اللهِ ﴾ تـۆ بڵـێ: بـه ڕاسـتی مـن قەدەغەکراوە لێم بە بۆنەوەی ئەو شتەوە بۆمن دانراوە لـە بەڵگـەکان هاتونەتـە خـوارەوە بۆسەر من لـە ئایەتەکان لـە بارەی یەکێتی خواوە کە من بپەرستم کەسـانێکی ئـەوتۆ ئێـوە داوایان ئەکەن من بیان پەرستم لـە جگەی خوا.

﴿ قلْ لا أتبِعُ أهْواءَكُمْ قَدْ ضَلَلْتُ إذا وَمـا أنـا مِنَ الْمُـهْتَدِينَ ﴾ تـۆ بلـێ: مـن دوای ئارەزوی خراپی ئێوە ناکەوم بە ڕاستی ئەو کاتە من ڕێگەم لێ وونبوە کە دوای ئێوە بکـەوم و هەرگیز ئەوەیش ناکەم و لـەمن ناوەشێتەوەو، من ئـەو کاتـە لـەو کەسـانە نـابم ڕانموێـم وەرگرتبێ ئەگەر پەیڕەوی ئارەزوو هەوەسی ئێوە بکەوم، چوکنە ئـەو پەرستنەی ئێـوە لـە گومڕاییەوەیە پوچ و بێ مانایە، چۆن من پەیڕەوی ئێوەی بێ بەڵگە ئەکەوم.

﴿ قُلْ إني عَلَى بَيِّنَةٍ مِنْ رَبي وَكَذَبْتُمْ بِهِ ﴾ تۆ بڵێ: بە ڕاستی من لـەسـەر بەڵگـەی ڕون ئاشکرام بۆ یەکێتی خودا لـەلایەن پەروەردەکەری خۆمەوە بۆم هـاتووە لـە قورئـانداو لـە زانین و ناسینی بێ گومانەوە خوا ئەپەرستم و، ئێوە بەبێ بەڵگە باوەڕ بە پەروەردگاری مـن ناهێنن و نای پەرستن، بە نەزانین و نادانی خۆتان بتەکانتان ئەپەرستن، چۆن داناو زانا دوای نەزان ئەکەوێ؟. پوچ و چەپەڵ خوازان چۆن ئەبنە پێشـەوای راسـت ودروسـت خـوازان وخودا پەرستان.

کاتێ پێغەمەر﴿ ﷺ﴾ داوای کرد لە بت پەرستان باوەڕ بهێنن،ووتیان:ئادەی داوابکە لە ئاسمانەوە بەرد بباریێ بەسەرمانا یان سزایەکی تری خاوەن ئازار بێت بۆ لامان خوا فەرمانیدا بەپێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بەوان بلێ:

﴿ ما عِندی ما تَستَعْجِلُونَ بِهِ ﴾ لای من نیە شتێ ئێوە پەلە ئەکەن بۆ هاتنی وداخوازی بۆ ئەکەن. بەڵکو ئەوانە لای خوان و ئەو ئەیان نێرێ لەو کاتەدا بیەوێ‌ن من توانای پێش کەوتن و پاش کەوتنی ئەو سزایانەم نیە.

﴿ إنِ الحُکْمُ إلاَّ لله یَقُصُ الْحَقَ وَهُوَ خَیْرُ الْناصِلِینَ ﴾ فەرماندان نابێ بۆ پێش خستن و دوواخستنی هەمو شتێ مەگەر بۆ خوایەو بەس، خوا هەواڵ ئەدا بە ڕاستی و ئەیفەرموێ و دادپەروەری خۆی دەرئەخا بۆ هەموو شتێ و، هەر خوایە چاکترین کەسانێ فەرمان دەربکاو هەموو شتێکی دیاری کردووە، چاك و خراپ جوێ ئەکاتەوە، ستەم لەکەس ناکاو لە کاتی دیاری کراودا هەموو شتێ ئەکا.

﴿ قُلْ لَوْ أنَ عِندِي ما تَستَعجِلُونَ بِهِ لِقَضی الأمْرُ بَینی وَبَیْنَکُمْ وَالله أعْلَمُ بالظّالِمِینَ ﴾ تۆ بلێ: ئەگەر بە ڕاستی لای من بووایە شتێ ئێوە پەلە ئەکەن بۆ هاتنی ئەو شتە لەهاتنە خوارەوەی سزا بۆتان بەڕاستی ئەو کارە جێبەجێ ئەکراو داواکەتان ئەهاتەدی و ئێوە لەناو ئەچون و بنەبڕ ئەبون و ئەو شتەی نێوان من و ئێوە کۆتایی پێ ئەهات و، خوا زاناترە بە کەسانێ ستەمکار، هەر خوا ئەزانێ بە کاتی هاتنی سزا بۆسەریان پێشی بخا یا دوای بخاو زاناترە بە سودی هەموان.

کاتێ خوای مەزن ڕونی کردەوە هەر خۆی زاناترە بە ستەمکاران، دوایی ڕونی ئەکاتەوە پەنهان نیە لای خوا هیچ شتێ لەوانە دیارنین و شاراوەی هەموو بونەوەران ئەزانێ، ئەفەرموێ:

وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ ۚ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ

فِي ظُلُمَٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٥٩﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيْلِ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِٱلنَّهَارِ ثُمَّ يَبْعَثُكُمْ فِيهِ لِيُقْضَىٰٓ أَجَلٌ مُّسَمًّى ثُمَّ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٦٠﴾ وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ وَيُرْسِلُ عَلَيْكُمْ حَفَظَةً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾ ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّ أَلَا لَهُ ٱلْحُكْمُ وَهُوَ أَسْرَعُ ٱلْحَٰسِبِينَ ﴿٦٢﴾

﴿ وَعِنْدَهُ مَفاتِحُ الْغَيْبِ لا يَعْلَمُها إلاّ هُوَ ﴾ وەلای خوایە گەنجینەکانی ئەو شتە پەنهان و نادیارین و لای خوایە کلیلەکانی ئەوان و بەوان دەرئەکەون ئەو شتانە دیارنین وەك پاداشت و سزادان و ڕۆزی و تەمەنی ئادەمیزاد ئەو گەنجینانە نازانێ جگە لەخوا، هەر خوا ئەزانێ بە پاش و پێشی سزادان و کاتی پەیدابوونی، هەر خوا ئەزانێ چ کاتێ ئادەمیزاد زیندوو ئەکاتەوەو چ کاتێو لە چ جێگەیە باران ئەبارێنێ و چ شتێ لە منداڵدانایە بەر لەوەی گیان بکرێ بە بەریاو لە کوێ ئەمرێ.

﴿ ويَعلَمُ ما في الْبَرِ والْبَحْرِ ﴾ وە خوا ئەزانێ بە شتێ لە بیابان و ووشکایی و لە نێو دەریادایە لە گیانداران و درەخت و گیاوو کانگاکان و لە گەوهەرو باو باران و هەورو بەفرو تەرزە.

﴿ وَما يَسْقُطُ مِنْ وَرَقَةٍ إلاّ يَعْلَمُها ﴾ وە ناکەوێتە خوارەوە هیچ گەڵایە لە درەختەکانداو ژمارەیان چەندەو چ کاتێ ئەکەوێتەوەو چەندیان بە درەختەکانەوە ماوەنەتەوەو لە چە درەختێ ئەکەونە خوارەوە. مەگەر خوای ئەوانە ئەزانێ.

﴿ وَلا حَبَةٍ فِي ظُلْماتِ الأَرْضِ وَلا رَطْبٍ وَلا يابِسٍ إلاّ فِي كِتابٍ مُبِينٍ ﴾ وەناکەوێتە نێو تاریکەیەکانی زەوی هیچ دەنکە دانەوێڵەیەو، نە تەڕو نە وشك لە بونەوەراندا نین مەگەر خوا ئەیانزانێ و مەگەر هەموویان نوسراون و دانراون لە نامەیەکی ئاشکرادا ژمارەو شوێن و کاتیان. مانای ئەو نامەیە لە ئایەتی (٣٨)ی ئەم سورەتە باسی کراوە، بریتیە لە زانیاری خوایا لە لەوحل مەحفوز. یا لە قورئانی پیرۆز.

﴿ وَهُوَ الذي يَتوفاكُمْ بِالَيْلِ وَيَعْلَمُ ما جَرَحْتُمْ بِالنَهار ﴾ وەخوا کەسێکی ئەوتۆ بە ئێوە ئەخەوێنی لە شەودا بە زۆری بۆ ئەوەی پشو بدەن. بە جۆرێکتان لێ ئەکا وەك مردبن و گیانتان پەیوەندی بە لەشتانەوە نامێنێ بە گوێرەی ڕواڵەت و لە هیچ شتێ ناگەن هیچ شتێ جوێ ناکەنەوەو، وەخوا ئەزانێ بەشتێ ئێوە ئەیکەن بە ئەندامەکانتان بە ڕۆژدا لە چاك و خراپ.

﴿ ثُمَ يَبْعَثَكُمْ فِيهِ لُيُقْضى أجلُ مُسَميً ﴾ لەپاشا خوا ئێوە زیندو ئەکاتەوە لە ڕۆژداو لەخەوو بێدارتان ئەکاتەوەو تێگەیشتن و هوشیاریتان ئەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی کۆتایی پێ بهێنرێ ئەو ماوە دیاری کراوە بۆ ژیان و بۆ تەمەنتان و گیانتان و ئەکێشرێ و بە تەواوی ئەمرن.

﴿ ثُمَ إلَيْهِ مَرْجِعَكُمْ ثمّ يَنَبِّئُكُمْ بِما كُنْتُمْ تَعْلَمُوْنْ ﴾ لە پاشا بۆلای خوایە گەڕانەوەتان دوای مردنتان لە ڕۆژی دواییدا، لە پاشا خوا هەواڵ بە ئێوە ئەدا بەو شتەی لە جیهاندا لە چاك و لە خراپ کردبێتتان.

بە کورتی هەموو ئادەمیزادێ ئەمرێ و کۆتایی بە ژمارەی تەمەن و ژیانی دێت، لە پاشا خوا زیندوویان ئەکاتەوە پاش مردنیان، بە وێنەی ئاگادارکردنەوەیان لە خەو، لە ڕۆژی دواییدا پاداشت و تۆڵەیان ئەدرێتە دەست و ستەمیان لێ ناکرێ.

پرسیار/ بۆچی خەوتن دراوەتە پاڵ شەوو کارکردن دراوەتە پاڵ ڕۆژ، لەگەڵ ئەوەیشدا وائەبێ بە ڕۆژا خەوتن و بە شەوا کارکردن؟

وەلام/ ئەو ئایەتە هاتۆتە خوارەوە دەبارەی ئەو شتانە لەو کاتانەدا بەزۆری ئەکرێن و پەیدا ئەبن.

﴿ هُوَ القاهِرُ فَوْقَ عِبادِهِ ﴾ وەخوا دەسەلات و توانای لەسەرەوەی بەندەکانی خۆییەوەیە، ئەیانبا بەڕێوەو هەڵیان ئەسوڕێنێ بەو جۆرەی ئارەزۆی هەیە، دروستی کردوون بەبێ پرسی ئەوان و ئەیشیان مرێنێ بە بێ پرسی خۆیان.

﴿ وَيَرْسِلُ عَلَيْكُمْ حَفَظَةً ﴾ وەخوا ڕەوانە ئەکا بۆسەر ئێوە چەندین فریشتە بۆ ئاگاداری و چاودێری کردنی ئێوەو کردەوەو گفتوگۆتان ئەنوسن لەنامەی کردارتانا، هەموویان ئەزانن و کەم و زۆریان لێ وون نابێ و خوا ئەوانی فێرکردووە.

بۆ زانین: پێویستە لەسەر ئێمە باوەڕی تەواومان هەبێ بەڕەوانەکردنی ئەو فریشتانە، چونکە فەرمویەتی هەن و دژی ئەقڵیش نیە. بەلام چۆنیەتی نوسەرەکانی و نوسینەکەیان هەواڵەی زانیاری خوای مەزنە. هەروەها ئەو فریشتانە لە ئاگاداری کردنی ئێوەدان.

﴿ حَتى إذا جاءَ أَحَدَكُمْ الْمَوتُ تَوَفَتْهُ رَسُلُنا وَهُمْ لا يَفَرِطُونَ ﴾ هەتا دێت بۆلای هەریەکە لە ئێوە نیشانەکانی مردن گیانی ئەو کەسە وەرئەگرن فروستادەکانی ئێمە ئەوانەیان یاریدەری فریشتەی گیان کێشن، وە ئەو فریشتە نێرراوانەی ئێمە سستی و کۆتایی ناکەن لە وەرگرتنی گیانی ئەو کەسانە ئەمرن بە یاریدەی فریشتەی گیان گێشانیان و سەرپێچی ناکەن بە هیچ شێوەیە.

﴿ ثُمَ رَدُوا إِلى اللهِ مَوْلاهُمْ الْحَقِ ﴾ لە پاشا بەندەکان بە هۆی مردنەوە ئەگێڕێنەوە بۆلای خوا لە کاتی زیندوبونەوەیاندا ئەو خوایە بەڕێوەبەری کارو فرمانیانە ڕاست و دادپەروەرە لە فەرمانیان بۆ پاداشت و تۆڵەیان.

﴿ ألا لَهُ الْحُكْمَ وَهُوَ أَسْرَعُ الْحاسِبِينْ ﴾ ئێوە بزانن و ئاگاداربن بۆ خوایە فەرماندان و دیاری کردنی چاك و خراپی ئادەمیزاد لە ڕۆژی دواییدا، فەرمان دەرکردن بۆ جگەی ئەو وێنەو، خوا بە پەلەترینی پرسیار کەرانە، پرسیار ئەکاو هەموو شتێ جێبەجێ ئەکا لە

کورت ترین ماوەدا، چونکە ڕاستی ڕون و ئاشکرایە، پاداشت و تۆڵە ئامادەکراون، لەو ڕۆژەدا هیچ شتێ ڕێگە لەخوا ناگرێ. ئادەمیزاد بە گوێرەی سروشتی خۆیان هەرکاتێ توشی سزاو ناخۆشی ببن داوا لە خوا ئەکەن بۆ نەمانیان و بەڵێن ئەدەن ئەگەر ڕزگاریان بێ واز لە خراپەو گوناە دێنن و نیاز پاکی بەکاردێنن، سود بە ئادەمیزاد ئەگەیەنن و دەست گیرۆیی دانیشتوان ئەکەن کەچی کاتێ خەفەت و ئازارەکانیان نەما ئەگەڕێنەوە بۆلای سروشت و کاری پێشویان، خوا ئەفەرموێ:

قُلْ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ تَدْعُونَهُۥ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً لَّئِنْ أَنجَىٰنَا مِنْ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٦٣﴾ قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنْهَا وَمِن كُلِّ كَرْبٍ ثُمَّ أَنتُمْ تُشْرِكُونَ ﴿٦٤﴾ قُلْ هُوَ ٱلْقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن فَوْقِكُمْ أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ ٱنظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَفْقَهُونَ ﴿٦٥﴾ وَكَذَّبَ بِهِۦ قَوْمُكَ وَهُوَ ٱلْحَقُّ قُل لَّسْتُ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ﴿٦٦﴾ لِّكُلِّ نَبَإٍ مُّسْتَقَرٌّ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٦٧﴾

﴿ قُلْ مَنْ يَنْجِيكُمْ مَنْ ظُلْماتِ البَرِ وَالْبَحْرِ ﴾ تۆ بڵێ: چ کەسێ ئێوە ڕزگار ئەکا لەو ئازارو ناخۆشیانەی توشتان ئەبێ لە چەندین تاریکی دەشت و بیابان ووشکایی، تاریکی

شەوو تۆزو هەورو، چ کەسێ ئێوە ڕزگار ئەکا لە تاریکیەکانی دەریاو لە ئازاریان ڕزگارتان ئەبێ: تاریکی شەو تاریکی هەورو تەم ومژو ترسی ڕەشەباو شەپۆلی دەریا.

﴿ تَدْعُونَهُ تضرعاً وَخُفْيَةً لَئِنَ أَنْجانا مِنْ هذهِ لَتَكُونَنَ مِنَ الشّاكِرِينَ ﴾ ئێوە ئەپاڕێنەوە هاوار لە خوا ئەکەن بە گزۆڵی و بە ئاشکرایی و بە نهێنی و سوێند ئەخۆن و ئەڵێن: بەڕاستی ئەگەر خوا ئێمەی ڕزگارکرد لەم ناخۆشی و ترس و ئازارو خەفەتە و لەسەر مانی هەڵگرت بەڕاستی ئەبین بە کەسانێ سوپاسی خوا بکەین لەسەر ڕزگاربونمان لە ئازارو ئێش و میهرەبانی خوا لە لەبیر ناچێ و چاکەکان بەجێ ئەهێنن و خراپە ناکەین.

﴿ قُلِ اللهُ يُنْجِيكُمْ مِنْها وَمِنْ كل كَرَبٍ أَنْتُمْ تُشْرِكُونَ ﴾ تۆ بڵێ: خوا ئێوە ڕزگار ئەکا لە تاریکیەکانی بیابان و دەریا و لە هەموو خەفەت و ئازارو مەترسیە. کەواتە پێویستە لەسەر ئێوە سوپاسی چاکەکانی خوا بکەن بەسەرتانەوە، لە پاش ئەو چاکانە ئێوە هاوبەش بۆ خوا دائەنێن و ئەگەڕێنەوە بۆلای کرداره خراپەکەی خۆتان و بەڵێنەکانتان ژێر پێ ئەکەن.

﴿ قُلْ هُوَ الْقادِرُ عَلَى أنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذاباً مِنْ فَوْقِكُمْ ﴾ تۆ بڵێ: خوا توانای هەیە بەسەر ئەوەدا بڕێژێ بەسەر ئێوەدا سزایە لە ژورتانەوە، وەك هەورەگرمەو دەنگێکی ناهەموارو گازی کیمیاوی و دووکەڵی خنکێنەرو تۆفان. وێنەی تاقمەکانی نوح و لوتوو هلوڕێکانی فیل.

﴿ أَوْ مِنْ تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ ﴾ یا لەژێر پێکانتانەوە بە ڕۆچونی زەوی و بومەلەرزەو تەقینەوەی مین، وێنەی قارون بە خۆی و کۆشکی و دام و دەزگاییەوەو چون بە نێو زەویدا.

﴿ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيْعاً وَيَذِيقَ بَعْضَكُمْ بَأْسَ بَعْضٍ ﴾ یاخوا ئێوە بگێڕی بە چەندین تاقمی بیروباوەڕ جیاوازو بەربینە یەکتری و نرختان بۆ دانەنرێ و لەسەر هیچ نیازو مەبەستێ ڕانەوەستین، وەخوا بچەژێنێ بە هەندێ لە ئێوە ئازاری هەندێ ترتان. یانێ هەندێکتان

هەندێکتان بکوژن و بەندیان بکەن و تالانیان بکەن، ئەو ئایەتە گەورەترین هەڕەشەیە بۆ بێ باوەڕان. هەواڵ دانیشە بەشتێ پەیدا ئەبێ دوای هاتنی خوارەوەی ئەو ئایەتە. ئەوەتا لەم سەردەمی ئێمەدا بە تەنها لە کوردستانی عێراقدا چەندین تاقم پەیدابوون لە ئیسلامی جگەی ئیسلامی.

﴿ أنْظُرْ كَيْفَ نَصرِفُ الأياتِ لَعَلَّهُمْ يَفْقَهُونْ ﴾ تۆ تەماشا بکە چۆن ئێمە ڕونی ئەکەینەوەو دوبارەی ئەکەینەوە چەندین بەڵگەی ئاشکرا بۆ ئەو بێ باوەڕانە لە موژدەدان و هەڕەشەکردن، بۆ ئەوی ئەوان ڕاستی بناسن و دوای بکەن و لە کاری پوچ دوور بکەونەوە، ئەقڵ بخەنە کار، بە پێچەوانەی ئەو بەڵگانە هەڵسێ بیانوی لێ وەرناگیرێ و شایستەی سزایە.

﴿ وَكَذَّبَ بِهِ قَوْمُكَ وَهُوَ الحَقُّ ﴾ وەباوریان بە قورئان و بە سزا نەهێنا خزمەکانت و، قورئان ڕاستەو سزایش پەیدا ئەبێ بەبێ گومان.

﴿ قُلْ لَسْتُ عَلَيْكُمْ بِوَكِيلْ ﴾ تۆ بڵێ بە خزمەکانت: من چاودێری کەرم نیم بەسەرتانەوە هەتا سزاتان بدەم لەسەر واز هێنان لە ڕاستی. بەڵکو من ڕاگەیاندنم لەسەرەو بەس، سزا حەواڵەی خوایە.

﴿ لِكُلِّ نَبأٍ مُسْتَقِرٌ ﴾ بۆ هەموو هەواڵێ لە هەواڵەکان کاتێ هەیە کۆتایی پێ بێ لە جیهاندا یا لە شەوو ڕۆژدا.

﴿ وَلَسَوفَ تَعْلَمُونْ ﴾ وەلەمەودا ئێوە ئەزانن و بۆتان دەرئەکەوێ پەیدابوونی ئەو هەواڵە لە کات و جێگای خۆیا، ئەو ڕستەیە گرانترین هەڕەشە باوەڕ بە ڕاستی نەهێنرێ، دوایی خوا فەرمان ئەدا بە پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ کە باوەڕداران واز لە دانیشتن بهێنن لەگەڵ خزمە بێ باوەڕەکانیان لەو کاتەدا لاقرتی و کاڵتە بە خوێندنی قورئان ئەکەن و ئەفەرموێ:

وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦ ۚ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ

ٱلشَّيْطَٰنُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ ٱلذِّكْرَىٰ مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٨﴾ وَمَا عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ وَلَٰكِن ذِكْرَىٰ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٦٩﴾ وَذَرِ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ دِينَهُمْ لَعِبًا وَلَهْوًا وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ وَذَكِّرْ بِهِۦٓ أَن تُبْسَلَ نَفْسٌۢ بِمَا كَسَبَتْ لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِىٌّ وَلَا شَفِيعٌ وَإِن تَعْدِلْ كُلَّ عَدْلٍ لَّا يُؤْخَذْ مِنْهَآ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أُبْسِلُوا۟ بِمَا كَسَبُوا۟ ۖ لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ ﴿٧٠﴾

﴿ وَإذا رأيْتَ الذِيْنَ يَخوضُونَ في أياتِنا ﴾ وەهەر كاتێ تۆ بینیت کەسانێکی ئەوتۆ درێژە ئەدەن بە تانەدان لە ئایەتەکانی قورئانی ئێمەداو بە درۆیان ئەخەنەوە.

﴿ فأعْرِضْ عَنْهُمْ حَتى يَخوضُوا في حَدِيثٍ غَيْرِهِ ﴾ دوایی واز لەو بێ باوەڕانـە بهێنـە و لەگەڵیان دامەنیشە بە تایبەتی لای ئەو کەسانە لە مزگەوتی ڕێزداربن هەتا ئـەوان دەست ئەکەن بە گفتوگۆیە تر جگەی قورئان. مانای ئـەو ڕستانە لـە ئایـەتی (١٣٩)ی سـورەتی نیساو دا باسیان کراوە.

﴿ وَإما يُنسِيَنَكَ الشَيْطانُ ﴾ وەئەگەر شەیتان لەبیری تۆی بردەوەو لەگـەڵیان دانیشـتی و خەریك و پەژارەی کردی و لەبیرت نەما و دانیشتی لەگەڵیان.

﴿ فَلا تَقْعُدْ بَعْدَ الذِكْرى مَعَ الْقَوْمِ الظّالِمينْ ﴾ دوای ئەوەی تۆ بیرت کەوتەوە هەڵسە لەلایان دامەنیشە لەگەڵ ئەو تاقمە ستەمکارانە. ئەو ئایەتە هەرچەندە بە گوێرەی ڕواڵەت ڕوی پێ کراوە بۆلای پێغەمەر. بەڵام لە ناوەڕۆکا مەبەست جگەی پێغەمەرە ﴿ ﷺ ﴾، چونکە پێغەمەر خوا پاراستویەتی لە گوناه. ئەگەر بەو جۆرە نەبێ فەرمودەو کردەوەو بێ دەنگی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ نەئەکران بە دەستورو بەلگەی بێ گومان بۆ موسڵمانان و پێچەوانەی قەدەغە نەئەبو.

﴿ وَما عَلَى الذِيْنَ يَتَقُونَ مِنْ حِسابِهِمْ مِنْ شيءٍ ﴾ وەناکەوێتە سەر کەسانێکی ئەوتۆ خۆیان ئەپارێزن لە بت پەرستی و گاڵتەکردن هیچ شتێ لە پرسیارو گوناهی بت پەرستان و، ئەوانەتانە ئەدەن لە قورئان هیچ شتێ لە گوناهی ئەوان ئەگەر ئێوە لەگەڵیان دانەنیشن.

﴿ وَلَكِنْ ذِكْرى لَعَلَهُمْ يَتَقُونَ ﴾ وەبەڵام باوەڕداران ئامۆژگاری بێ باوەڕان بکەن بە ئامۆژگاری کردنێکی ژیرانە بۆ ئەوەی ئەوبێ باوەڕانە دەست نەکەن بە تانەدان لە قورئان بەهەر جۆرێ بۆتان لواو بۆتان گونجا، بۆئەوەی خۆیان بپارێزن لەو کارە خراپانەو ئەو گاڵتەکردنە.

﴿ وَذَرِ الذِيْنَ اتَخَذُوا دِينَهُمْ لَعِباً وَلَهْواً ﴾ وەتۆ واز بهێنە لە کەسانێکی ئەوتۆ ئاینی خۆیانیان وەرگێڕتووە بە یاریکردن و پێکەنین و گاڵتەکردن و وایان داناوە فەرمانی ئاینی خۆیان دانراوە لەسەر هەواو هەوەس و کاری پوچ و خۆخەریك کردن بەشتی بێ سوودەوە. ئەو ڕستەیە هەرچەندە ڕوی پێ کراوە بۆلای پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾. بەڵام هەموو باوەڕداران ئەگرێتەوە کە هەموویان تێکەڵاوی ئەو کەسانە نەکەن ئایینی خۆیان کردوە بە گەمەو گاڵتە. خوا فەرمانی داوە ئامۆژگاریان بکرێ، چونکە ڕستەی ( وَذَكِّرْ بِهِ ) فەرماندانە بە ترساندن.

﴿ وَغِرَتْهُمُ الحَياةُ الدُنْيا ﴾ وە ژیان و زیندەگانی جیهان فریوی ئەو کەسانەی داوە بە جۆرێ وای لێ کردون باوەڕ بە کۆبونەوەی پاشەڕۆژو زیندوبونەوە نەهێنن.

هەرکەسێ خۆی بداتە پاڵ ئایینێ لە ئاینەکان و ڕێزی لێ نەگرێ، باسی فەرمانی لە فەرمانەکانی ئەو ئایینە بکا بە شێوەیە سەر بکێشێ بۆلای گاڵتە پێ کردن بەو ئایینە، بە گوێرەی مانای ئەو ئایەتە فرێ بە ئاینەوە نیە. کەواتە پێویستە گرنگی پێ نەدرێ، زۆر ڕونە ئەو کەسانە ئەوانەن ئەیانەوێ خۆیان بگەیەنن بە پلەو پایەو سامان و کۆکردنەوەی دارایی و ئایین ئەکەن بە پەیژەو دەست ترازە بۆ گەیشتن بە ئاواتی جیهانی خۆیان، ئەگەر لە زوربەی کردەوەی ئادەمیزادی ئەم سەردەمە ووردبینەوە بۆمان دەرئەکەوێ هەندێ نەزان و گێل کە بە ڕوواڵەت ئایینیان گرتوە بەدەستەوە ئەوانە بە هیچ جۆرێ خاوەنی ڕێزنین کە بە مێزەرەی زل و پشنوێنی سەوزو ڕیشی پان و پرچی درێژ خۆینایان داپۆشیوە نەزان و ساویلکەی ئادەمیزادیان پێ ئەخەڵەتێن، دڵیان لە ئایین پەروەری دوورەو ئەو کارانە ئەکەن بۆ گەیشتن بە ئاواتی خۆیان، وای دەرئەخەن گوایە ئەوان خۆشەویستی خوان. بەلام خۆشەویستی جیهان دڵی داگیرکردوون و ڕێگەی ڕاستی لێ وون کردون. ڕواڵەتی خۆیان ئەرازێننەوە هەتا یگەن بەلەوەڕو ئالفی جیهانی خۆیان. کەواتە ئێوەی باوەڕدار وازیان لێ بهێنن با بلەوەڕێن و ڕابوێرن، لەمەو پاش بۆیان دەرئەکەوێ چ شتێکیان بەسەردێ.

دوای ئەوەی خوا قەدەغەی کرد لە پێغەمەرو باوەڕداران هاورێتی ئەو کەسانە نەکەن، ئایینی خۆیانیان کردە بە گاڵتەو گەپ و یاری منالانە: فەرمانیشیان پێ ئەداو ئەفەرموێ:

﴿ وَذَكِّرِ بِهِ أَنْ تُبْسَلَ نَفْسٌ بِما كَسَبَتْ ﴾ وەتۆ ئامۆژگاری بت پەرستەکان بکە بە فەرمودەکانی قورئان، لەبەر ئەوەی هیچ کەسێ بەند نەکرێ لە دۆزەخدا و نەکرێ بە گیرۆدەی شتێ کردویەتی لەبێ فەرمانی خوداو، بێ بەشبێ لە پاداشتی چاك.

﴿ لَيْسَ لَها مِنْ دونِ اللهِ وَلِيٌّ وَلا شَفِيعٌ ﴾ نیە بۆ ئەو کەسە لە جگەی خوا هیچ دۆستێ بەهێزبێ ڕزگاری بکا لە سزای خواو، بۆیشی نیە هیچ کەسێ بۆی بپاڕێتەوە لای خوا ڕزگاری بکا مەگەر بە دەستوری خوا.

﴿ وَإِنْ تَعْدِلْ كُلَّ عَدْلٍ لا يُؤْخَذْ مِنْها أُولَئِكَ الَّذِينَ أُبْسِلُوا بِما كَسَبُوا ﴾ وەئەگەر ئەو کەسە بکا بە فیداکار هەموو فیدارکارێ و هەموو بەرتیلێ و ئەوەی لە ڕوی زەویدایە وەرناگیرین ئەو شتانە، ئەوانە کەسانێکی ئەوتۆن سپێرراون بۆ لەناو چون و بۆلای ئاگری دۆزەخ بەشتێ کردویانە لە تاوان و خراپە.

﴿ لَهُمْ شَرابٌ مِنْ حَمِيمٍ وَعَذابٌ أَلِيمٌ بِما كانُوا يَكْفُرُونَ ﴾ بۆ ئەو کەسانە هەیە لە دۆزەخدا ئاوێکی زۆر گەرم و سزایەکی خاوەن ئازار بە هۆی شتێکەوە باوەڕیان پێ نەهێنا.

پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ داوای لە بت پەرستان ئەکرد بۆ پەرستنی خوا، ئەوانیش داوایان لە پێغەمەر ئەکرد بۆ پەرستنی بتەکان خوای مەزن لەو بارەیەوە فەرمانی دا بە پێغەمەر﴿ ﷺ ﴾ فەرموی:

قُلْ أَنَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا وَنُرَدُّ عَلَىٰٓ أَعْقَابِنَا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ كَٱلَّذِى ٱسْتَهْوَتْهُ ٱلشَّيَٰطِينُ فِى ٱلْأَرْضِ حَيْرَانَ لَهُۥٓ أَصْحَٰبٌ يَدْعُونَهُۥٓ إِلَى ٱلْهُدَى ٱئْتِنَا ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۖ وَأُمِرْنَا لِنُسْلِمَ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ وَأَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّقُوهُ ۚ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٧٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۖ وَيَوْمَ يَقُولُ كُن فَيَكُونُ ۚ قَوْلُهُ ٱلْحَقُّ ۚ وَلَهُ ٱلْمُلْكُ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ ۚ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿٧٣﴾

﴿ قُلَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللهِ مالاَيَنْفَعَنا وَلا يَضُرُنا ﴾ تۆ بڵێ: ئایا ئێوەی بت پەرست داوا ئەکەن لە ئێمە بپەرستین لە جگەی خوا شتێ سود بە ئێمە نەگەیەنێ، وەزیان لە ئێمە نەدا ئەگەر نیپەرستین.

﴿ وَنُرَدَ عَلَى أعْقابِنا بَعْدَ إذْهَدانا اللهُ ﴾ وەك ئێمە بگێڕینەوە بۆ پاشەوەی خۆمان و بۆلای بت پەرستی دوای ئەوەی خـوا ڕانموییی ئێمەی کردوە بۆ لای ئاینی ئیسلام و لەتەنگە بەری بێ باوەڕی و گومڕای ڕزگارۆی کردوین. ئەگەر ئێمە لە ئاینی ئیسلام و ڕاستی وەردەگەڕێن توشی سزا ئەبین.

﴿ كالَذي أسْتَهوته الشّياطِينُ فِي الأرْضِ حَيْرانَ ﴾ ئێمە وێنەی کەسێ ئەبین شەیتانەکان بردبێتیان و فڕەی دابێتە نێو چۆلانی زەویی بەسەرگەردانی نەزانی سەر بۆ چ لایە دەرنەکاو چارەیە بۆ خۆی نەدۆزێتەوە.

﴿ لَهُ أصْحابٌ يَدْعُونَهُ إلى الْهُدى أئْتِنا ﴾ بۆ ئەو کەسە هەبێ چەندین هاوڕێی دڵسۆز بەزەییان پێوە بێتەوەو بانگی کەن و بڵێن: وەرە بۆلای ئێمە، ئەمەیە ڕێگەی ڕزگاربوونی تۆیە. بەڵام ئەو کەسە وولامیان نەداتەوە لەبەر سەرگەردانی خۆیی و دوایی لەناو بچێ.

﴿ قُلْ إنَ اللهَ هُوَ الْهُدى وأمْرِنا لِنُسْلِمَ لَربِ الْعالَمِينَ ﴾ تۆ بڵێ بەو بت پەرستانە: بەڕاستی ڕانمویی کردنی خوا هەر ئەو ڕانموییە و ڕێگەی ڕاستەو ئایین هەر ئاینی ئیسلامەو جگەی ئەو گومڕایی ڕوتە، وە ئێمە فەرمانمان پێدراوە بەوەی ئێمە موسڵمان بین لەبەر فەرمانی پەروەردەکەری هەموو بونەوەران و بە نیازی پاکەوە هەر ئەو بپەرستین بە تەنها، هەر کارێ لەگەڵ ڕانموییی خوادا نەگەن بەیەك نەفامی و گومڕاییە.

﴿ وَأنْ أقيمُوا الصَلاةَ وأتْقوهُ وَهْوَ الذي إلَيْهِ تَحْشَرُونَ ﴾ وە فەرمانمان پێدراوە کە ئێوە نوێژەکانتان بکەن و بەرپای بکەن، پێویستە ئێوە بزانن ڕانمـوی ئیسلام بەبێ نوێژکردن پەیدا نابن، بە گوێرەی یاسا یەکێکە لە پایەو کۆڵەکەی ئیسلام و، فەرمانمان پێدراوە ئێوە لە پەروەردگار بترسن و باوەڕ بە پێویستبونی نوێژ بهێنن و بیکەن بە قەڵغان بۆ ڕزگاریتان

و، پەروەردگار کەسێکی ئەوتۆیە ئێوە بۆلای ئەو ئەگرێنەوە لە ڕۆژی دووایدا ئێوە کۆئەکرێنەوە .

﴿ وَهُوَ الـذي خَلَقَ السَماواتِ والأرْضِ بِالْحَقِ ﴾ وە پەروەردەکەری بونەوەران کەسێکی ئەوتۆیە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردوەو ڕای وەستانون بە ڕاستی بە زانستی تەواو .

ووشەی (الحق) ئاماژیە بۆلای ئەوەی ئەم گەردونە چەندین یاسای تایبەتیان هەیە فرمانیان بۆ ئەبا بەڕێوەو چەندین دەستوری هەیە ئەڕۆن لەسەریان، ڕێگە ئەگرن لە تێك چونێکی ئەوتۆ ڕێك نەکەوێ لەگەڵیان بە گوێرەی سروشت، ئەوانەیش بەڵگەن لەسەر بوونی کەسێ بیبا بەڕێوە کاروباریان.

﴿ وَيَوْمَ يَقُولُ كُنْ فَيَكُونُ قَوْلُهُ الْحَقُ ﴾ وەتۆ بیری ئەو ڕۆژە بکەرەوە خوا بیەوێ شتێ دروست بکا ئەفەرموێ: بەو شتە تۆ بە، دوایی ئەو شتە کوتوپڕ پەیدا ئەبێ. مەبەست لەو ڕۆژە ڕۆژی دوایی و ڕۆژی کۆکردنەوەو زیندوکردنەوەی مردوەکانە، ئەو فەرمودەیە کە خوا ئەڵێ بە هەموو شتێ بە، دوای ئەو شتە ئەبێ زۆر ڕاستەو بێگومانەو دێتەدی، ئیتر ئەو فەرمودەیە بۆ دروست کردنی بونەوەرانی پێشەوەبێ، یا بۆ زیندوکردنەوەی بونەوەرانبێ بۆ لەمەوپاش زۆر ڕاست و بێگومانە.

﴿ وَلَهُ الْمُلْكُ يَوْمَ يُنْفَخُ فِي الصُور ﴾ وە بۆ خوایە خاوەنیەتی و پاشایەتی و فەرماندان لە ڕۆژێکا فو ئەکرێ بە سوردا، ئەو ڕۆژەیە ئادەمیزادزیندو ئەکرێنەوەو جگە لە خوا کەس زیندوویان ناکاتەوەو دەستەڵات هەر بۆ ئەوە. فوکردن بە سوردا هێمایە لە زیندووکردنەوەی ئادەمیزاد زانایان لەمەبەست لە سور بیریان جیاوازە: هەندێکیان ئەڵێن: بریتی‌یە لە کەڕنایە لە وێنەی شاخی گاو بەراندا، دووجار فوی پێدا ئەکرێ لەلایەن ئیسرافیلەوە: یەکەم جار هەموو بونەوەران ئەمرن و لەناو ئەچن، دووهەم جار هەموویان زیندو ئەکرێنەوە، ئەو فوکردنە بە سوردا وێنە هێنانەوەیە بۆ ئادەمیزاد و زینوکردنەوە یان

بۆ ڕاوەستانیان و بۆ پرسیار کردن و وولامدانەوەیان بەهۆی دەنگی ئەو شاخەوەو ئامادە باشبن. وێنەی ئامادەباشی سەرباز بەهۆی فوکردن بە کەڕەنای سەربازیدا. یەکەم بۆ لە خەو هەلسان. دووهەم جار بۆ ڕۆیشتن بۆلای دەشتی مەشق و کۆبونەوە، هەندێ لەزانایان ئەلێن: وێنەی ئەو سورەو جۆری فوکردن بەودا هەر خوا ئەیزانێ.

﴿ عالِمُ الْغَيْبِ وَالْشَهادَةِ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ ﴾ خوا ئەزانێ بەو شتانە پەنهانن و لەبەر چاو نین وەك فریشتەکان و جنۆکەو ڕۆژی دوایی و فوکردن بە سورداو بەهەشت و دۆزەخ و، ئەزانێ بەو شتانە ئاشکران و ئەبینرێن، وەك زەویی و ئاسمان و ئەوانەی ئادەمیزاد ئەیان بینن و، خوا بەڕێوەبەری بونەوەرانە و هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ ئاگادارە لە پەنامەکی و دیاری و زیندوکردنەوەی بونەوەران و کاتی کۆکردنەوەیان.

بۆ زانین: بەشکردنی بونەوەران بە دوو بەشن: نهێنی. ئاشکرا. بۆ ئادەمیزاد ڕاستە. بەلام دەربارەی خوای مەزن هیچ شتێ لە خوا پەنهان نیە، هەموو بونەوەران لای خوا ئاشکران.

ئەو ڕستانەی پێشوو بەلگەن لەسەر ئەوەی هەر خوا ئاگاداری لەو شتانە هەیە لە بەرچاونین و ئادەمیزاد هەستیان پێ ناکا، پێویستە ئەو کەسانە ئەلێن: ئێمە ئەیانزانین بۆ خەلتانی نەزان و نەفامەکانە، بۆ بە دەست هێنانی سامان و دارایی، ئەبێ لە خوا بترسن و خۆیان نەکەن بە جێگەی خەشمی خوای مەزن بەبێ دەستوری خواو درۆ نەکەن. لەوانەیە هەندێ لە دۆستانی خوا لەلایەن خواوە فێری هەندێ زانین بە نهێنیەکان بکرێ. ئەوەتا ئیبنو لعەرەبی لە (الفتوحات المكيّه) لە بابی (٣٠٠)دا ئەفەرموێ: (بە ڕاستی بۆ دۆستانی خوایە چەندین چاوێ شتی پێ ئەبینن، چەندین گوێچکە شتی پێ ئەبیستن، چەند دلێ شتی پێ ئەزانن، چەندین زمان گفتوگۆی پێ ئەکەن لە جگە چاوو گوێچکەو دڵ و زمانی ئادەمیزادی تر بەوانە زۆر شت ئەبینن و ئەبیسن و ئەیزانن و گفتوگۆئەکەن و فەرمودەکانیان ڕاستن و ئەی پێکن.

کاتێ خوای ئایینی بت پەرستانی ڕوشان و لەکەداری کردن و خراپەی خواکانیانی ئاشکرا کردو بەڵگەی لە سەردانان بەو فەرمودانەی پێشووی، ڕونیشی ئەکاتە کە ئاینی ئیسلام ئاینی ئیبراهیمە بەبێ جیاوازی. ئادەمیزاد خۆیان بە ئایین و بیروباوەڕو بە باوك و باپیرە خاوەن ڕێزەکانی خۆیانەوە هەڵئەکێشن. کەواتە جێگای سەرسوڕمانە بت پەرستان باوەڕ بە ئاینی ئیسلام نایەرن و خۆیان بە ئیبراهیمەوە هەڵئەکێشن و خۆیان بە نەوەی ئەو ئەزانن، بۆیە خوای مەزن بیری پێغەمەری ئەخاتەوەو ئەفەرموێ:

وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً ۖ إِنِّىٓ أَرَىٰكَ وَقَوْمَكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٧٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُرِىٓ إِبْرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلْمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ رَءَا كَوْكَبًا ۖ قَالَ هَٰذَا رَبِّى ۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلْءَافِلِينَ ﴿٧٦﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَٰذَا رَبِّى ۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِى رَبِّى لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧٧﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَٰذَا رَبِّى هَٰذَآ أَكْبَرُ ۖ فَلَمَّآ أَفَلَتْ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٧٨﴾ إِنِّى وَجَّهْتُ وَجْهِىَ لِلَّذِى فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا ۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٧٩﴾

﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ لأَبِيهِ آزَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَاماً آلِهَةً ﴾ وە تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە: ئیبراهیم بە باوکی خۆی ووت کە ئازەرە: ئایا بۆ ئەو بتانە ئەکەی بە چەندین خوایە بۆخۆت و ئەیان پەرستی لە جگەی خوا؟. تۆ بۆ دانیشتوانی مەکەی ڕون بکەرەوە کە ئێوە خۆتان بە نەوەی ئیبراهیم ئەزانن و بۆ پەیڕەوی ئەو ناکەن کە بە باوکی خۆی ووت: بۆ جگەی خوا ئەپەرستی؟.

﴿ إِنِّي أَرَاكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلالٍ مُبِينٍ ﴾ بە ڕاستی من تۆو تاقمی تۆ لە گومڕایی ئاشکرا دائەبینم. لە ڕوناکی ئەو ئایەتە پیرۆزەوە باسی ئەم شتانەی خوارەوە ئەکەین:

١- ابراهیم کوڕ تاریخ کوڕی ناحور کوڕی شاروخ کوڕی ئەرغو کوڕی فالیغ کوڕی عابیر کوڕی شالیخ کوڕی ئەرفەکشاز کوڕی سام کوڕی نوح، لە عێراقدا لە دایك بووە، شوێنی لە دایك بوونی بڕیاری بێ گومانی بۆ نەدراوەو جێگەی ناکۆکی زانایانە. ناوی ئازەر لەڕیزی باوك و باپیرەکانی ئیبراهیم براوەو وادەرئەکەوێ ئازەر ناز ناوی باوکی ئیبراهیم بێ، ئیبراهیم چاوی کرایەوە لەنێو گەلێدا ئەستێرەو بتیان ئەپەرست، باوکی ئیبراهیم بە ئازەر ناوی دەرکردووەو بە مانا بتەوان و خزمەتکاری بتەکان، دارتاش بوو بتی دروست ئەکردو ئەیفرۆشت، ئیبراهیم بە منالی یاریدەی ئەودا لە فرۆشتنی بتەکاندا. بەلام ئیبراهیم گەورە بوو بۆی ڕون بویەوە کە ئەو بتانە خاوەنی سودو زیان نین، لەگەل باوکی و گەلەکەیدا لەو بارەوە کەوتنە گێرەو کێشەو ناکۆکی، وەك لەو ئایەتەو ئایەتەکانی دوایی باسکراوە. لە (لسان العرب) دا هاتووە: ئازەر بە مانا هەلەکەر، وە بەماناییش هاتوە.

٢- دەرکەوتوی ئایەتەکانی پێشو بەلگەن لەسەر ئەوەی بەدەقاو دەقی خۆی کە ئازەر باوکی ڕاستەقینەی ئیبراهیم بێ و باوکیشی بت پەرستبووە، ئیبراهیم داوای لێ کرد خوای تاك و تەنها بپەرستێ، ناوەڕۆکی ئایەتەکە ئەو بیروبۆچونە ئەخاتە مێشکی زاناو نەزانەوە، پێویستە مرۆڤ لە جێگەی ئەوە خۆی بۆ شتێ تر ماندو نەکا. بەلام زانایان لە نێو خۆیانا بیریان جیاوازە، ئایا ئازەر باوکی ڕاستەقینەی ئیبراهیمە یانە؟ ئەوەیش لەوەوە هاتوە ئایا

باوك و باپیرەكانی پێغەمەری ئیسلام ﴿ ﷺ ﴾ هەموویان خوای تاك و تانهان پەرستوە، جگەی خوا كەسی تریان نەپەرستوە، یا دورستە بێ باوەڕو بت پەرستیان تێداوبێ؟ بەهەر جۆنێ بێ هیچ سودێ لەو ئاژاوەیەدا پەیدا نابێ و درێژە دان بەو باسە كات بە فیرۆئەدا و بێ هودەیە، پەیوەندی بە بیروباوەڕو بنچینەی ئیسلامەوە نیە بە هیچ جۆرێ، ئەوەی پێویستبێ بۆ موسڵمانان ئەمەیە: بڕوایان بە پێغەمەرایەتی و موحەمەدو بێ گوناهی ئەوهەبێ، بزانن گەورەترینی پێغەمەرانەو پاش ئەو پێغەمەری تر نانێررێ.

بەڵام باوەڕ كردن بەوە كە هەموو باو ك و باپیرەكانی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ هەمویان خوا پەرستی تەنها بۆ بن و ئازەرمامی ئیبراهیمەو باوكی ئەونەبوە، ئەوانە بە هیچ جۆرێ پەیوەندیان بە بیرو باوەڕی پاكی ئیسلامەوە نیە، ئێمەش نابێ كاتی خۆمان بەفیڕۆ بدەین.

﴿ وَكَذَالِكَ نُرِى إبراهِيمَ مَلَكُوتَ السَّماواتِ والأرْضِ ﴾ وەهەر بەو جۆرەی بۆ ئیبراهیمان دەرخست گومڕایی گەلەكەیی و خراپەی بت پەرستی ئێمە نیشانی ئیبراهیمی ئەدەین گەورەیی خواو دەستەڵاتی خوا دروست كردنی ئاسمانەكان و زەویی و ئەو شتانەی لەوانان لەكاری سەر سوڕێنەرو پەك خەر هەتا ببن لەسەر بونی خوای تاكو تەنها بە بەڵگەی بێگومان.

﴿ وَلِيَكُونَ مِنَ الْمُؤمِنِينَ ﴾ وە بۆ ئەوە ئیبراهیم ببێ لەو كەسانەی كە بیروباوەڕیان چەسپاوە گەیشتوون بە پلەی بێگومانی خوا ناسین، بۆی دەربكەوێ بت و ئەستێرە پەرستنیان نەگونجاوەو ناچێتە مێشكەوە. ئەو ئایەتە پیرۆزانە بەڵگەی ڕوونن لەسەر ئەمانەی خوارەوە:

١- بەڕاستی ئاینی ئیسلام دانراوە لەسەر ئازادی بیركردنەوەو ئەقڵ كاری، بەزۆرو تۆپزی ناجوڵێتەوە لەگەڵ ئادەمیزاد كە باوەڕبهێنن، خوا باوەڕهێنانی پێویست نەكردووە لەسەریان مەگەر پاش بەڵگە دانان لەسەریان بۆلای بیركردنەوە لەو بەڵگانە.

٢- بەڕاستی ئەو بەڵگانە خوا دایناون لەسە بوونی خواو یەکێتی خوا زۆر سوك و ئاسانن لەسەر مێشکی ئادەمیزادو پێویستیان بە ماندوبون نیە، زانین و تێگەیشتنی زۆریان ناوێ و ئادەمیزاد زانابن یا نەزانبن بەکەمێ شت و تەماشای یاسای دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی بکەن خۆیان فەرمان ئەدەن بەسەر خۆیانا بڕوای بێگومان بهێنن بە دروست کەری تاك و تەنهای بونەوەران.

گەلەکەی ئیبراهیم ئەستێرەکانیان ئەپەرست لەجگەی خوا، ئیبراهیم ویستی سەرنجیان ڕابکێشێ بۆ لای شتێ بچێتە مێشکەوە بەئاسانی. بەنەرم و نیانی چاوەڕوانی ئەکرد.

﴿ فَلَما جَنّ عَلَيهِ الّيْلُ رَأى كَوْكَباً قالَ هذا رَبّي ﴾ دوایی کاتێ تاریکی شەو دای بەسەر ئیبراهیما ئیبراهیم ئەستێرەیەکی بینی لەو ئەستێرانە کە گەلەکەی ئەیان پەرست و ڕوناکی دایەوە، ووتی ئەمەیە: پەروەدەکەری من، بە مەبەستی ئەوەی لاسایی گەلەکەی بکاتەوە، بەو بۆنەوە گەلەکەی دڵیان خۆش بوو ئارامی کەوتە دڵیانەوە. بەڵام مەبەستی ئەوەبوو گفتوگۆکانیان پوچ بکاتەوە، وایان نیشان بدا لەسەر بیرو بۆچونی ئەوانەو یەکەم جار هەڵنەچن، دوایی بەڵگەی بەهێزبدا بەسەر ئاینە پوچەکەیانداو وێنەی پارێزەریکی پسپۆڕو زۆر وریا یەکەم جار سەرنجی بەرانبەری خۆی راکێشێ، دوایی پەلاماری بدا بەبەڵگەی پەك خەرو ئەفەرموێ:

﴿ فَلَما أفَلَ قالَ لا أحِبُ الأفِلِيْنَ ﴾ دوایی کاتێ ئەستێرەکە ئاوابوو ئیبراهیم ئەقڵی گەلەکەی خۆی ئاگادار کردەوە وسرنجی ڕاکێشان ووتی: خۆشم ناوێ ئەو شتانەی ئاوابن و نەبینرێن و سەرلەنوێ هەڵبێنەوە. ئەو جۆرە شتانە هۆی پەیدا بونیانە، هەر شتێ وابێ شایستەی پەرستن وخوایەتی نیە.

﴿ فَلَما رَأى الْقَمَرَ بازِغاً قالَ هذا رَبّي فَلَما أفَلَ قالَ لَئِنْ لَمْ يَهْدِنِي رَبّي لأكُونَنَ مِنَ الْقَوْمِ الضالِينَ ﴾ دوایی کاتێ ئیبراهیم مانگی بینی هەڵهاتو ڕوناکی بڵاو کردبویەوەوگفتوگۆی جاری پێشوی دووبارە کردەوە، ووتی: ئەمەیە پەروەردەکەری من، ڕوناکی زۆرترەو

لەشیشی گەورەترە لەئەستێرەی پێشو، دوایی کاتێ مانگی بینی ئاوابو ووتی: بەڕاستی ئەگەر پەروەردەکەری من ڕانموییی من نەکا بۆلای ڕێگەی ڕاست وخۆیم پێ نەناسێنێ بەراستی من ئەبم بەیەکێ لەو تاقمەی لەڕێگەی ڕاست لایان داوە. ئیبراهیم پاڕایەوە لەخوا ڕزگاری بکا لەسەرگەردانی، ئەوانەی ئەو ئەیبینین دەستیان نەئەدا بۆ خوا پەرستن.

ئیبراهیم بەو ڕستەیە ویستی بەدوریان بخاتەوە کە مانگ بۆپەرستن ناشێ، بە زەقی تورەی نەکردن و نەی ووت:هەر کەسێ مانگ بپەرستێ ڕێگەی لێ ونبوە، نەك گەلەکەی هەلتۆڕێن و گوێی لێ نەگرن بۆ پوچ کردنەوەی پەرستراوەکانیان.

﴿ فَلَما رَأى الشَمْسُ بازغَةً قالَ هذا رَبي هَذا أكْبَرُ ﴾ دوای کاتێ ئیبراهیم خۆری بینی هەلهات ژێری ئاسمان و ڕوی زەوی ڕون کردەوە بە زۆرتر ووتی: ئەمەیە پەروەردەکەری من، ئەمە گەورەترە لەوانەی پێشوو ڕوناکی زۆرترە و قەوارەی گەورەترە.

ووشەی (هذا) و گەڕانەوەی بۆلای ووشەی (الشّمس) کە بە گوێرەی ڕێزمان ئەبوایە: (هذه) ووایە، لەبەر ووشەی (ربی) و (أكبر) ە، بۆیە (هذا) بەکارهاتوە کە بۆ نێرینەیە.

﴿ فَلَما أفَلَتْ قالَ ياقَوْمَ إني بَري مِما تُشْرِكُونَ ﴾ دوایی کاتێ خۆر ئاوابوو ئیبراهیم ووتی: ئەی خزم و گەلی من، بەڕاستی من بێزام لەو شتەی ئێوە ئەیکەن بە هاوبەش بۆخوا.

بەڕاستی تاقی کردنەوەی یەکەم و دووهەم و سێهەم ڕۆیشتن، بەلام گومان هەر ماوەتەوە، کەواتە ئێستا پێویستە بێزاربوون لە پەرستنی ئەستێرەکان، چونکە شایستەی پەرستن نین و شایانی گەورەیی نین، دوای ئەوە ئیبراهیم بەزەقی بێزاربوونی خۆی ڕائەگەیان لە خواکانیان، دواتر بە دلێکی پاکەوە ڕوئەکا بۆلای دروست کەری هەموو بونەوەران ئەلێ:

﴿ إني وَجَهْتُ وَجْهي لِلذي فطر السَماواتِ وَالأَرْضَ حنيفاً ﴾ بەڕاستی من ڕوی دلی خۆم ئەکەم بۆلای کەسێکی ئەوتۆو پەرستن بۆ ئەو ئەکەم دروستی کردوە ئاسمانەکان و زەوی بە هەموو ئەستێرەو بتەکانەوە بەجۆرێ من لائەدەم لە گومڕایی واز ئەهێنم لە ئاینە پوچەکان بۆلای پەرستنی خوا بە تەنها بە ئاینی پاك باوەڕ ئەهێنم.

﴿ وَما انا مِنَ الْمُشرِكِينَ ﴾ وەمن لەو كەسانە نیم هاوبەش بۆ خـوا دائـەنێن، بـاوەڕی بێگومانم هەیە ئەستێرەكان و مانگ و خۆرو ئادەمیزاد شایسـتەی پەرسـتن و ڕێزنـین، هـەر خوای تاك و تەنهاو دروست كەری ئاسمانەكان و زەوی شایانی پەرستنەو بەس.

كاتێ ئیبراهیم بەڵگەی پەك خەری تیژی دانا لەسـەر گەلەكـەی خـۆی كـە گونجاوبـێ لەگەڵ ئەقڵ و سروشتی پاك، بـۆی چەسپاندن پەرسـتنی بتـەكان و ئەسـتێرەكان پوچـن. ئەبوایە ئەو گەلە نەفامە باوەڕیان بهێنایە كەچی دەستیان كرد بە هێنانەوەی بەڵگـەی لاوازو بێ گیان و ئەیان ووت: باوك و باپیرەكانمان ئەوانـەیان پەرسـتوە، ئێمـەیش لاسـایی ئـەوان ئەكەینەوە بۆ پەرستنیان. ئیبراهیم وەڵامی دانەوە، خوا لەو بارەوە ئەفەرموێ:

وَحَآجَّهُۥ قَوْمُهُۥ ۚ قَالَ أَتُحَٰٓجُّوٓنِّى فِى ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنِ ۚ وَلَآ أَخَافُ مَا تُشْرِكُونَ بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّى شَيْـًٔا ۗ وَسِعَ رَبِّى كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ۗ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٨٠﴾ وَكَيْفَ أَخَافُ مَآ أَشْرَكْتُمْ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُم بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا ۚ فَأَىُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِٱلْأَمْنِ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨١﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٨٢﴾ وَتِلْكَ حُجَّتُنَآ ءَاتَيْنَٰهَآ إِبْرَٰهِيمَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ ۚ نَرْفَعُ دَرَجَٰتٍ مَّن نَّشَآءُ ۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿٨٣﴾

﴿ وَحاجَّهُ قَوْمُهُ ﴾ وە خزمەکانی ئیبراهیم دوژمنایەتی ئیبراهیمان کرد بە بەڵگە هێنانەوەی خۆیان بە تایبەتی باوکی، ئەیان ویست بەڵگەی خۆیان پیادە بکەن و زاڵ ببن بەسەر ئیبراهیمدا، ئەیان ترسان لە بتەکانیان کە توشی ئازاری ئەکەن و دەستی لێ ئەوەشێنن ئەگەر واز لەوان نەهێنی.

﴿ قالَ أتُحاجُّوني في اللهِ وَقَدْ هَدانِ ﴾ ئیبراهیم ووتی: دوژمنایەتی من ئەکەن و ئەتانەوێ بەڵگەی خۆتانتانم پێ بسەلمێنن بە بەڵگەی پوچ لە بارەی یەکێتی خواو توانای ئەو، ئەتانەوێ زاڵ ببن بەسەرما بە ڕاستی خوا ڕانموێی کردوم بۆلای یەکێتی خۆی و ناسینی ئایینی خۆی و من بە بەڵگەی پڕو پوچ ئێوە ناخەڵەتێنم.

﴿ وَلا أخافُ ما تُشْرِكُونَ بِهِ ﴾ وەمن ناترسم لە شتێ ئێوە ئەیکەن بە هاوبەش بۆ خوا کە بتەکەتانە، من باکم لەو بتانە نیە، چونکە خاوەنی سوودنین نە بۆ خۆیان و نە بۆ جگەی خۆیان، زیان بەکەس ناگەیەنن، کوێرو گەڕو لاڵ و بێ دەستەلاتن.

﴿ إلاّ أنْ يَشاءَ رَبي شَيْئاً ﴾ مەگەر کە خوای پەروەردەکەری من ئارەزۆی شتی بکا، ئەگەر ئازارم توشببێ لەلایەن پەروەردگاری بنەوەیە نەك لەلایەن ئەو بتانەو ئەو ئەستێرە لاوازانەوە ئەگەر بتێ بکەوێ بەسەرماو بیشکێنێ یا پارچەیە لە ئەستێرەکان بکەوێتە خوارەوە لە ئاسمانەوەو ئاگرم تێبەربدا خوا ئەیکاو بەس.

﴿ وَسِعَ رَبي كُلَّ شَيْءٍ عِلْماً أفَلا تَتَذَكَّرُونَ ﴾ زانینی پەروەردەکەری من چوارلای هەمو شتێکی گرتۆتەوە هەموو شتێ بە زانینی ئەو پەیدا ئەبێ کەواتە من ناترسم ئازارم توشببێ بە جگەی زانین و ویستی خوا، ئایا دوای ئێوە بۆ ئامۆژگاری وەر ناگرن کە خواکانی ئێوە توانای زیان و سودیان نیە، هەرخوایە بەتنها خاوەنی زیان و سودبێ، هەرخوا دروستکەری هەموو بونەوەرانە، خواکانی ئێوە بێ گیان و لاوازن ئێوە بۆچی بیرناکەنەو واز لە پەرستنیان بهێنن.

﴿ وَكَيْفَ أخافُ ما أشْرَكْتُمْ وَلا تَخافُونَ أنَّكُمْ أشْرَكْتُمْ بِاللهِ ﴾ وەمن چۆن ئەترسم لە شتێ ئێوە کردوتانە بە هاوبەش بۆخوا لە بتەکان و ئەستێرەکان و هیچ ئازارێ پەیوەندی بەوانەوە نیە، ئێوە ناترسن کە بەڕاستی ئێوە کردوتانە بە هاوبەش بۆخوا بتەکانتان.

﴿ مالَمْ يُنَزِلْ بِهِ عَلَيْكُمْ سُلْطاناً ﴾ شتێ خوا نەیناردوەتە خوارەوە بەسەر ئێوەدا بۆ ئەو شتە بەڵگەیە بۆ ئەو شتە بە گوێرەی ئاسایی و نائاسایی. زۆر ڕون ئاشکرایە هاوبەش دانان بۆخوا بێ بەڵگەیە. یانێ چۆن من ئەترسم لەو بتە لاوازانەو باوەڕی بێگومانم هەبێ هیچیان تێدا بەستە نی، ئێوەیش، بەڵگەتان نیەو لە خوا ناترسن.

﴿ فأيُ الْفَرِيقَيْنِ أحَقُ بِالأمْنِ إنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ دوایی چ تاقمێ لەو دوو تاقمە شایستەترن بە ئاسایش و نەترسان: تاقمی باوەڕداران بە یەکێتی خوا یا تاقمی هاوبەشدانەران بۆ خوا ئەگەر نەزانن کام تاقمیان شایستە ترن لە ترسان بە خواو نەترسان لە بتەکان. ئەقڵ و زانیاری خۆتان بخەنەکار هەتا ڕاست و پوچتان بۆ دەرکەوێ. خوا بۆ ڕزگاربوون و دیاری کردنی ئەو تاقمە شایستەی نەترسان و ئاسایشە ئەفەرموێ:

﴿ الذيْنَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبَسُوا إيمانَهُمْ بِظُلْمٍ أُولئِكَ لَهُمْ الأمْنُ وَهُمْ يَهْتَدُونَ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆن باوەڕیان بە یەکێتی خوایە بە پاکی و، باوەڕی خۆیانیان تێکەڵاو بەستەم کردن لە خۆیان و هاوبەشدانان بۆ خوا نەکردوە، ئەو کەسانە بۆ ئەوان هەیە ئاسایش و نەترسان لەسزای خواو لە مانەوەیان لە دۆزەخداو پاداشتی چاکەی خۆیان وەرئەگرن و، ئەو کەسانە ڕانومویيان وەرگرتووە ڕێگەی ڕاستیان دۆزیوەتەوە، جگەی ئەو تاقمە لە گومڕایی و یاخی بوندان.

خوای مەزن ڕونی ئەکاتەوە ئەو بەڵگانەی ئیبراهیم باسی کرون و خوا پێ بەخشیوە، هەرخوایش ئەوی شارەزا کردووە بیانزانێ هەتا سەرکەوێ بەسەر گەلەکەی خۆیا، بۆیە خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ وَتِلْكَ حُجَتُنا آتَيْناها إبْراهِيمَ عَلَى قَوْمِهِ ﴾ وەئەو بەڵگانە تێپەڕین لە ئاوا بوونی ئەستێرەو مانگ و خۆر، هەتا کۆتایی ئایەتەکان بەڵگەی ڕونی ئێمەن بەخشیبون بە ئیبراهیم کە بیانکا بە بەڵگە بۆ پەکخستنی گەلەکەیو سەرکەوتن بەسەریاندا.

﴿ نَرْفَعُ دَرَجاتٍ مَنْ نَشاءُ إنَ رَبَكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴾ ئێمە بەرز ئەکەینەوە چەند پلـەو پایـە بۆکەسێ ئێمە ئارەزومان هەبێ لـە زانیاری ژیری و تێگەیشتن. بەڕاستی پەروەردەکەری تـۆ هەموو شتێ لـە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ، هەندێ کەس پلەو پایەی بەرزیان ئەداتێ و بە هەندێ تر پلەی کەمتر، ئەزانێ چ کەسێ شایانی پلەی بەرزەو کامیان شایستە کەمترە.

کاتێ خوای مەزن ئایینی ئیبراهیمی ئاشکرا کردو سەری خست بەسەر دوژمنانی خۆیـا بەهۆی بەڵگەی ڕون و بەهێزەوە، دوایی چاکەی خۆی بەسەر ئیبراهیمەوە ئەژمێرێ بەو پلە بەرزانە بۆی دانرابـوون، گـەورەترین پلـەیش ئەمەیـە پێغەمەرایـەتی لـە خـێزانی ئیـبراهیم دەرناچێ و بەردەوامە هەتا ڕۆژی دووایی، بۆ باس کردنیان خوا ئەفەرموێ:

وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ۚ كُلًّا هَدَيْنَا ۚ وَنُوحًا
هَدَيْنَا مِن قَبْلُ ۖ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ وَأَيُّوبَ
وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٤﴾
وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلْيَاسَ ۖ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٥﴾
وَإِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا ۚ وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى
ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٦﴾ وَمِنْ ءَابَآئِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ وَإِخْوَٰنِهِمْ ۖ وَٱجْتَبَيْنَٰهُمْ
وَإِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا ۚ وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى
ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٦﴾ وَمِنْ ءَابَآئِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ وَإِخْوَٰنِهِمْ ۖ وَٱجْتَبَيْنَٰهُمْ
وَهَدَيْنَٰهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٨٧﴾ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى

بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۚ وَلَوْ أَشْرَكُوا۟ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٨٨﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ۚ فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُوا۟ بِهَا بِكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْ ۗ قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا ۖ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٠﴾

خوای مەزن لەو ئایەتانەدا ناوی (١٨) پێغەمەری بردوە کە یەکێ لەوانە ئیبراهیمە: ناوی باو ك ونەوەو برای هەندێکیان بردوە، باسی هەموویانی کردووە بە چاکەکەرو ئاشتی خوازو ڕانمویی کراو، پێویستی کردوە لەسەریان سوپاسی خوا لەسەر ئەو شتەی بەخشیوێ بەوان لە زانیاری و لە پێغەمەرایەتی و لەسەر ئەوەی ناردویەتە خوارەوە بۆ هەندێکیان نامەی خوا، مەبەستیش ئەمەیە: پێغەمەری ئیسلام بەلگەدانێ لەسەر عەرەبەکان بەوەی کە باپیری ئەوان کە ئیبراهیمە و زۆر تریش لە کوڕو نەوەکانی خوای تاك و تەنهایان پەرستووەو هەرگیز بت پەرست نەبوون. دوبارە مەبەست ئەمەیە: پێغەمەری گەورەمان ئەو پێغەمەرە پێشوانە بکا بەچاو لێ کراوی خۆی بانگ کردن بۆلای ئایینی خواو ئارام گرتن لەسەر ئەو ئازارەی توشی ئەبێ لە ڕێگەی ئاییندا، ئەوەی شایانی باسبێ ناوی ئەو پێغەمەرانە نەبراوە بە گوێرەی پاش و پێشی دروست کردنیان و باسیان کراوە بە گوێرەی وێنە هێنانەوە. نەك بەو مەبەستە پێغەمەران هەر ئەوانەن ناویان براوە، بۆ درێژە دان بەو باسانە خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ وَوَهَبْنا لَهُ إِسْحاقَ وَيَعْقُوبَ وَكُلاً هَدَيْناهُ ﴾ وەئێمە بەخشیومان بە ئیبراهیم ئیسحاقی کوڕی. دایکی ناویی خاتون سارای کچی هاران کوڕی ناحور، خاتوون سارا ئامۆزای ئیبراهیمە و، بەخشیومان بە ئیبراهیم یەعقوبی کوڕی ئیسحاق، کوڕی کوڕ بە کوڕ ئەژمێردرێ لای ئادەمیزادو، ئێمە ڕانموویی هەموو یەکێ لەوانمان کرد بۆلای ئەو شتەی کردبومان بە یاسا بۆیان لە ڕێگەی ڕاست و لە فەرمودەکانی خوا.

﴿ وَنُوحاً هَدَيْناهُ مِنْ قَبْلُ ﴾ وەئێمە ڕانموویی نوحمان کردبوو لە پێش ئیبراهیمەوە. نوح بە زمانی کوردی بەمانا (نەوایە) پاڕانەوە کوڕی لەمك کوڕی مەتوشە لەخ کوڕی ئوخنوخ کوڕی ئەلیارو کوڕی مەهلائیل کوڕی قینان کوڕی ئەنوش کوڕی شیس کوڕی ئادەم.

﴿ وَمِنْ ذُرِيَتِهِ داوُدَ وَسُلَيْمانَ وَأَيُوبَ وَيُوسُفَ ﴾ وە هەندێ کە لە نەوەکانی نوح داوود، ڕاناویی (ذرّيّة)ناچێتەوە بۆلای ئیبراهیم، چونکە لووت و یونس لەنەوەی ئیبراهیم نین و لووت برازای ئیبراهیمە. داوود کوڕی یەسا کوڕی عوبەید کوڕی بوعز کوڕی سەلون کوڕی حەشون کوڕی عەمدیناب کوڕی ئەوام کوڕی حەسرون کوڕی یەهوزا کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم و نەوەکانی نوح سولەیمان و ئەیوب و یوسف، سولەیمان کوڕی داوودە، ئەیوب کوڕی ڕازیخ کوڕی عیسی کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم.یوسف کوڕی یەعقوب کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم.

﴿ وَمُوسى وهارُونَ ﴾ وەهەندێکە لە نەوەکانی نوح موسا و هارون کوڕانی عیمران کوڕی بەسهەر کوڕی فاهیس کوڕی لاوی کوڕی یعقوب کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم، هارون لە تەمەندا لە موسا گەورەترە.

﴿ وَكَذلِكَ نَجْزي الْمُحْسِنينْ ﴾ هەربەو جۆرەی ئێمە پاداشتی ئیبراهیممان دایەوە لەسەر ئارام گرتنی و دانانی خوا بە تاك و تەنها ئێمە پاداشتی هەموو چاکەکەران ئەدەینەوە لەسەر چاکە کردنیان یانێ هەر کەسێ دوای ئەو پێغەمەرانە بکەوێ ئێمە پلەی بەرزیان ئەدەینێ، خوای مەزن پاداشتی هەموو چاکەران ئەداتەوە بە پاداشتی بەرزو بالا، ئیتر پێغەمەربن یا نە.

﴿ وَزَكَرِيا وَيَحْيى ﴾ وەلە نەوەكانی نوح زەكەریا و یەحیا. زەكەریا كوڕی ئزنە كوڕی بەركیا لە نەوەی ڕعیم كوڕی سولەیمان. یەحیا كوڕی زەكەریایە. زەكەریا و یەحیا هەردووكیان كوژراون بەدەستی جولەكەكان. زكەریا دوای كوشتنی یەحیای كوڕی كوژراوە.

﴿ وَعِيسى ﴾ وەلەنەوەی نوحە عیسای كوڕی مەریەم كچی عیمران كوڕی یاش هەم كوڕی ئەمون كوڕی حەرقیا لەنەوەی سولەیمانە، ناوبردنی عیسا بەنەوەو منالّی ئیبراهیم لەگەلّ ئەوەدا عیسا كوڕی كچە، ئەوەمان پیشان ئەدا كە كوڕی كچ بە كوڕی مرۆڤ دائەنرێ و بەكوڕ ئەژمێررێ. كەواتە منالّەكانی فاتیمەی كچی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بە منالّ و كوڕو نەوەی پێغەمەر ئەژمێررێن.

﴿ وَإلْياسَ وَكُلّ مِنْ الصالَحِينَ ﴾ وەهەندێكە لە نەوەی نوح ئیلیاس كوڕی یاسین كوڕی قەنحاس كوڕی عیزرا كوڕی هارون كوڕی عیمران، هەموو یەكێ لەو پێغەمەرانە لەپیاو چاكەكان وپەسەند كراوەكانن وهەر شتێ چاكبێ ئەیكەن، هەر كارێ خراپ بێ نایكەن هەر كەسێ توانای خۆی بخاتە كار بۆ چاكەی ئادەمیزاد پێی ئەوترێ پیاو چاك وچاكەش بەجگەی خۆی فێر دەكات.

﴿ وَإسْماعِيْلَ ﴾ وە هەندێكە لەمنالّەكان و نەوەی نوح ئیسماعیل گەورەترین كوڕی ئیبراهیمە، ئەو كوڕەیە خوا فەرمانی داوە بە ئیبراهیم سەری ببڕێ.

﴿ والَيَسَعَ وَيُونُسَ ﴾ وەهەندێكە لەنەوەی نوح ئەلیەسەع و یونوس. ئەلیەسەع كوڕی خەتوب كوڕی عەجوزە. یونوس كوڕی مەتابە و زانایان جگە لەوە هیچ شتێ تر لەرەگەزی یونوس نازانن، ئەوەی بۆیان دەركەوتوە لەبارەی یونوسەوە كەیەكێكە لەجوەكان، لە قورئان وفەرمودەی پێغەمەردا باسی باوك وباپیری نەكراوە.

﴿ وَلُوطاً وَكُلاً فَضَلْنا عَلَى الْعالَمينَ ﴾ وە هەندێكە لەنەوەكانی نوح لوتی كوڕی هاران كوڕی ئازەرو برازای ئیبراهیمەو باوەڕی بە پێغەمەرایەتی ئیبراهیم هێناوە، كەوتۆتە دوای

ئیبراهیم لەگەشتەکەیدا بۆ میسرو وولاتانی تر، بە خۆشحالّی هەردوو لایان لەیەك جوێ بونەوەو لووت چوو بۆ شاری سەمودو لەوێ نیشتەجێگە بوو، هەموو یەکێ لەو پێغەمەرانە ئێمە ڕێزماندااون بە سەر هەموو بونەوەرانی سەردەمیخۆی وفریشتەو جنۆکەکان.

﴿ وَمِنْ آبائِهُمْ وَذُرتاتِهِمْ وإخوانِهِمْ وَأجْتَبَيْناهُمْ وَهَدَيْناهُمْ إلى صراطٍ مُسْتَقِيمٍ ﴾ وە ئێمە ڕێزی هەندێ لە باوك و منالّ و برایانی ئەو پێغەمەرانەمانداوە بەسەر بونەوەرانی سەردەمی خۆیاناو، ئێمە ئەوانمان هەلّبژاردون و ڕانموییان کردوون بۆلای ڕێگەی ڕاستی ئایینی خوا،

﴿ ذلِكَ هُدى اللهِ يَهْدِي بِهِ مِنْ يَشْاءُ منْ عِبادِهِ ﴾ ئەو ڕێگە ڕاستەو پەیڕەوی کردنی پێغەمەران ڕانمویی کردنی خوایە بەهۆی ئەو ڕانمویی کردنەی خۆی شارزایی کەسێ ئەکا ئارەزۆی بکا لە بەندەکانی خۆی، بۆلای ئایین و بۆلای ئەو شتەی دراوە بە پێغەمەران، دوای ئەو ڕانوموییە ناکەوێ مەگەر کەسێ خوا بە میهرەبانی خۆی یارمەتی بدا.

﴿ وَلَوْ أشرَكُوا لَحَبَطَ عَنْهُمْ ما كانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ وەئەگەر ئەو پێغەمەرانە هاوبەش بۆ خوا دابنێن لەگەلّ ئەو ڕێزو بەرزی پلەیە دراوە بەوان بەڕاستی پوچ بۆتەوە لەوانەوە شتێ ئەیکەن، وەك جگەی خۆیانیا پێ دێ لە نەمانی پاداشتیانا. لەو ئایەتەوە بۆمان دەرئەکەوێ کە خوای مەزن تەماشای ئادەمیزاد ئەکا بەهۆی کردەوەی خۆیانەوە، پلەو پایەو هۆزو ڕەنگ و سامان ناگاتە فریایان، بەو جۆرە تەماشایان ئەکا کۆتایی بە تەمەنیان بێت بە باوەڕەوەو تەماشای کردەوەی پێشویان ناکرێ.

﴿ أولئِكَ الذيْنَ أتيناهُمْ الكِتابَ والْحُكْمَ وَالْنُبُوة ﴾ ئەو تاقمە پێغەمەرانە کە (١٨) پێغەمەرن کەسانێکی ئەوتۆن ئێمە بەخشیومانە بەوان نامەیەکە بەهۆی جبرەئیلەوە بۆیان نێردراوە بە وێنەی نامەکانی ئیبراهیم و تەورات بۆ موسا و زەبور بۆ داوودو ئینجیل بۆ موساو قورئان بۆ موحەمەد.

بەخشیبومان بەوان ناسینی فەرمانەکانی خواو باسای ڕون کردنەوەی فەرمانەکانی خوا لەو شتانە ڕەوان و ئەوانەی قەدەغەکراون، بەوانمان بەخشیبوو پێغەمەرایەتی.

﴿ فَإن يَكْفُرْ بِها هَؤُلاءِ فَقَدْ وَكَلْنا بِها قَوماً لَيْسُوا بِها بِكافِرِينَ ﴾ دوای ئەگەر باوەڕ نەهێنن بەو زانیاری و نامەو بەو پێغەمەرایەتیە بە تایبەتی باوەڕ بە موحەمەد ﴿ ﷺ ﴾ ئەو تاقمە بت پەرستانەی دانیشتوی مەکە، دوایی ئێمە بە ڕاستی ئامادەمان کردوە بۆ باوەڕهێنان و چاودێری کردنی ئایینی ئەو پێغەمەرانە تاقمێ بێ باوەڕنین بەو ئاینەوە بەوانەی باسکران، بە وێنەی کۆچ کەران و یاریدەدانی پێغەمەرو فارس و کوردو تورك و بەربەرو جگەی ئەوانیش.

﴿ أولئِكَ الذينَ هدى اللهُ فَبِهُداهُمْ قْتَدِهْ ﴾ ئەو تاقمە پێغەمەرانە کەسانێکی ئەوتۆن خوا ڕانموبی ئەوانی کردوە بۆ لای ئاینی خۆی.خوا فەرمانی بەپێغەمەر داوە لەسەر ڕێگەو جارڕدانی ئەوان بڕوا بۆلای ئاینی ڕاست وخوا پەرستی وئارام بگرێ لەسەر ئازار، بەو ئەفەرموێ:

دوای تۆ ڕانومایی ئەوان بکەوەو ڕەوشت و بیروباوەڕی ئەوان چاودێری و ڕەچاو بکە.

﴿ قُلْ لا أسْألُكُمْ عَلَيهِ أجْراً إنْ هُوَ إلاّ ذِكْرى لِلْعالَمِينَ ﴾ تۆ بەبێ باوەڕان بلێ: من داوا لە ئێوە ناکەم بۆ گەیاندنی فەرمانی خوا هیچ کرێ و مزەیە، ئەو ڕاگەیاندنەی ناوەڕۆکی قورئانە بە هیچ مەبەستێ نیە مەگەر ئامۆژگاری کردن و بیرکردنەوەیە بۆ بونەوەران. ئەو ڕستەیە بەڵگەی بێگومانە لەسەر ئەوەی موحەمەد پێغەمەرو قورئان نامەی هەموو بونەوەرانە بە ئادەمیزادو جنۆکەو فریشتەوە هەتا ڕۆژی دووایی.

بۆ ئاگاداری: خوای مەزن باسی ئەو پێغەمەرانەی نەکردووە بۆ ناردنیان بە گوێرەی مێژوو کاتێ ناردنیان یەك لە دوای یەك. بەڵکو خوای مەزن باسی کردوون کە ئەو پێغەمەرانە سێ بەشن، وەك ئەمانەی خوارەوە:

١- بەشێکیان خوا فەرمان ڕەوای و پێغەمەرایەتی پێ بەخشیون. وەك داوودو سولەیمان و ئەیوب و یوسف و موساو هارون.

٢- تاقمێکیان خۆگرتنەوەیان و وازهێنانیان لە خۆشی و ڕابواردنی جیهانیان پێ بەخشراوەو دورە پەرێزبوونی لە فەرمان ڕەوایی، وەك زەکەریا و یەحیا و عیسا و ئیلیاس.

٣- کۆمەڵێ تریان نەوەك تاقمەی یەکەمن و وەك تاقمی دووهەمن. بەڵکو خوا ڕێزی داون بەسەر ئادەمیزادی سەردەمی خۆیاناو کردوونی بە پێغەمەر، وەك ئیسماعیل و ئیبل بەسەع و یونوس و لووت.

لەسەردەمی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ کۆمەڵێ هەبوون ئەیان ووت: خوا لە بنچینەدا لەمەوبەر سروش و پەیام لەلایەن خواو بۆ کەس نەهاتوە. ئەیشیان ووت: خوا هەر پێغەمەری نەناردووە خوای مەزن ڕونی کردۆتەوە ئەو کۆمەڵە چ کەسێکن؟ زانایان بۆ دیاری کردنی ئەو کۆمەڵەیە بیریان جیاوازە. بەڵام دارڕشتنی ئایەتەکە وامان پیشان ئەدا ئەو کۆمەڵە بریتی بوون لە هەندێ لە جوەکان. زۆربەی زۆری زانیان ئەو بیروبۆچونەیان پەسەند کردوە، خوا ئەفەرموێ:

وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِذْ قَالُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَىْءٍ ۗ قُلْ مَنْ أَنزَلَ ٱلْكِتَـٰبَ ٱلَّذِى جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ ۖ تَجْعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا ۖ وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوٓا۟ أَنتُمْ وَلَآ ءَابَآؤُكُمْ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِى خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩١﴾ وَهَـٰذَا كِتَـٰبٌ أَنزَلْنَـٰهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَلِتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا ۚ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۖ أَنتُمْ وَلَآ ءَابَآؤُكُمْ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِى خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩١﴾

﴿ وَما قَدَرُو اللهَ حَقَ قَدْرِهِ إذْ قالُوا ما أنْزَلَ اللهُ عَلَى بَشَرٍ مِنْ شيءٍ ﴾ وەئەو کەسانە ڕێزی خۆیان نەگرتووە بە ڕێزگرتنێ شایستەی ڕێزگرتنی خوابێ و نەیان ناسیوە بەو جۆرەی پێویستبێ بناسرێ لەو کاتەدا ئەیان ووت: خوا نەینادۆتە خوارەوە بۆسەر هیچ کەسێ لە ئادەمیزاد لە سروش و لەنامەو پەیام، خوای گەورە ئەو داوایەی ئەوانی پوچ کردەوە فەرموی:

﴿ قُلْ مَنْ أنْزَلَ الكِتابَ الذي جاءَ بِهِ مُوسى نُوراً و هُدىً لِلْنّاسِ ﴾ تۆ بلێ بەوان: چ کەسێ ناردویتە خوارەوە ئەو نامەیەی ئەوتۆ موسا هێناویە بە ڕوناکەرەوەی ڕێگەی تاریك و بێ باوەڕی و بەڕاغویی کەر بۆ هەموو ئادەمیزاد. بە تایبەتی ئەو بت پەرستیە ئەوان فێری بویون لە میسریەکانەوە پەرت و بلاوی کردن.

﴿ تَجْعَلُونَهُ قَراطِيسَ تُبْدُونَها وَتُخفُونَ كَثيْراً ﴾ ئێوە ئەگێڕن ئەو نامەیە بە چەند پەڕەی جیاواز، ئێوە ئاشکرا ئەکەن لەو پەڕانەدا ئەوانەی بتانەوێ بە گوێرەی مەرامی خۆتانبێ و، ئەیشارنەوە زۆر لەو پەڕانە لاتان پەسەند نەبێ و لاتان گرانبن لەناوی پێغەمەری ئیسلام و بەردەبارانی داوێن پیسان.

﴿ وَعُلِمتُمْ مالَمْ تَعْلَمُوا أنْتُمْ وَلا أباؤُكُمْ ﴾ وە ئێوە بەهۆی موحەمەدەوە فێری شتێ کراون نە ئێوەو نەباوکەکانتان ئەو شتانەتان نەزانیوە. یانێ ئێوە چۆن ئەڵێن: خوا نەیناردوە بۆسەر هیچ کەسێ لە ئادەمیزاد هیچ شتێ لە سروش و لەنامە؟ کەچی ئێوە بڕواتان هەیە موسا ئادەمیزادەو تەوراتی بۆ نێرراوە، ئەو شتەی نەخۆتان و نەباوکەکانتان نەتان ئەزانی فێری کردون، لەوانە فێری ناونیشانی موحەمەد پێش ئەوەی بکرێ بە پێغەمەر، بە درێژی و شی‌کراوەی نەتان ئەزانی، کاتێ کە زانیتان مەبەست موحەمەدە تەوراتتان دەست کاری کردو ناونیشانی موحەمەدتان کوژانەوە لە تەوراتا.

﴿ قُلِ اللهُ ﴾ تۆ بڵێ بەوان: ئەو کەسەی نامەی ناردە خوارەوە بۆسەر موسا خوایە. خوا فەرمانی دا بە پێغەمەرو بەو ڕستیە وولامیان بداتە هەتا هەست بکەن بەوە کە ئەو وولامە بێگومانە، چونکە ئەوان بڕوایان وایە خوا ئەو نامەیە ناردوەتە خوارەوە بۆسەر موسا.

﴿ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خوضبهم يَلْعَبُونَ ﴾ لە پاشا تۆ واز لەو جولەکانە بهێنە لەناو کارە پوچەکانی خۆیانا یاری بکەن و گرنگیان پێ مەدە، لەسەر تۆ نیە جگەی ڕاگەیاندنی فەرمانی خواو بێ دەنگ کردنیان.

پرسیار/ بەڕاستی جوەکانی بڕیاری پێغەمەرایەتی موسایان داوە، بڕوایان هەیە تەوراتی بۆ هاتووە، ئەبێ چۆن دراوەتە پاڵیان بڕوانە بون بە سروش و ناردنی پێغەمەران لە بنچینەدا؟

وەلام/ جوەکان ئەکەون بە پشتاو لەو باوەڕهێنان پەشیمان ئەبنەوە ئەڵێن: سروش نەبووە پێغەمەران نەنێراون لەبەر سودو دڵپیسی خۆیان.

زانایان خوو سروشت ناسی ئەم سەردەمە زۆرتریان یا زۆربەیان بڕوایان بەخوا هەیە، چونکە ئەو بونەوەرانە ئەوان لەگەڵیانا خەریکن دێن و دەڕۆن بە گوێرەی یاسایەکی نەگۆڕاو ئاشکرا کە فەرمان دراوە بەو بونەوەرانە لەو یاسایە لانەدەن هەرگیز بە بۆنەی ئەو یاسایانەوە ئەتوانرێ بەراورد بکرێن و سودیان لێ وەربگیرێ، ئەو زانایانە بۆیان ڕون ئەبێتەوە وا پێویست ئەکا جگە لەو بونەوەرانە هێزێکی بالاتر هەبێ بۆنەخشە کێشانی ئەو بونەوەرانە بەو شێوە سەرسوڕێنەرانە هەیانە، ئەو هێزەیش ئەبێ هەر خوابێ و لەڕیزی بونەوەران دەرچێ بەجۆرێ تر ئەو مەبەستەی سەرەوە باس ئەکەین: ئادەمیزاد پێویست نیە لەسەری کاتێ زانیاری پەیدا ئەکا بەبوونی شتێ تاقی بکاتەوە لە کارگای تاقیکردنەوەداو بیداتە بەر تاقیکردنەوە هەتا بە چاوی خۆی ببینێ ئەو شتە هەیە. بەڵکو پێویستە بۆ ئادەمیزاد زانیاری پەیدا بکا بەشتی کە گومان ڕوی تێ نەکا، ئیتر ئەو زانینە بە چاوبێ یا بەهۆی ئەقڵەوە بێ یا بە تاقیکردنەوەبێ، کەسێ خاوەنی بیرو هۆشبێ کاتێ

ووردبویەوە بە جۆرێکی زانستیانەی دور لە گومان پەیدا کردن ئەو ووردبونەوە بە کۆتایی پێ دێی بۆلای زانین بەبونی خوا. بەلاّم زانایانی خوو ڕەوش ناس بڕوایان بەخوا هەیە بەبێ وورد بوونەوەو ئەلّێن: باوەڕبوون بە بوونی خوا پێویستیان بە ناردنی پێغەمەران نیە هەتا بەهۆی نامەو پەیامەو خوا بناسین، بەلایانەوە وایە سروشت هەر خۆی بەتەنها جێگەی نامەو پەیام ئەگرنەوە بۆناسینی خوا بەبێ تەورات و ئینجیل و قورئان و سروش.

من گومانم نیە ئەگەر ئەو زانایانە بۆفێربوون و خوێندنی قورئان ببەخشن کەمێ لەو کاتەی ئەوتۆ بەخشیویانە بۆ فێربون و لێکۆلّینەوەی سروشت بڕوای ڕاستی پەیدا ئەکەن، بۆخوا هەیە دوونامە: گەردون و سروش ئادەمیزاد بەبێ هەردووکیان ناژین، لەنامەی گەردوونەوە دەستەلاّتی خوا ئەزانێ و بڕوای پێ ئەهێنێ، لە نامەی سروشەوە ئەو دەستورەی ئەوتۆی خوا ئەزانێ کە ڕێگەی ژیان و پلەکانی پێش کەوتنی ژیان تێدایە، خۆی لە جێگەی لەناوچون گیرگرفتێ ڕێگەی بەرەو پێش بردنی تێدا ئەبێ ئەپارێزێ.

بەڕاستی ئادەمیزاد دروست کراوە بۆ ئەوەی کار بکا لەم ژیانەدا، پێویستە هەمو کار کەرێ پەیڕەوێکی هەبێ بڕوا لەسەری بۆکارکردنەکەی، چونکە بێ پرۆگرامێ سەرناکێشێ بۆلای چاکە. خوای مەزن ئادەمیزادی دروست کردوەو ئەزانێ بە نهێنی و ئاشکرای، بەهێزو لاوازی، بەشتێ سودی پێ ببەخشێ و بەشتێ زیانی پێ نەگەیەنێ. کەواتە پێویستە هەر خوا یەکەم جێگەی گەڕانەوەبێ بۆ پرۆگرامێکی ئەوتۆ لەسەری بڕوا لە کارکردنیدا. بە وێنەی کەسێ خود ڕەوێ یا فڕۆکەیە دروست بکا پێویستە بۆلای ئەو کەسە بگەڕێنەوە لەبەکارهێنان و سود لێ وەرگرتنی چونکە هەر ئەو ئەزانێ بە چاك کردنی و تێك چوونی. بەبێ گومان گەیاندنی پرۆگرامی خوا بۆ بەندەکانی خۆی و ڕاگەیاندنی هەر بەهۆی پێغەمەرانەوە ئەبێ، چونکە ئەوان زمانی خواو ڕون کردنەوەی زمانی خوان، هەر ئەویشە سروشی خواو نامەو پەیامی خوا، بۆیە خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَهذا كِتابٌ أنْزَلْناهُ مُبارَكٌ مُصَدِقُ الذي بَيْنَ يَدِيهِ ﴾ وە ئەو قورئانە نامەیەکە ئێمە ناردومانەتە خوارەوە خاوەن سودو پیرۆزە بەڕاست ئەگێڕێ شتێکی ئەوتۆ لە پێش قورئانەو هاتوەتە خوارەوە، وەك تەوارت و ئینجیل و جگەی ئەوانیش. یانێ هەروەك ئێمە تەوراتمان ناردوە بۆسەر موسا، هەروایش قورئانمان ناردوە بۆسەر موحەمەد ﴿ ﷺ ﴾ پیرۆزو بەسودە بۆ کەسانێ زانابێ بە فەرمانەکانی قورئان و شاراوەکانی و کاریان پێ بکا، ئەو قورئانانە نامەی پێشوەکانبەڕاست ئەگێڕێ.

﴿ وَلِتُنْذِرَ اُمَ الْقُرى وَمَنْ حَوْلَها ﴾ وەبۆئەوە تۆ بترسێنێ بەو قورئانە دانیشتوانی مەکە کە وەك دایکە بۆ دانیشتوانی هەموو دێهاتەکانی ترو بترسێنێ دانیشتوانی کەسێ لەملاولای مەکەن و بترسێنێ دانیشتوانی ڕوی زەوی بە گشتی. مەکە ناوبراوە بە دایکی دێیەکان، چونکە لە مەکەدایە خانویەك بۆ پەرستی خوا دروست کرابێ. گەشتیارەکانی ڕۆژهەلاّت و جوەکان لە پێش ئەوانەوە ئەو ئایەتە ئەکەن بە بەلگە بۆ گومانی خراپی خۆیان گۆیا موحەمەد ﴿ ﷺ ﴾ تەنها بۆعەرەب نێردراوە. بەلاّم خۆیان کوێر کردووە لە ئاستی ئایەتی (٢٨)ی سورەتی سەبەء کە ئەفەرموێ ﴿ وَما أرْسَلْناكَ إلاّ بَشيراً وَنَذِيْراً وَلكِنِ أكْثَر الناسِ لا يَعْلَمُونَ ﴾ وەئێمە تۆمان ڕوانە کردوە مەگەر بۆلای ئادەمیزاد هەموویان موژدەدەری و ترسێنەری بۆ هەمو ئادەمیزاد و، بەلاّم زۆرتر لە ئادەمیزاد نازانن بەو ڕاستیە و خۆیان گێل ئەکەن. دووبارە لە ئاستی ئایەتی (١٠٨) ی سورەتی (ئەلئەنبیاء) ئەفەرموێ ﴿ وما أرسلناك إلاّ رحمة للعالمين﴾ وەئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە مەگەر تۆ میهرەبان و چاکەی بۆ هەموو بونەوەران. ئەبێ ئەو دوژمنانەی ئیسلام بزانن سەرچاوەی قورئان هەریەکەو فەرمودەی خوا هەندێکیان مانای هەندێ تریان ئەکەن ئەو دوو ئایەتانە مانای ئەم ئایەتەی ئێرە ئەکەن. مەبەست لە ئایەتی ئەم سورەتە ئەمەیە ئایینی ئیسلام لە مەکەوە یەکەم جار دەستی پێ کراوە کە جێگەی دانیشتنی پێغەمەرە دوایی نەختە نەختە پەرەی سەندوە، پەیڕەوی کراوەو یارمەتی دەری زۆربووەو بە هەموو ولاّتانیان ناساندوە، هەموو

بیروباوەڕی تریش وایە بۆ یەکەم جار لە جێگەیە ئەبێ وبە شوێنانی تردا بلاو ئەبێتەو، ئەوانە لە لایەکەوە لەلایەکی ترەوە بە بەڵگەی ڕون و مێژوی بێگومان دەرکەوتووە بەهۆی هەواڵێکی بڕوا پێ کراوەوە کە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ نامەی نوسی بۆ هەموو پاشاو سەرۆکەکانی ئەو سەردەمەی لەنزیك خۆیەوە بانگی کردن بۆلای ئاینی ئیسلام، لە سەرو هەمویانەوە کیسرا پاشای فارس و قەیسەری پاشای ڕۆم، ڕۆژهەلات ناسەکان ئەو شتانە بە چاکی ئەزانن و ئایان شارنەوە خۆیانی لێ گێل ئەکەن.

﴿ الَّذِيْنَ يُؤْمِنُونَ بِالْأخِرَةِ يُؤْمِنُونَ بِهِ ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆ باوەڕ ئەهێنن بە ڕۆژی دوایی باوەڕ ئەهێنن بە قورئان، چونکە باوەڕ بە ڕۆژی دوایی ئەبێتە ترسی سزای خوا، ترسان لە سزادان ئەبێتە هۆی بیرکردنەوە. کەواتە بۆی دەرئەکەوێ ڕزگاربوون بەهۆی قورئان و پێغەمەرەوەیە.

بۆ زانین: هەرکەسێ قورئان بخوێنێتەوە بەبێ لایەنی و بە باوەڕی پاکەوە ئەگەر ئەو کەسە باوەڕداربێ باوەڕەکەی زۆرتر ئەبێ و بەتین تر ئەبێ بە خواو بە پێغەمەرو بە ڕۆژی دوای ئەگەر هەر تەنها باوەڕی بەخوا هەبێ باوەڕ بە پەیام ئەهێنێ و بە زیندوبونەوەیش باوەڕ ئەهێنێ، ئەگەر باوەڕی بە خواو بە زیندوبونەوە هەبێ باوەڕ بە پێغەمەران و بە نامە پیرۆزەکان ئەهێنێ. بە تایبەتی قورئان و پێغەمەرایەتی موحەمەد ﴿ ﷺ ﴾، چونکە قورئان بەڵگە بۆ باوەڕهێنان دائەنێ لەسەر ئەو کەسانە بیرئەکەنەوەو هانیان ئەدا بۆ ووردبوونەوە لەسەر توانای بێ وێنەی خواو ئەو شتانەی پاڵئەنێن بە خاوەنەکانیانەوە بۆلای ناسینی باوەڕ بە خواو بە ئایینی خوا.

﴿ وَهُمْ عَلَى صَلاتِهِمْ يُحافِظُونَ ﴾ وەئەو کەسانە باوەڕ ئەهێنن بە خواو بە قورئان بەردەوامن لەسەر نوێژەکانیان لە کاتی دیاری کراوی خۆیانا، بۆ ئەوەی هەموو کاتێ پەیوەندیان بە خواوە نەبچڕێ، چونکە نوێژ کۆڵەکەی ئاینەو هۆی جێگیربوونی باوەڕەو قەدەغەکەری ئادەمیزادە لە داوێن پیسی و کارە بێزلێ کراوەکان.

ڕەحمانی ئەلیە مامە. ئەسودەی ئەلعەنسی. سەجاعی ژنی موسە یلەمەی درۆزن: ئەو کەسانە هەموویان خۆیانیان دانا بە پێغەمەرە درۆینە، بە بوختان بلاویان ئەکردەوە کە پەیامیان بۆ دێ، خوای مەزن بەدرۆی خستنەوەو ئەفەرموێ:

وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ قَالَ أُوحِيَ إِلَيَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَيْءٌ وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَا أَنزَلَ اللَّهُ ۗ وَلَوْ تَرَىٰ إِذِ الظَّالِمُونَ فِي غَمَرَاتِ الْمَوْتِ وَالْمَلَائِكَةُ بَاسِطُو أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوا أَنفُسَكُمُ ۖ الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ غَيْرَ الْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ آيَاتِهِ تَسْتَكْبِرُونَ ﴿٩٣﴾ وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَىٰ كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَاكُمْ وَرَاءَ ظُهُورِكُمْ ۖ وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمْ شُفَعَاءَكُمُ الَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَاءُ ۚ لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٩٤﴾

﴿ وَمَنْ أظْلَمَ مِمَنْ أفْترى عَلَى الله كذبا ﴾ وەچ کەسێکە ستەمکارتر لە کەسێ درۆبکا بەدرۆکردنی زۆر ناشایستەو بیدا بەسەر خوادا بەبێ سەرچاوەیە لەلایەن خواو بۆی هاتبێ، بەوێنەی لوحاو پەیڕەوەکانی یامالیکی کوڕی یوسف، شتێ بلێن دژی لێکدانەوەی ئەقلێ

و بە هەوەسی خۆی قەدەغە کراوەکان بگێڕێ بەڕواو کارە ڕەواکان قەدەغە بکا و هاوبەش بۆ خوادابنێ، بە درۆ خۆی بکا بە پێغەمەر.

﴿ أوْقالَ أوحِيَ إلي وَلَمْ يُوحَ إلَيْهِ ﴾ یا بڵێ: سروش هاتوە بۆلای من و سرو ش نەهاتوە بۆلای بە وێنەی موسەیلەی زۆر درۆزن.

موحەممەدەی کوڕی ئەحمەدی ئەلئەنساری ئەلقورتوبی لە باسی مانای ئەو ئایەتەدا ئەفەرموێ:لەوێنەی ئەو کەسانەیە خۆیانیان کردووە بە پێغەمەری درۆینە ئەو کەسانەیش واز لە یاسای ئیسلام و فەرمودەکانی پێغەمەر و ئەوکارانەی پیاوچاکەکانی پێشوو لەسەر بوون بهێنێ، ئەو کەسانە بەبێ بەڵگە بڵێن: کەوتوەتە دڵمانە ئەو شتە ئاوابێ یا بڵێ: دڵم هەواڵی دامێ ئەو کارە بەو جۆرە بووە، ئەو کەسانە فەرمان دەرئەکەن بەهۆی ئەو شتانە کەوتوەتە دڵیان گوایە لەبەر پاك بونیانە لە چڵك و چەپەڵی و دوربونیان لە بێگانەو وائەزانن ئەو شتانە زانیاری و ڕاستی خوان، ئاگاداری هەموو نهێنیەکانن و یەك بە یەك ڕوداوی بونەوەران ئەزانن. بۆیە پێویستیان بە فەرمانی یاسا گشتییەکانی خوا نەماوە ئەڵێن: ئەو یاسایانە بە گشتی دەستورن بۆ ئادەمیزادە گێلەکان و زوربەی ئادەمیزاد. بەڵام دۆستانی خواو خاوەن کردارە تایبەتییەکانپێویستیان بە دەقی یاسا خواوە نەماوە، بەڵگەیان لەسەر ئەو گفتوگۆپوچانە ڕوداوی نێوان موساو خزرە، خزر بە هۆی ئەو شتەوە بۆی ئاشکرابوو بۆیە پێویستی بەزانیاریەکانی ترنەما.

ئەو گفتوگۆیانە بێ ئاینی و بێ باوەڕین، خاوەنی ئەو گفتوگۆیانە بەبێ داواکردنی پەشیمان بونەوەیان ئەبێ بکوژرێن، چونکە لەگەڵ ئەو کردەوە خراپەدا پێویست بە پرسیارو وولام نامێنێ، چونکە لەو کەسانەوە نەمانی فەرمانەکانی خواو ناردنی جگەی پێغەمەری ئیسلام ڕوئەدا، لە باسی ماناکردنی ئایەتی (٨٢)ی سورەتی (ئەلکەهف) ئەو باسەی سەرەوە دووپات ئەکرێتەوە.

﴿ وَمَنْ قالَ سَأُنْزِلُ مِثْلَ ما أَنْزَلَ اللهُ ﴾ وەچ کەسێکە ستەمکارتر لەو کەسە بڵێ: من لەمەو دوا وێنەی شتێ خوا ناردویەتە خوارەوەو ئەی نێرمە خوارەوە. زانایان ئەڵێن: هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ڕستەیە ئەوەبوو: عەبدوڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی سەرح نوسەری پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾، لە ڕوداوێکی هاتنەخوارەوەی قورئاندا ووتی: من ئەتوانم وێنەی قورئان بنێرمە خوارەوەو لە ئایین وەرگەڕاو دوای پەشیمان بویەوە، هەندێ لە زانایان ئەڵێن: لە بارەی نەزری کوڕی حارسەوە هاتوەتە خوارەوە کە ووتی: من وێنەی ئەو قورئانە دائەنێم، هۆی هاتنە خوارەوەی هەر شتێ بێ گرنگ نیە. بەڵام ئەوەی پێویست بێ بۆ ئێمە ئەبێ ئێمە بڕوامان وابێ ئەو گفتوگۆیە بێژراوە ڕوی داوە.

﴿ وَلَوْ تَرى إِذِ الظّالِمونَ في غَمَراتِ الْمَوتِ والْمَلائِكَةُ باسِطُو أَيْدِيهِمْ ﴾ وەئەگەر تۆ ئەو ستەمکارانە ببینی کاتێ هاتەخوارەوەو مردنیان لە کاتی بێهۆشی مردندا کارێکی زۆر سامناك ئەبینی توشیان ئەبێ‌و، فریشتەکان دەستی خۆیان درێژ ئەکەن بۆ سزادانیان، بۆ وەرگرتنی گیانیان و بە چەکوشی ئاسن سزایان ئەدەن. مەبەست لە دەست درێژی کردنی ئەو فریشتانە درێژکردنی دەستی ڕاستەقینەبێ بۆلای ئادەمیزاد لەکاتی سامناکی سەرەمەرگدا، یا بۆ ئەوەبێ وێنەدانرێ لەسەر ئازاری مردنیان هەر کامیانبێ لەمەبەستەکە ناگۆڕێ، چونکە بە گوێرەی ئەقڵ و بوونی فریشتەو درێژکردنی دەستیان خاوەنی زمانێ قەدەغە نیە، سەرەڕای ئەوەیش سروش بڕیاری بوونی داون و پێویستە ئێمەش بڕوامان بەوانە هەبێ.

﴿ أَخْرِجُوا أَنْفُسَكُمْ ﴾ فریشتەکان بە ستەمکاران ئەڵێن: ئێوە گیانی خۆتان بهێننە دەرەوە لە لەشەکانتان و بیاندەن بەدەستی ئێمەوە، یا ئێوە گیان لە لەشی خۆتان و خۆتان لە سزادان ڕزگار بکەن ئەگەر ئەتوانن، زۆر ئاشکرایە ناتوانن. بەڵام بە پلارەوە داوای ئەوەیان لێ ئەکەن.

﴿ الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذابَ الْهُونِ بِما كُنْتُمْ تُقُولُونَ عَلَى اللهِ غَيْرَ الْحَقِ وكُنْتُمْ عَنْ آياتِهِ تَسْتَبْكِرُونَ ﴾ ئەمرۆ کە ڕۆژی مردنتانە ئێوە پاداشتتان ئەدرێتەوە بە سزایەکی ئابڕوبەرتان و سەخت هەتا ڕۆژی دوایی بەهۆی شتێکەوە ئێوە ئەتان ووت و ئەتاندا بەسەر خوادا جگەی ڕاستی، وەك هاوبەش دانان بۆ خواو خۆکردنتان بە پێغەمەری درۆینەو ئەتان ووت: خوا پەیام و سروشی نەناردوەتە خوارەوەو، ئێوە لە بەرانبەرو ئاستی ئایەتەکانی قورئان داوای گەورەیتان ئەکرد باوەڕتان پێ نەهێنان و لەوان بیرتان نەئەکردەوە.

﴿ وَلَقَدْ جِئْتُمونا فُرادى كَمَا خَلَقْناكُمْ أوَلَ مَرَةٍ ﴾ وە بەڕاستی ئێوە هاتوون بۆلای ئێمە بۆ وەرگرتنی پاداشت و وولاّم و پرسیار بە تەنها نە دارایی و نە خێزان و نە منالّ و نە خزمەتکارو نە یاریدەرتان لەگەلّدانیە، بە ڕوتی و پێ خاوس، ئێوە لە جیهاندا بەو شتانەوە خۆتان هەلّکێشاوە ئێوە هاتن بۆلای ئێمە بە وێنەی شتێ ئێوەمان دروست کرد بۆ یەکەم جاری لەدایك بونتان هیچ شتێکتان نەئەزانی و بێ دارایی و بەروت و قوتی هاتنە جیهانەوە.

هەرچەندە زانایان بیریان جیاوازە لەبارەی کۆکردنەوەی ئادەمیزاد لەو ڕۆژەدا ئایا بە گیانی تەنهایە یا بە گییان و لەش بەیەکەوە. بەلاّم ڕستەی (كَما خَلَقْنا أوَلَ مَرَةٍ) بەلّگەی سەلّێنراوە لەسەر ئەوەی ئەو کۆبونەوەیە بە لەش و بە گیانە. نەك بە گیانی تەنها.

﴿ وَتَرَكْتُمْ ما خَوَلْناكُمْ وَراءِ ظُهُورِكُمْ ﴾ وەئێوە جێتان هێشت شتێ بەخشیبومان بە ئێوە لە جیهاندا لە دوای خۆتانە لە دارایی و سامان و منالّ و نەتان خستە پێش خۆتان و لەگەلّ خۆتانا نەتان هێنان و گەڕانەوە بۆلا زەوی و خرانە گۆڕەوە بە ڕووتی، بەجێتان هێشتن بۆ ئەو کەسانەی لە پاش ئێوە ماونەتەوە، سودو زیانی بۆ ئەوانە نەك بۆ ئێوە.

﴿ وَما نُرى مَعَكُمْ شُفعاءَكُمْ الذيْنَ زَعَمْتُمْ أنَهُمْ فِيكُمْ شُرَكاءِ ﴾ وەئێمە نابینین لەگەلّ ئێوە تکاکارەکانی ئەوتۆی ئێوە گومانتان ئەبرد بەڕاستی ئەوانە لەنێو ئێوەدابوون هاوبەشی ئێمەن و بۆتان ئەپاڕێنەوە، ئەو بتانە سودیان بە ئێوە نەبەخشی.

﴿ لَقَدْ تَقَطَّعَ بَيْنِكُمْ وَضَلَّ عَنْكُمْ ما كُنْتُمْ تَزْعُمُونَ ﴾ بەڕاستی بچڕا پەیوەندی لە نێوان ئێوەو ئەوان کەلە جیهاندا بەیەکتانەوە هەبوو لە خێزان و خزم و دۆست و دارایی و بتەکانتان و، وونبو لە ئێوە شتێ گومانتان وابو بۆتان ئەپارێنەوەو واتان ئەزانی زیندووبونەوەو پاداشت نییە.

دوای ئەو شتانە ڕابوردن خوای مەزن بۆجارێ تر بەڵگە لەسەر بت پەرستان دائەنێ بە هەندێ لەو شتانە جێگەی سەرسوڕمانن لە دروست کراوەکانی خۆی کە چۆن ئەیانبا بە ڕێگەوە چۆن هەڵیان ئەسوڕێنێ و پەروەردەیان ئەکا بە ئەوپەڕی بێ وێنەوە.

إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلْحَبِّ وَٱلنَّوَىٰ ۖ يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَمُخْرِجُ ٱلْمَيِّتِ مِنَ ٱلْحَىِّ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٩٥﴾ فَالِقُ ٱلْإِصْبَاحِ وَجَعَلَ ٱلَّيْلَ سَكَنًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ حُسْبَانًا ۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿٩٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهْتَدُوا۟ بِهَا فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۗ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْـَٔايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٩٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ ۗ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْـَٔايَٰتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ ﴿٩٨﴾ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَىْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا وَمِنَ ٱلنَّخْلِ مِن طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ وَجَنَّٰتٍ مِّنْ أَعْنَابٍ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُشْتَبِهًا

وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ۗ انظُرُوٓا۟ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ وَيَنْعِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكُمْ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٩٩﴾

﴿ إن الله خالِقُ الحَبِ والنوى ﴾ بەڕاستی خوا ئەقلیشێنێ دانەوێڵەیەکی بێ گیان و ووشك و گیای لێ ئەڕوێنێ، وێنەی گەنم و پاقلەو جگەی ئەوانیش و، درز ئەکاتە ناوکێکی ڕەق و ووشك و بێ گیان لێی دەرئەهێنێ وێنە درەخت، وەك خورماو ترێ و قۆخ و پرتەقاڵ و جگەی ئەوانیش. یانێ کاتێ دانەوێڵەو ناوك بخرێنە نێو زەوی ئەو دانەوێڵەو ناوکەیە لەسەرەوە لە خوارەوە درز ئەبەن، بەشەکەی سەرەوەیان بەرەژۆر لق و پۆپ و گەڵایان لێ پەیدا ئەبێ، بەشی ژێرەوەیان بەرەوخوار ئەڕوا ڕەگ و ڕیشەی لێ پەیدا ئەبێ و خۆیان ئەچەقێنن بە زەویدا و دانەوێڵە و ناوك نامێنن و ئەبن بەلەشێکی گەورەو خۆیان لەناوئەچن، هەندێکیان بەرەو ئاسمان یا بەسەر زەویدا خۆیان پەخش ئەکەن و ئەو بەشەکەی تریان ئەڕوا بە زەویدا، گومانی تێدا نیە ئەو کردارانە هەرچەندە بە ڕووالەت پەیوەندی دارن بە هۆی سروشتی ئاوو خاکە ئەیخۆن بەهۆی خۆرەوە گشە ئەکەن. بەلام لەناوەرۆکا دروست کەری هۆیەکە هەر خوایەو بە ڕستەی (ببەو دوایی ئەبێ).

﴿ يَخرِجُ الْحتى مِنَ الْمَيتِ ﴾ خوا دەرئەهێنێ زیندو لە مردو. یانێ ئادەمیزادو باڵندە دەرئەهێنێ لە تۆوێك و هێلکەی مردوی بێ گیان، درەختی خورماو قۆخ و بەڕو گەشەیان پێ ئەکاو دەریان ئەهێنێ و گیای سەوز لە تۆوی ووشك دەرئەهێنێ، ئەوانەو جگەی ئەوانیش.

بۆ زانین: هەموو گیانداران و گژوگیا دێنە دەرەوە لە مایەو ماکێکی زیندوو. بەلام مەبەست لە مردنەکەی ئەمەیە: بە ڕوالەت نیشانەی گیانیان تێدا نیيە لە جولان و گەشەو جگەی ئەوان کە نیشانەی گیانن. کەواتە گیان و زیندەی لەو ناشاراوەتەوە. بەلام بێ جولەن وێنەی مردوان.

﴿ وَمُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيّ ذَٰلِكُمُ اللهُ فَأَنّى تُؤْفَكُونَ ﴾ وەخـوا دەرهێنـەری مـردوو لـە زیندوە، وەك هێلكە لـە مریشـك و تـۆو لـە گژوگییـای تـەڕو ئـاو لـە ئـادەمیزاد. ئـەو زیندوكردن و مردنە خوایە ئەیكا هەر ئەو شایستەی پەرستنە و هەر ئەو توانای ئەو شتانەی هەیە، دوایی ئێوە چۆن وەرئەگێڕین لە پەرستنی خوا بـۆلای جگـەی خـواو هاوبەشـی بـۆ دائەنێن بەشتێ خاوەنی هیچ شتێ نیە، چۆن باوەڕ بە خوا نایەرن لەگەڵ ئەو بەڵگانە لەسەر ئەوە دانراوە هەر خوا دروست كەری هەمو بونەوەرانە. جێگەی سەرسوڕمان نییە شـتێكی زیندووی تر پەیدا ببێ، یا بێ گیانی لە بێ گیانێ تر جوێ ببێتەوە. بـەڵام ئـەوەی جێگـەی سەرسوڕمانە ئەمەیە: كە گیانداریێ لە بێ گیانێ، یا بێ گیانێ لە گیانداریێ پەیدا بـبن. وەك خوای مەزن لەو ڕستانەی ڕابوردودا باسی فەرموون.

پرسیار/ ئەگەر كەسێ پرسیار بكاو بڵێ: زیندوكردن و سزادان پەیدا ئەبـەن بـە هـۆی سروشتەوە؟

وەڵام/ ئێمەیش پرسیار ئەكەین لەو كەسـە چ كەسـێ سروشـت و هـێزی سروشـت و پاڵەپەستۆی (التفـاعل) هێناویەتـە بوونـەوە، ئەگـەر لـەیـەكدان و پاڵەپەسـتۆ بـبن بـەهۆی پەیداكردنی زیندویەتی بەبێ یارمەتی خـوا، بۆچـی زانایـانی سروشـت كـۆڵ و دامـاون و ناتوانن زیندەی لە كارگاكانیـاندا دروسـت بكـەن؟ وێنـەی ئـامێری چێشـتخانە و ئـەقڵی ئەلەكترۆنی و كۆمپیوتـەرو جگـەی ئـەوانیش لەگـەڵ ئەوەیشـدا ئەوپـەڕی هـەوڵیانداوە، هەزاران پاڵەپەستۆو لەیەكدانیان بۆ سازاندوە، لـەدواییدا سـەر شـۆڕبوون و پـڕ بـەدەمی خۆیان بڕیانداو وتیان: دروست كردنی زیندەی زۆر گرانترە لەوەی ئادەمیزاد بگەڕێنـەوە بۆلای منالی، بێگومان هەردوولایان ناگونجێ و ناكرێن.

ئەگەر بسەلمێنین زانایان ئەتوانن (خلیە) كی زیندوو دروست بكـەن ئایـا بۆیـان جـوت ئەبێ گیانەوەرێ دروسـت بكـەن و بكەوێتـە ئیـش كـردن بـە وێنـەی بـێ دەسـتەڵاترینی جانەوەران؟ زۆر ڕون ئاشكرایە بۆیان جوت نابـێ. بـا ئێمـە واز لـە ئـادەمیزادو مێشـكی

ئادەمیزادو گییاندارانی ترو سەر سورێنەرانی دروست کراوانی تر بهێنین و، ئێمە چەندین وێنە لێ بدەین لەبۆ چەندین جانەوەرو خشۆکی سەرزەوی کە ئێمە هەڵدێین و ڕائەکەین لەبەردەمیاناو ناتوانین خۆمان ڕاگرین بۆ ئازاردانیان بۆ لەناوبردنیان، پەلاماری گازو دەرمانی تر ئەدەین بۆ قەلاچۆکردنیان.

زانایان و پسپۆڕانی ئاگادار بە فێرکردن و وانەدانان بۆشیکردنەوەی ژیانی جانەوەران ئەڵێن: بەڕاستی جانەوەرێ هەن ئەژین لەژێر پەنجا پلەی ژێر سفرو هەیانە لەژور پەنجا پلەی سەر سفرەوە ئەژین، هەیشیانە لەنێو هەوای ژەهراویدا ئەژین.

هەیانە لەنێو بیری نەوتا ئەژین، هەموویان بە جۆرێکی ڕێك و پێك ئەژین و كاری خۆیان بەڕێوە ئەبەن چ کەسێ بێ جگەی خوا ئەوە هێزە بەرزەی داوە بەو جانەوەرانە کە ئادەمیزاد ناتوانن بەو شێوەیە بژین؟.

ئادەمیزاد هەرچەندە دروست ئەکەن مانگی دەست کردو ئەقڵی ئەلەکترۆنی و کۆمپیوتەر لە کانگاکانیانا. بەڵام ناتوانن باڵە مێشولەیە دروست بکەن. کەواتە کە توانا دروست کردنی باڵە مێشولەیەکیان نەبێ چاکتر ناتوانن مێرولە یا مێشهەنگێ دروست بکەن.ئەو شتانە هەموویان زۆر ڕون و ئاشکران.بەڵام نەگبەتی گەورە ئەمەیە: خۆمانمان لەبیرچۆتەوە بەراوردی خۆمان ناکەین لەگەڵ ئەو هەموو توانای بێ وێنەی خوادا کە هەموو شتێکی لە شوێنی شیاوی خۆیا دائەنێ، ئەگەر ئەو بەراوردە بکەین باوڕمان زۆرترو توندتر ئەبێ. بۆمان دەرئەکەوێ چ کەسێ لە هەموو کەس بە توانا و گەورەترە. بێگومان ئەو کەسە ئەبێ هەر خوابێ، لە هەموو شتێ پێویستر بۆ ئێمە باوەڕهێنانە بە خوا، ئەوەیش بە ئەقڵ ئەزانرێ ئەگەر بخرێتە کارەوە، بڕوا بەبێ ئەقڵ وێنەی ئەوەیە ڕوی مرۆڤ دووچاوەکەی لەگەڵ نەبێ بۆ بینین.

زۆر ڕاستە ئێمە پێویستمان بەباوەڕهێنان بە پێغەمەر هەیە و هیوامان وایە خوا باوەڕمان پێ ئەبەخشێ، بۆ ئەوەی ئەو شتەی زانایان بۆی داماون و نایزانن ئێمە بیانزانین، ئەو زانایانە دەریان بڕیوە ئەقڵیان کۆڵە لە ئاستی زیندەیی بە هۆی سروشتەوەو ئەڵێن:

سروشت توانای پەیداکردنی زیندەی نیە، بۆیە زوربەی زانایان و پسپۆرانی سروشت پەنایان بردووە بۆلای جگەی سروشت، پەلامار بدەن بۆلای توانایە هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ بە زانینەوە هەتا بنچینەی زیندە لەو شتەوە دەرچێ ئەوەیش ئەبێ هەر خوابێ بە تەنها.

زانای بەناوبانگ (ئێنیشتین) ئەڵێ: بەڕاستی ڕوون بوەتەوە زانینی دڵی ئایینی ئێمە هەر ئەو سەرچاوەیە ڕوی ئێمە کا بۆلای زانینی کردەوەی دڵمان. مامۆستا ( تەوفیق حەکیم) لەنامەی خۆیا (فن الأدب) پەراوێزێکی نوسیوە ئەڵێ: بڕیاردانی ئەو زانایە بێگومان کارکردنێکە بۆ نرخی ئایین. چەند خولێ لەمەوبەر ڕۆیشتوە هیچ کەسێ داینەنا بۆ زانایان لەبارەی ئایینەوە گفتوگۆی وا بکەن، مامۆستا (موحەمەد جەواد موغنیە) لە تەفسیرەکەی خۆیا (الكاشف) پەراوێزی نوسیوە لەسەر فەرمودەی تەوفیق حەکیم ئەڵێ بڕیاردانی زانایانی خولی بیستەم وێنەی (ئێنیشتین) کە ڕون کردنەوەی دڵ بەهۆی ئاینەوە هەر ئەو سەرچاوەیە بۆ زانین و زانست. بەڕاستی نهێنی بۆ ئەو بڕیاردانە پێش کەوتنی زانستەلەو خولەداو، دواکەوتنی زانستبووە لەوەوبەر، هەموو کاتێ زانستی لە پێش کەوتندابێ ئایین چەندین یاریدەری وەك ئێنیشتین بۆخۆی پەیدا ئەکاو بڕیاری گەورەیی ئایین ئەدەن و باوەڕ ئەهێنن هەر ئاین ڕاستە و پوچی ڕوی تێ ناکا لەمەوبەر لەمەو دووایشی.

﴿ فالِقُ ٱلأصْباحِ وَجاعِلُ الَيْلَ سَكَناً ﴾ خوا ئەو خوایەیە دەرهێنەری ڕوناکیە لە تاریکی شەو. یانێ تاریکی نایەڵێ و ڕوناکی ئەهێنێ، بۆ ئەوەی ڕۆژ دروست بکا و ئێوەش بڵاوببنەوە بەسەر زەویدا بۆ کارکردن و بەدەست هێنانی هۆی ژیانی خۆیان و، خوا شەوی گێڕاوە بە جێگەی ئارام گرتن و پشودانێ ئادەمیزاد هەتا ئەو ماندویەتیە و ئازارە بە ڕۆژدا توشیان بووە نەمێنێ.

﴿ وَالَشَمْسُ والْقَمَرَ حُسْباناً ﴾ وەخوا دروست کەری خۆرو مانگ بۆ دیاری کردنی هەموو شتێك و ژماردنی کاتەکان و نیشانەدانان لەسەریان. یانێ خوای مەزن خۆرو مانگی

دروست کردووە بە ئەندازەیەکی تایبەتی لە تیژی و گورجی و سستی ڕویشتنیان، بەجۆرێ بۆ زەوی هەبێ دوو جولاندن. لە ڕۆژئاواوە بۆ ڕژهەلات ئەڕوا، کۆتایی پێ دێی لە (٢٤) کات ژمێردا کە شەوو ڕۆژیان لێ پەیدا ئەبێ. جولەیە تری هەیە لە ڕرژهەلاتەوە بەرەو ڕۆژئاوا ئەڕوا سالێ لێ پەیدا ئەبێ لەماوەی (٣٦٠) ڕۆژداو کۆتایی پێ دێ و چوار وەرزیشی لێ پەیدا ئەبێ، ئەو جۆلەیەیش بەخواری ئەڕوا، بە نزیکبونەوەی خۆر لە باکورەوە وەرزی بەهارو هاوین پەیدا ئەبن، بە نتزیکبوونەوەی خۆر لە باشورەوە وەرزی پایزو زستان پەیدا دەبن، ئەوەیش بۆ دانیشتوانی لایەکی زەوی لە باکورەوە بە پێچەوانە بۆ ئەو لاکەی تری زەوی لە باشورەوە، ئەوەی باسمان کرد بۆ سوڕانەوەی زەویە بە دەوری خۆرا هەروەها مانگیش ئەسوڕێتەوە بە دەوری خۆردا (١٢) مانگی لێ پەیدا ئەبێ (١٠) مانگی هەر یەکەیان (٢٩) ڕۆژە (٢) مانگیان هەریەکەیان (٣٠) ڕۆژە، بەو (١٢) مانگە سالێ پەیدا ئەبێبناغەی سالێ کۆچی و کاتەکانی پەرستنی خوا لەسەر سوڕانی مانگ پەیدا ئەبن.

پرسیار/ ئەگەر پەیدابوونی شەووڕۆژ بەرهەمی سوڕانی زەوی بن، بۆچی ئەدرێتە پاڵ خوا؟

وەلام/ هەر خوایە بە تەنها ئاسمانەکان و زەویی و خۆرو مانگ و شەوو ڕۆژی دروست کردوون، هەموو شتێ بەبێ کەم و کوڕی بۆلای ئەو ئەگەڕێتەوە. کەواتە مەبەست لە ناوەڕۆکی ئەو ئایەتانە ئەمەیە: هەموو شتێ لە بونەوەران بە ڕێکەوت و گۆترە پەیدا نەبوون. بەلکو بە توانای بێ وێنەی خوا هاتونەتە بونەوە، هەموو شتێ ئەندازەی شیاوی خۆی دراوەتێ بۆ ڕون کردنەوەی خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ ذٰلِكَ تَقْدِيْرُ الْعَزِيْزِ الْعَلِيْمِ ﴾ ئەو پەیداکردنەی شەوو ڕۆژەو سوڕان و هاتوچۆی خۆرو مانگە بۆ پەیداکردنی شەوو ڕۆژو سالێ و مانگ بەدانان و دیاری کردن و گەڕاندنی

خوایە کە هەموو شتێکی بە ئەندازەی شیاوی خۆی داناوە، زۆر بەدەستەڵاتە لە هەڵسوڕاندنی بونەوەراندا بە گشتی، زانایەکی بێ ئەندازەی هەیە بۆ بەڕێوەبردنی بونەوەران، خوایە کە هەموو ئەستێرەکانی خستۆتە مەلەکردن هەریەکەیان لە ئاسمانی خۆیانا و لە بۆشایدا و هیچ شتێ لەخوا وون نابێ.

﴿ وَهُوَ الذي جَعَلَ لَكُمْ النُجُومَ لِتَهْتَدُوا في ظُلْمـاتِ الْبِرَ وَالْبَحْـرَ ﴾ وەخوا کەسێکی ئەوتۆیە دروستی کردووە بۆ سودی ئێوە ئەستێرەکان لە جگەی خۆرو مانگ، بە هەموو ئەستێرە گەڕۆکەکان وەستاوەکانیانەوە لەبەرئەوەی ئێوە ڕانومایی وەرگرن و ڕێگەی خۆتان بدۆزنەوە لە چەندین تاریکەکانی شەو لە بیابان و وشکاییداو و لە تاریکەکانی دەریادا بەهۆی ئەو ئەستێرانەوە. جگە لەو سودانەیش ئەستێرەکان گەورەترین بەڵگەن لەسەر توانای بونی خوا کە ئەو ئەستێرانەی کردوە بەهۆی شارەزایی بۆ ئادەمیزاد لەسەر زەوی و لە دەریادا بەو هەموە دوریەوە کەوتوەتە نێوان ئەوان و زەوی.

﴿ قَدْ فَصَلْنا الآياتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾ بەڕاستی ئێمە ڕونمان کردۆتەوە چەنیدن نیشانەی بۆ یەکێتی و بۆ توانای خوا لەبۆ تاقمێ بزانن بەو شتانەی نیشانەن لەسەر توانای ئێمە.

بەو ڕستانەی پێشوو ئەم وێنەیەمان بۆ لێ ئەدرێ: ئەگەر بمانەوێ کۆشکێ بدۆزینەوە لەنێو شارێکا پێویستە پرسیاری ناوی گەڕەك و شەقام و ژمارەی شەقام و ژمارەی سەردەرگاکەی بکەین، هەتا بتوانین ڕێگە بۆلای ئەو کۆشکە شارەزابین.

هەروەها ئەستێرەکانیش هەریەکەیان ناوێکی تایبەتی و لایەکی دیاری کراویان بۆ دانراوە، ئەوانە چەندین نیشانەن کەشتیوان و لێ خوڕی ماشین و سواری چارەوێ ڕانموییی وەربگرن بۆلای شوێنی مەبەستی خۆیان، زۆر قافڵەی نێو دەریا لەسەر نەخشەی ئاسمان و شوێنی ئەستێرەکان ئەڕۆن بەرێگەدا لەکاتی پەك کەوتنی ڕوانگە لەکاری خۆیا (البوصلە).

﴿ وَهُوَ الذي أنْشَأَكُمْ مِنْ نَفْسٍ واحِدَةٍ فَمُسْتَقِرٌ وَمُسْتَورَعٌ ﴾ وەخوا کەسێکی ئەوتۆیە ئێوەی دروست کردووە لە کەسێکی تەنها کە ئادەمی باپیرە گەورەی هەموو ئادەمیزادە، هەر لەویشحەوای ژنی ئادەم دروست کراوە کە دایکە گەورەی هەموو ئادەمیزادە،

لەوانەوە هەموو پیاوان و ژنان بڵاوبوونەتەوە بەسەر زەویدا، دووایی بۆ ئێوە ئەبێ جێگەی دانیشتنتان لە پشتی باوکتانا یا لەسەر زەوی و، بۆ ماوەیەکی تایبەتی دائەنرێن لە منداڵدانی دایکتانایا لەنێو زەویدا، هەر شوێنی بۆ ماوەیەکی کەم شتێکی تێدا دابنرێ پێی ئەوترێ (مُسْتَقر).، هەر شتێ بکرێ بە جێگە بۆ ماوەیەکی تایبەتی پێی ئەوترێ (مستودع).

زانایان بۆ مانای ئەو دورستەیە (مُسْتَقِرٌ وَمُسْتَوْدَعٌ) زۆر مانایان فەرمودە، ئەوەی شایانێ ئەو مانایانەن باسمان کردن. بەڵام هەر شتێ بکرێ بە جێگەی دانیشتنێ یەك جاری پێی ئەوترێ (مستقر) وەهەر شتێ بکرێ بە جێگە بۆماوەیەکی تایبەتی پێی ئەوترێ (مُسْتَودَعٌ).

﴿ قَدْ فَصَّلْنا الأياتِ لِقَوْمٍ يَتَفَقَهُونَ ﴾ بەڕاستی ئێمە ڕونمان کردەوە ئەو چەندین بەڵگەیە لەسەر توانای خوا بۆ تاقمێ تێبگەن لەو بەڵگانە لەیەکێتی خوا.

خوای مەزن بۆ باسی ئەستێرەکان ئەفەرموێ: (يَعْلَمُونَ)، چونکە وەرگرتنی ڕانموینی بۆ دۆزینەی ڕێگە لە تاریکەکانی بیابان و دەریادا ئاشکرایە و بەکەمێ ووردبوونەوە ئەزانرێ. بەڵام دروست کردنی ئادەمیزاد لە کەسێکی تەنهاو گۆڕانیان بە چەندین شێوە: لەتۆو بۆ خوێن، لە خوێنەوە بۆلای گۆشت، لە کۆشتەوە بۆلای گۆشت و ئێسك. کارێکی زۆر ووردو پەنهانە، پێویستی بە تێگەیشتنی زۆر و زیرەکی و ئەقڵی تەواو هەیە، بۆیە خوا فەرموی: (يَتَفَقَهُونَ).

﴿ وَهُوَ الذي أنْزَلَ منَ السَماءِ ماءً ﴾ وەخوا کەسێکی ئەوتۆیە ناردویەتە خوارەوە لە ئاسمانەوە و لە هەورەوە ئاوێ کە بە کوردی پێی ئەوترێ: باران، باران سەرچاوەیە بۆ ئاوی شیرین، ئەگەر ئەو نەبوایە زەوی بیابانێکی ووشك و چۆڵ ئەبوو ژیانی تێدا نەئەبو، خوای مەزن ناردنە خوارەوەی بارانی یەك سەرداوەتە پاڵ خۆی، چونکە هەر خوایە هەموو هۆکانی بونەوەران دروست ئەکاو یەکەم جار بە فەرمانی خوا پەیدا ئەبن، لە دوایشدا هەر بۆلای خوا ئەگەڕێنەوە با هەزاران هۆ لە یەکترەوە پەیدابن.

﴿ فَأخْرَجْنا بِهِ نَباتَ كُلِ شَيءٍ ﴾ دوای ئێمە دەرئەهێنین بەهۆی ئەو ئاوەوە هەموو شتێ سەوز ئەبێ و گەشە ئەکا لە هەموو بەشەکانی ئەو شتانە سەوز ئەبن و ئەیکەن بە خواردەمەنی گیانداران و هۆی ژیانیان بەو ئەژین و گەشە ئەکەن.

﴿ فَأخْرَجْنا مِنْهُ خَضِراً نُخرِجُ مِنْهُ حَباً مُتَراكِباً ﴾ دوای ئێمە دەرمان هێناوە لەوەی سەوز ئەبن شتێکی سەوزو ناسك و تەڕو لقەکان بەرەژوورو ڕیشوەکانی بەرەوخوا ئەڕۆن و ئێمە دەرئەهێنین لەو سەوزەیەی سەرزەوی دانەوێڵەو بەقات قات سواری یەك ئەبن بە وێنەی گوڵی کەنم و جۆو وشتی تر.

﴿ وَمِنْ النَخلِ مِنْ طَلْعِها قِنْوانٌ دانِيَةٌ ﴾ وەئێمە دەرئەهێنین لە درەختی خورماو لەو گوڵەی ئاشکرا ئەبێ چەندین هێشوو دەنکەکانی لەیەکو نزیکن و بە ئاسانی لەو هێشوە ئەکرێنەوەبۆ خواردن و بۆ هەڵگرتن.

﴿ وَجَناتٍ مِنْ أعْنابٍ وَالزَيْتُونَ وَالرُمانَ مُشْتَبِهاً وَغَيْرَ مُتَشابِهٍ ﴾ وەئێمە دەرئەهێنین چەندین باخ و بێستان لە ترێ و درەختی زەیتون و درەختی هەنارو ئەو درەختانە گەڵاو بەرەکانیان هەیانە لەیەك ئەچن و هەیانە لەیەك ناچن، هەیانە لەش و تام و ڕەنگیان لەیەك ئەچن و هەیانە لەیەك ناچن.

خوای مەزن بۆ جارێ تر دووهەم باسی هەندێ تر لە کردەوە سەر سوڕهێنەرەکانی ئاشکرای خۆیمان بۆ ئەکا کە بەڵگەن لەسەر توانای خواو ڕوئەکاتە بێ باوەڕان ئەفەرموێ:

﴿ أنظُرُوا إلى ثَمَرِهِ إذا أثمَرُوا وَيَنْعِهِ ﴾ ئێوە بنوارن بۆلای میوەو بەرهەمی هەموو بەشێ لە بەشەکانی ئەو شتانەی باسکران لە گییاو لە درەخت لە کاتێکا بەرهەمەکانیان یەکەم جار دێنە دەرەوە بچوك و بێ سودو بێ تامن و کاتێ پێ ئەگەن خاوەنی سودن و لەشیان گەورەو بەتامن، هەتا بۆتان دەربکەوێ میهرەبانی خواو بەڕێوەبردنی خوا بۆ بونەوەران و دانانی هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا. بۆجاری سێهەم ئێوە سەیری ئەوانەی پێشو بکەنەوە هەتا ئێوە باوەڕ بهێنن و تەمێ خوابن، بۆیە خوا ئەفەرموێ:

﴿ إنَ فِي ذلِكُمْ لأياتٍ لَقَوْمٍ يُؤمِنُونَ ﴾ بەڕاستی هەیە لەو شتە پێشوانەدا چەندین بەڵگەی ڕون و بێگومان بۆ ئەو تاقمەی باوەڕ بە یەکێتی خواو توانای خوا بهێنن، چونکە پەیدابوون و بوونی ئەوانە بەو هەموو جیاوازیانەیان هەیانە لەیەکتری و گۆڕانیان لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەتر. کەواتە ئەوانە نابن و پەیدا نابن بەبێ پەیداکردنی کەسێکی بەتوانا کە بە گوێرەی کردەوەی شایان هەموو شتێ بکاو هیچ شتێ نەبێ بە کۆسپ و لەبەردەمیا و دژی نەوەستێ، زۆر ڕون و ئاشکرایە ئەو کەسەیش ئەبێ هەرخوابێ. مەبەست لەو کەسانە باوەڕ ئەهێنن ئەو کەسانە نین ئەو کاتە باوەڕیان هێناوە. بەڵکو مەبەست ئەو کەسانەن وولامی بانگەوازی باوەڕ ئەدەنەوە سود لە بەڵگەکانی و نیشانە ڕونەکانی ئایین ئەدەنەوە، ئیتر لەمەوبەر باوەڕیان هێنابێ یا ئێستاو لەو پاش باوەڕ بهێنن، ئەبێ بزانین ئەو کەسانە دڵیان بە داخراوەو دێن و ئەڕۆن و ئەخۆن و ئەخەون و وێنەی ئاژەڵ و چوارپێن و سود لە هیچ شتێ وەرناگرن.

پوختەی ماناو مەبەست لەو ئایەتانە ئەمەیە: کە خوای مەزن بە وێنە ئاسمانەکان و زەوی و ئادەمیزاد ئاگادارمان ئەکاتەوە بۆلای ئەوە هەمو شتێ لە بونەوەرانە لەو شتە سەرسوڕهێنەرانە کە دروست کراون و دانراون ناگونجێ بە ڕێکەوت پەیدابووبن، ئەوەی ڕاستی بێ ئەقڵ وەری بگرێ ئەمەیە: کە ئەو بونەوەرانە لەکەسێکی خاوەن ویست و خاوەن بڕیاری بێ وێنەوە دەرچوون، هەموویانی لە جێگەی شیاوی خۆیانا داناوە، بەڵگەی بەهێز بۆ ئەوەی باسکرا ئەمەیە کە زاناو نەزان و تێگەیشتوو گێل بیزانن، گەورەترین بەڵگەیشبێ لەسەر پوچ کردنەوەی ڕێکەوت کە ئەو بەڵگە بەهێزە وەك بیروباوەڕێ سەیر بکرێ ئەمەیە ڕوداوێکی تەنها چەند جار دووپات ئەبێتەوە هەرجارێ بە شێوەیەو هەمو و جارێکیش هۆکەی دووپات ئەبێتەوە.

لەپاش ئەو باسانەی پێشوو خوای مەزن وولامی بت پەرستان ئەداتەوە ئەفەرموێ. جێگەی سەرسوڕمانە بێ باوەڕان بێ باوەڕییان پەرە ئەسێنێ لەگەڵ ئەو هەمووە بەڵگەو نیشانانەدا ئەی بینن و ئەفەرموێ:

وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ ۖ
وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَـٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ وَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا
يَصِفُونَ ﴿١٠٠﴾ بَدِيعُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ
وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَـٰحِبَةٌ ۖ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٠١﴾
ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ ۖ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ خَـٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ
فَٱعْبُدُوهُ ۚ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ وَكِيلٌ ﴿١٠٢﴾ لَّا تُدْرِكُهُ
ٱلْأَبْصَـٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَـٰرَ ۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾
قَدْ جَآءَكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ عَمِىَ
فَعَلَيْهَا ۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ ﴿١٠٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ
ٱلْـَٔايَـٰتِ وَلِيَقُولُوا۟ دَرَسْتَ وَلِنُبَيِّنَهُۥ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٥﴾
ٱتَّبِعْ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ وَأَعْرِضْ عَنِ
ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٦﴾ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكُوا۟ ۗ وَمَا جَعَلْنَـٰكَ عَلَيْهِمْ
حَفِيظًا ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴿١٠٧﴾

﴿ وَجَعَلُوهُ للهِ شُرَكَاءَ الْجِنَ ﴾ وەبێ باوەڕان دائەنێن بۆ خـوا جنۆکـەکان بـە چـەندین هاوبەش بۆ خواو ئەیان پەرستن لـە شەیتان و لـە یاریدەرانی شەیتان و لـە ڕەگـەزی شـەیتان کە کار ئەکەن بۆلادانی ئادەمیزاد لـە خوا پەرستی بە وێنەی کاری شەیتان.

هاوبەش دانەران بۆ خـوا چـەند بەشـێکن: هەیانـە شـەیتان ئەپەرسـتن، هەیانـە تـاریکی ئەپەرستن، تاقمێکیان جنۆکە ئەکەن بە هاوبەش بۆخوا. خوای مەزن هەواڵی داوە بە ئێمە بە بوونی دیوودرنج هەروەك هەواڵی داوە بە بونی فریشتە، خوا جنۆکەی دروست کردوە لـە ئاگر لـەم ئایەتە خوا باسی ئـەو کەسـانەمان بـۆ ئـەکا دیوودرنـج ئەپەرسـتن و ئەیکـەن بـە هاوبەش بۆ خوا.

بەڵام جۆری ئەو درنجانەی ڕون کردوەتەوە بۆ ئێمە ئایا دربخێکی وەهمیـەو نـابینرێ بـە گومانی ئەوان یا جگەی ئەوەیە، بۆیە هەندێ لە زانایان ئەڵێن: ئـەو دێـوو دربخانـە بریتـین لـەوانەی وەهمین و نابینرێن.هەندێ تریان لایان وایە بریتین لـە شـەیتان و نـەوەکانی، هیـچ لایە لـەو زانایانە بەڵگەیان بەدەستەوە نیە، هەرچۆنێ بێ خوای مەزن بەدرۆیان ئەخاتەوە بـە تەنها ڕستەیەو ئەفەرموێ:

﴿ وَخَلَقَهُمْ ﴾ وەخوا ئەوانەی نەکردوە بە هاوبەش و، خوا دروسـتی کـردون چۆنیـان ئەکەن بە هاوبەشی خوا. خوا دروست کەری هەموو بونەوەرانە لـە ئادەمیزادو دیوودرنج و جگەی ئەوانیش بونەوەران ناتوانن هیچ شتێ دروست بکەن شەیتان یا جگەی شەیتان، نەك وەك ئاگر پەرستان هاوبەش بۆ خوا دائەنێن و ئەڵێن: خـواو شـەیتان دووبـرای هاوبەشـن: خوا ڕوناکی و ئادەمیزادو چوار پێ و گیانداره پاکەکانی دروست کردوە، شەیتان تـاریکی و دڕندەو مارو دوپشکی دروست کردووە لـەگەڵ گیـاندارە پیسـەکاندا، ئـەڵێن: هـەموو شتێ لـەنێو بونـەوەراندا چاکبـێ خـوا دروسـتی کـردووە، هەرشـتێ خـراپ بـێ لـەنێو بونەوەراندا شەیتان دروستی کردوە.

﴿ وخَرَقُوا لَهُ بَنِينَ وَبَنَاتٍ بِغَيْرِ عِلْمٍ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يَصِفُونَ ﴾ وەبـەبوختان داتاشـن بۆخوای دروست کەری هەموو بونەوەران چەندین کوڕوکـچ، جوەکـان ئـەڵێن: عوزەیـر

کوڕی خوایە: گاورەکان ئەڵێن: عیسا کوڕی خوایە. عەرەبەکان ئەڵێن: فریشتەکانی کچی خوان، ئەو کەسانە ئەو شتانە ئەڵێن بەبێ زانست و زانین و بەبێ ئەوەی بەڵگەیان بەدەستەوە بێ، پاك و خاوێنە خواو بەرزو بڵندە لە شتێ ئەوان باسی ئەکەن و ئەیکەن بە هاوبەش و کوڕوکچی خوا.

﴿ بَدِيْعُ السَماواتِ وَالأرْضِ أنى يَكُونُ لَهُ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُنْ لَهُ صاحِبَةٌ ﴾ خوا دروست کەری ئاسمانەکان و زەوی‌یە لە نەبونەوە بۆلای بۆن بەبێ ئەوەی وێنەیەکییان هەبێ لە پێشەوە، چۆن ئەبێ بۆخوا هەبێ منالّ؟ بێگومان منالّ ئەبێ لەوێنەی باوکی بێ و خوابێ وێنەو،بۆخوا نەبووە هاوڕێ و ژن هەتا منالّی هەبێ لەو ژنە نە لە ڕەگەزی خۆی و نەلەڕەگەزی جگەی خۆی، چونکە ڕون و ئاشکرایە خوا نەڕەگەزی هەیەو نە وێنە، پێویستی بە هاوسەرو بە هیچ شتێ نیە، ئیتر منالّ لەکوێ ئەبێ بە درێژی مانای ئەو ڕستەیە لە ئایەتی (٥٠) ی سورەتی نیساءدا کراوە.

﴿ وَخَلَقَ كُلِ شَيْءٍ وَهُوَ بِكُلِ شَيْءٍ عَلِيْمٌ ﴾ وەخوا دروستی کردووە هەموو شتێ و دروست کەر نابێ کوڕو کچ و ژنی هەبێ و، خوا ئەزانێ بە هەموو شتێ و بەوەیش کە منالّی نەبووەو نابیێ.

﴿ ذلِكُمْ اللهُ رَبَكُمْ لا إله إلاّ هو خالق كُلِ شيءٍ فاعبدوه وهو عَلَى كُلِ شيءٍ وَكِيْلٌ ﴾ ئەو کەسەی بەو جۆرەبێ خوایە پەروەردەکەری ئێوەی بت پەرستە هیچ خوایە نیە شایەنی پەرستنبێ مەگەر هەر خوایە کە دروست کەری هەموو شتێکە و هەڵسوڕێنەریانە، تاك و تەنهاو بێ ژن و خێزانە دوایی ئێوە پەرستن بۆ ئەو خوایە بکەن بە تەنهاو هیچ شتێ مەکەن بە هاوبەش بۆی بە بوختان و بەدرۆ، خوا لە هەموو لایەکەوە تەنهایەو مەیدەنە پاڵی خوا ژن و منالّ و خوا ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکا و ئەیپارێزێ و چاودێریان ئەکاو ڕۆزیان ئەداو ئەیانبابەڕێوە.

﴿ لا تُدْرِكُهُ الأبْصارُ ﴾ هیچ خاوەن چاوێ خوا نابینێ و نازانێ چۆنە لە جیهاندا جگەی خۆی . بەلاّم لە ڕۆژی دواییدا باوەڕداران خوا ئەبینن، بەجۆرێ ئێمە ناتوانین ڕونی

بکەینەوە، ئەبینرێ نەك لە جێگەیەکی دیاری کراو لە لایەکی تایبەتی کە بەرانبەر بە چاو بەرانبەر ڕوناکی چاو بە پەیدابونی ماوەیە لە نێو بینەران و لە نێوان خوادا، لە باسی مانای ئایەتی (٥٥)ی سورەتی ئەلبەقەرە ئەو باسە ڕۆیشتووە.

﴿ وَهوَ يُدركُ ألأبصارَ وَهوَ أللطيفُ ألخبيرُ ﴾ هەموو خاوەن چاوەکان ئەبینێ، چونکە خوا ئاگای لە درشت و لە ورد هەیە و هەموو شتێ ئەزانێ و خوا ئەزانێ بە هەموو کارێکی نهێنی و بە هەموو گیروگرفتیان و بە نیازی هەموو بونەوەران و بە جێگەی ئەوان و ئاگاداریانە.

﴿ قدْ جاءكُمْ بصائرُ مِنْ ربكُمْ ﴾ بە ڕاستی هاتووە بۆ لای ئێوە چەندین بەڵگە و نیشانەی ئاشکرا و بینراو لە لایەن پەروەردەکەری خۆتانەوە بکرێن بە بەڵگە لەسەر توانا و یەکێتی خوا، دوای ئەوەی خوا بەڵگەی بێگومانی دانا لەسەر ڕاستی ئاینی ئیسلام. ئەفەرموێ:

﴿ فمنْ أبصَرَ فلنفسهِ و منْ عمى فعليها ﴾ دوایی هەر کەسێ ئەو ڕاستییانە ببینێ و باوەڕیان پێ بهێنێ دوایی سودەکەی هەر بۆ خۆیەتی و چاکەی بۆ خۆی کردووە، هەر کەسێك خۆی کوێر بکا و ئەو ڕاستییانە نەبینێ و ڕێگە ون بکا، دوایی زیان و خراپەی لەسەر خۆیەتی و بۆ خۆی ئەگەڕێتەوە.

﴿ وما أنا عليكُمْ بحفيظٍ ﴾ وە من پاسەوان و چاودێری کەرنیم بەسەر ئێوە نەیەڵ م گوناهو خراپە بکەن دوایی ڕون بونەوەی بەڵگەکان. بەڵکو من موژدەرو ترسێنەری ئێوەم بەڵکو هەر خوا ئاگاداری هەموو شتە و چاودێری ئێوە ئەکا.

عەرەبەکان پێش ئاینی ئیسلام گەلێکی نەخوێنەوار و نەزان بوون، فریان بە زانین و زانیاریەوە نەبوو، کاتێك گوێیان ئەگرت لە خوێندنی قورئان و زانین و زانیاری زۆریان لەو قورئانەدا ئەبینی لەگەڵ بەڵگەو نیشانەی پەك خەر بۆیان، لەگەڵ ئەوەیشدا باوەڕیان نەئەهێنا و ڕانمویان وەرنەگرت پەلاماری برو بیانووی درۆینەیان ئەدا و وتیان: ئەی موحەمەد ئەم قورئانە تۆ هێناوتە و فێری بوی لای جگەی خۆت، لە لایەن خواوە نەهاتووەتە خوارەوە بۆ ڕونکردنەوەی ئەو شتانە خوا فەرمووی:

﴿ و كذلكَ نصرفُ ألآياتِ و ليقولُ درستْ ﴾ وە هەروەها ئێمە ڕونی ئەکەینەوە دووپاتی دەکەینەوە چەندین بەڵگەی ئاشکرا و ڕون وەك لەمەوبەر ڕونمان کردەوە بۆ ئەوەی بێ باوەڕان پەکیان بکەوێ، بۆ ئەوەیش بڵێن: تۆ ئەو قورئانەت خوێندووە و فێری بوی لە نامەی خاوەن نامەکانە و لای خواوە بۆت نەهاتووە.

﴿ ولنبينهُ لقومٍ يعلمونَ ﴾ وە لەبەر ئەوەی ئێمە ئەوقورئانە ڕون بکەینەوە بۆ تاقمێ ئەزانن بە بەڵگەی ڕاست و باوەڕی پێ ئەهێنن و هەر ئەوان سودی لێ وەرئەگرن و ڕایان ئەکێشێ بۆ باوەڕهێنان بە ڕاستی. بەڵام کۆمەڵی نەزان و گومڕا ئومێدی ڕانوماییی وەگرتنیان لێ ناکرێ و بە هۆی ئەو بەڵگانەوە بیانویان نامێنێ.

﴿ إتبعْ ما أوحي إليكَ منْ ربكَ لا إله إلا هوَ ﴾ تۆ دوای شتێ بکەوە بە سروشت نێراوە بۆ لای تۆ لە لایەن پەروەردەکەری خۆتەوە وە دوای ئارەزوی بێ باوەڕان مەکەوە و هەر ئەوە تاکە ڕێگەی ڕزگاری و ڕاستی. هیچ خوایە نیە شایانی پەرستنێ مەگەر هەر خوای تاك و تەنیا و بێ هاوبەش و پێویستی بە کەس نیە. خوایە بەو جۆرە بێ پێویستە بپەرسترێ و وازی لێ نەهێنرێ بە هۆی نەفامی و نەزانین و دڵ ڕەشی بێ باوەڕانەوە.

﴿ و أعرضْ عَنْ المشركينْ ﴾ وە تۆ ڕو وەرگێڕە لەو کەسانە هاوبەشی بۆ خوا دائەنێن و گاڵتە بە ئاینی ئیسلام ئەکەن. ئەو ئایەتەی ئێرە فەرماندانی خوایە بە پێغەمبەری بەڕێزی خۆی کە ترسێنەر و موژدەر بێ بە هۆی قورئانەوە و بەردەوامیێ لەسەری و گرنگی نەدا بە بێ باوەڕی بت پەرستان و بە درۆخستنەوەی ئەوان و پڕوپاگەندەیان.

﴿ و لَو شاءَ اللهُ ما أشركوُا ﴾ وە ئەگەر خوا ئارەزووی هەبوایە ئەوبێ باوەڕانە خوایان بەیەك دائەناو هاوبەشیان بۆ خوا دانەئەنا. بەڵام فرمانی پێ داون ئەقڵی خۆیان بخەنە کار بۆ دۆزینەوەی ڕاستی و زۆر لە کەس ناکا بۆ کردنی هیچ شتێ پاش ئەوەی ئەقڵی پێ بەخشیون و چاك و خراپ لایان ئاشکرایە، خۆیان خاوەنی هەڵبژاردنن.

﴿ و ما جعلناكَ عليهمْ حَفيظاً و ما أنتَ عليهمْ بوكيلْ ﴾ وە ئێمە تۆمان دانەناوە بەسەر بێ باوەڕانەوە چاودێریکەری کردەوەیانیێ و پرسیاری ئەوانت لێی بکرێ وە تۆ

دەسەڵاتت نی‌یە بەسەر ئەواندا و هەڵسوڕێنەری کاری ئەوانبی هەتا زۆریان لێ بکەی لەوان باوەڕبهێنن.

موسوڵمانان جنێویان ئەدا بە بتەکانی بێ باوەڕان، بێ باوەڕان وەڵامی ئەوانیان ئەدایەوە بە جنێودان بە خوا و ئەویش زۆر نزیکە وابێ، چونکە زۆر جاران وێنە ئەو کارە ڕوی داوە لە نێوان دوو تاقمی ئاین جیاواز لە یەکتری، بۆ قەدەغە کردنی ئەو کارە خوا فەرموی:

وَلَا تَسُبُّوا الَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ فَيَسُبُّوا اللَّهَ عَدْوًا بِغَيْرِ عِلْمٍ كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٠٨﴾ وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لَئِن جَاءَتْهُمْ آيَةٌ لَّيُؤْمِنُنَّ بِهَا قُلْ إِنَّمَا الْآيَاتُ عِندَ اللَّهِ وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَا إِذَا جَاءَتْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٩﴾ وَنُقَلِّبُ أَفْئِدَتَهُمْ وَأَبْصَارَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا بِهِ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١٠﴾

﴿ وَ لا تسُبوا الذينَ منْ دونَ الله فيسُبوا الله عَدوا بغير عِلم ﴾ وە ئێوەی باوەڕدار جنێومەدەن بە خواکانی کەسانێکی ئەوتۆ لە جگەی خوا ئەپەرستن و بە خراپە باسیان مەکەن دوایی ئەو بێ‌باوەڕانە جنێوبدەن بە خوا لە تۆڵەی ئەو جنێودانەی ئێوە بە ستەم کردن و دەرچوون لە ڕاستی بۆ لای کاری ناڕاست بە بێ زانین لە ڕێزو گەورەیی خوا و بە نەفامی خۆیانەوە.

ئەو ڕستانەی پێشو بەڵگەن لەسەر ئەمەی ئەگەر فەرمانداِن بە چاکە و پەرستنی خوا سەریان بکێشێ بۆ گوناهی گەورەتر پێویستە وازیان لێ بهێنرێ، چونکە ئەو شتە سەربکێشێ بۆ لای خراپە لە خۆیا خراپەو قەدەغەیە.

﴿ كذلكَ زيّنا لِكُل أمة عملهُم ﴾ هەر بەو جۆرەی ئێمە ڕازاندبومانەوە پەرستنی بتەکان و پەیڕەوی کردنی شەیتان، هەروەها ئێمە ڕازاندومانەتەوە بۆ هەمو نەتەوەیە کاری خۆیان لە چاك و لە خراپ. ئەو ڕستەیە هەرچەندە بە ڕووالەت وامان پیشان ئەدا کە خوای مەزن ڕازاندویەتیەوە و بۆیان بت پەرستی. بەڵام لە ناوەڕۆکەکانەوە مەبەست نیە. بەڵکو شەیتان هۆی ڕازاندنەوەتی و بۆیان جووان ئەکا، بەڵگەشمان دەقی مانای ئەم ئایەتانەیە:

١- خوای مەزن لە ئایەتی(٤٣)ی ئەلئەنعام ئەفەرموێ:﴿ وزين لهم الشيطانُ ما كانوُا يعلمونَ ﴾ وە شەیتان ڕازاندویەتیەوە بۆ باوەڕان شتێ ئەیکەن. کەواتە خوا فەرمان نادا بە بێ باوەڕی و بیڕازێنێتەوە و لە دواییدا سزاشی بدا لەسەری.

٢- لە سورەتی ئەلحوجورا تا لە ئایەتی(٧) ئەفەرموێ: ﴿ و لكنَّ اللهَ حَبَبَ إليكمُ الإيمان و زينهُ في قلوبكمْ و كرّه إليكم الكُفرَ و ألعصيانَ ﴾ وە بەڵام خوا خۆشەویستی کردووە باوەڕ هێنان بۆ لای ئێوە و ڕازاندویەتیەوە لە دڵی ئێوەدا، وە بێزانویەتی بێ باوەڕی و بێ فەرمانی و لە سنور دەرچون و گوناه کردن. بەڵام چونکە هیچ شتێ لە زانیاری و توانای خوا دەرناچێ لەو ئایەتەی ئێرەدا ئەو ڕازاندنەوەی داوەتە پاڵ خۆی.

خوای مەرن بە جۆرێ ئادەمیزادی دروست کردووە کە جووانی کردووە کردەوەکانی خۆیان بۆیان. لەسەری ئەڕۆن بە گوێرەی سروشت و ئەقڵی پێداون کاری چاك و خراپە لەیەك جوێ بکەنەوە، ئەگەر ئادەمیزادی بە جۆرێك دروست بکردایە هەموو کارێکی خۆیانیان بە ناشیرین بزانایە هیچ کارێکیان نەئەکرد، نەچاك و نەخراپ، چاك و خراپیان جوێ نەئەکردەوە. کەواتە بەو ئەقڵە هەیانە ئەگەر لە خۆیان نەگۆڕێن و بیر بکەنەوە لە هەر شتێك چاك و خراپی لێ جوێ ئەکەنەوە، ئەوەی چاکبێ ئەیکەن و ئەوەی خراپ بێ نایکەن. کەواتە خۆیان تاوانبارن بۆ هەڵبژاردنی کاری خراپ.

﴿ ثُمَّ إِلَى رَبِّهِمْ مَرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُمْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ لە پاشا بۆ لای پەروەردەکەری خۆیا نەگەڕانەوە یان بۆ وەرگرتنی پاداشت و سزادانیان، دوایی خوای پەروەردگاریان هەواڵ ئەدا بە شتێ ئەیکەن لە جیهاندا، بە پرسیار لێ کردنیان و پاداشت دانەوەیان لەسەر کردەوەکانیان. کەواتە باوەڕداران پێویستە لەسەریان خۆیان بگێڕنەوە لە جنێودان بە خواکانی بت پەرستان کە بۆیان ڕونە خوا لەسەر ئەو جنێودانە سزایان ئەدا.

پرسیار/ بە ڕاستی کەسێك جنێو بدا بە خوا و بە پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ پێویستە بکوژرێ، کەچی ئەو ئایەتە وا ئاماژە ئەکا کە ئەو کارە وازی لێ ئەهێنرێ بۆ لای پرسیار و سزادان لە ڕۆژی دوایدا.

وەڵام/ ئەو ئایەتە لە مەکە هاتوەتە خوارەوە لە ڕۆژێکا موسڵمانان لاواز بوون دەستوریان پێ نەدرابوو بە جەنگ کردن، جەنگ کردنیان لەو کاتەدا وەك ئەوە ئەبوو خۆیان بیخنکێنن و خۆیان بکوژن. بەڵام لە کاتی هێزدا پێویستە فەرمانی کوشتنیان دەربکرێ بەهۆی جنێودان بە خواو بە پێغەمەرو نابێ ئەو فەرماندانە بوەستێنرێ و کاری پێ نەکرێ و بخرێتە پشت گوێ.

قورەیشیەکان وتیان: تۆ هەواڵ بە ئێمە ئەدەی موسا داردەستێکی هەبووە کە ئەیدا لە بەردێ دووازدە سەرچاوەی ئاوی لێ ئەهاتە دەرەوە، ئەڵێ: عیسا مردوی زیندوو ئەکردەوە سالح خوشترێکی سەسوڕهێنەری هەبوە، ئادەی تۆیش هەندێ لەو شتانەمان بۆجێبەجێ بکە ئێمە باوەڕت پێ ئەهێنین، پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ فەرمووی: ئێوە چ شتێکتان ئەوێ و لاتان خۆشە بۆتان داوابکەم، ووتیان: کێوی سەفامان بۆ بکە بە زێڕ، فەرموی ئەو کارەم بۆ کرا باوەڕم پێ ئەهێنن ووتیان: سوێندمان بەخوا ئەگەر ئەو شتانەمان بۆ بکەی هەموومان پەیڕەوی تۆ ئەکەین، پێغەمەر هەڵساو ڕۆیشت بۆ پاڕانەوە لە خزمەت خوادا، دوایی فریشتەیە هات بۆلای و فەرمووی: تۆ ئەو داخوازیەت لێ وەرئەگیرێ لەلایەن خواوە، ئەگەر داوا بکەی لەخوا کێوی سەفات بۆ بکا بە زێڕ. بەڵام ئەگەر باوەڕت پێ نەهێنن بە

گوێرەی تاقی کردنەوە ڕابوردووی گەلان ئەمانەی ئێستا هەموویان لەناوئەچن بە سزای خوا لە جیهانداو بنەبڕئەبن. ئەی تۆ ئەتوانی وازیان لێ بهێنی و گوێیان نەدەیتێ هەتا خۆیان تێ ئەگەن لە ڕاستی ئایینی ئیسلام پەشیمان ئەبنەوە باوەڕت پێئەهێنن، پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ ئەمیانی هەڵبژاردو، بۆ ڕون کردنەوەی ئەو مەبەستانەی خوای مەزن ئەفەرموێ.

﴿ وَاَقْسَمُوا بِاللهِ جَهْدَ اِيمانِهِمْ لَئِنْ جاءَتْهُمْ آيَةٌ لَيُؤْمِنُنَّ بِها ﴾ وە بت پەرستانی مەکە سوێندیان ئەخوارد بەخوا بە سەختترین سوێندی خۆیان: بەڕاستی ئەگەر بهاتایە بۆلای ئەوان بەڵگەیە لە داخوازی ئەوان وەك ئەو شتانەی هاتووە بۆلای گەلانی ڕابوردو بەڕاستی ئەوان باوەڕ ئەهێنن خوا یاریدەی پێغەمەری خۆی داوە بەهێزی کرد بە چەندین بەڵگەی تەواو لەسەر پێغمەرایەتی پێغەمر ﴿ ﷺ﴾ بە جۆرێ جێگە بۆ گومان نەیەڵێ بۆ کەسێ داوای ڕاستی بکا هەر لەبەر ڕاستی بەڵام بت پەرستانی قورەیش داوای چەندین کاری پەك خەری تایبەتیان ئەکردو ئەیان کردن بە مەرج بۆ باوەڕهێنانیان بە پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾، سوێندی سەختیان ئەخوارد کە باوەڕی پێ ئەکەن ئەگەر وولامی داخوازیەکەیان بداتەوە، دوایی فەرمانی دا بە پێغەمەر کە بڵێ بەوان.

﴿ قُلْ إِنَما اَلآياتِ عِنْدَ اللهِ ﴾ تۆ بڵێ بەڕاستی چەندین بەڵگەو نیشانەی ئاشکرا لای خوایە، هەر خوا توانای هەیە ئاشکرایان بکاو هیچ شتێ لە توانا و ویستی مندا نیە، خوا ئەنێرێتە خوارەوە شتێ ببێ بە بەڵگە بەسەر هەموو کەسێکا.

موسڵمانان ئاواتیان ئەخواست کە خوا وولامی داواکاری بێ باوەڕان بداتەوە بە ئومێدی ئاشتی و باوەڕهێنانی ئەوان خوا ڕوی فەرمودەی خۆی کرد بۆلای باوەڕداران و فەرموی:

﴿ وَما يشْعِرَكُمْ أَنها إذا جاءَتْ لا يُؤْمِنُونَ ﴾ وەچ شتێکە نیشانی ئێوەی بدا بەڕاستی کاتێ هات ئەو بەڵگەو نیشانەیە چ شتێ پەیدا ئەبێ ئایا ئەوان باوەڕ ئەهێنن، سوێند بەخوا ئەوان باوەڕ ناهێنن ئەگەر ئەو بەڵگەو داخوازییەی ئەوان بێتەدی. لە باسی مانای ئایەتی (٣٤-٣٧)ە ئەم سورەتە بە درێژی ئەو باسە تێپەڕیوە.

﴿ وَنُقَلِّبُ أَفْئِدَتَهُمْ وَأَبْصَارَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا بِهِ أَوَّلَ مَرَّةٍ ﴾ وەچ شتێکە نیشانی ئێوەی بدا کاتێ ئێمە وەرئەگێڕین دڵی ئەوان لە ڕاستی و لە هیچ ناگەن و چاویان وەرگێڕین و بەڕاستی نابینن و باوەڕ بە نیشانەکانی خوا نابەرن بە وێنەی ئەوەی ئەوان باوەڕیان نەهێناوە بە پێغەمەر یەکەم جار.یانێ خوا ئەزانێ ئەو بت پەرستانە باوەڕ ناهێنن دوای هاتنە خوارەوەی ئەو نیشانانەش داوایان کردوون. بێگومان ئەو کەسانە هەر بەردەوام ئەبن لەسەر گومڕایی پێشووی خۆیان کە لەسەری بوون بەر لە داخوازی کردنەکەیان، ئەو کەسانەی شاگردی کاری پڕوپوچن و گومڕای ئەکەن بە پیشەی خۆیان هەرگیز دوای ڕاستی ناکەون.

﴿ وَنَذَرُهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴾ وەئێمە واز لەبێ باوەڕان ئەهێنین لەنێو بێ باوەڕی و یاخی بوونی خۆیانا بێن و بڕۆن و سەرگەردانبن. هەتا بە چاوی خۆیان سزا ئەبینن، ئەو کاتە هۆشیان دێتەوە بە خۆیانا و ئەزانن خوا ڕاستە و ڕاستیشی ئەوێ. یانێ ئەو بێ باوەڕانە پاش ئەوەی بەردەوامن لەسەر کومڕایی خۆیان لەگەڵ دانانی ئەو هەمووە بەڵگە ڕونانە بۆیان دانراوەو ڕاستی ئایینی ئیسلامیان پێ ئەزانرا واز لەو بەڵگانە ئەهێنن. کەواتە چی ئەکەن بابیکەن هەتا لە ڕۆژی دوایدا بە سزای کردەوەی خۆیان ئەگەن.

سوپاس بۆ خوای مەزن و بە یاریدەی ئەو خوایە کۆتایی بە نوسینەوەی
مانای ئەو دوو جزمەی (٦-٧) هات لە ڕۆژی دووشەمەی ڕێکەوتی
(٣)ی مانگی موحەڕەم سالێی (١٤٣٠)ی کۆچی بەرامبەر بە (٣٠ / ٤/ ١٩٩٩)ی
زایینی، خوای خاوەن میهرەبان داواکارم ئەوەی بۆخۆم و خێزان و موسڵمانان
چاکە بۆمانی بسازێنە. خوایە لە خۆم و دایکم و باوکم وخۆش ببە.

تەفسیری زمناکۆیی

# پێڕست

خوێنەری هێژا لەم جزمەدا ئەرکی چاوپیاخشانی ئەم هەڵانە بگرە ئەستۆی خۆت

| هەڵە | ڕاست | لا | دێڕ |
|---|---|---|---|
| ناکەنە | ناکەن | ٦ | ٩ |
| میهرەباە | میهرەبان | ٧ | ٢٢ |
| عیسایا | عیسایان | ١٢ | ٢٠ |
| ئەپەڕی | ئەوپەڕی | ١٥ | ١٨ |
| ئایەۆنی | ئایەتی | ١٧ | ٤ |
| موسۆا | موساوە | ١٩ | ١٥ |
| بەاسی | باسی | ٢١ | ١٥ |
| شتێ هیچ | شتێ | ٣٢ | ٠٢ |
| ڕەوابنە | ڕەوانیە | ٣٢ | ١٨ |
| دروست | دروست کردنی | ٣٤ | ٢ |
| وسخۆ | وسخر | ٣٤ | ٩ |
| خراپە | خواپەرستان | ٣٥ | ١٢ |
| میهرەبان | میهرەبانی | ٣٥ | ١٦ |
| میعذبم | فیعذبهم | ٣٥ | ١٧ |
| داپڕ | داپۆ | ٣٨ | ١٤ |
| بێپەرستنی | پەرستنی | ٣٩ | ١٧ |
| کردین | کردن | ٤١ | ١٩ |
| نامسی | ناموسی | ٤٣ | ٩ |
| فەرمانەکەی و | فەرمانەکەی | ٤٦ | ١٢ |
| بڕیارە | بڕیار | ٤٦ | ١٧ |
| تخواوە | خواوە | ٥٥ | ٤ |
| والمفحنقة | والمنخقفة | ٦٥ | ١٥ |
| کوستبێ | کوشتبێ | ٦٦ | ٢ |
| مادەی | ماوەی | ٦٦ | ٢ |
| خواردان | خوادا | ٦٦ | ٨ |
| معجانف | متجانف | ٧٠ | ٩ |
| خاوەنەی | خاوەنەکەی | ٧٢ | ١٥ |
| گەڕانە | کەرانە | ٧٢ | ١٧ |
| بەیەکەوبێ | بەیەکەوەبێ | ٧٣ | ٥ |
| ئەو | ئەوتۆ | ٧٤ | ٤ |
| خذالله | أخذالله | ٨٥ | ٦ |
| قال الله | و قال الله | ٨٥ | ٨ |
| مفکم | معکم | ٨٥ | ٨ |
| تریسان | ترسان | ٨٦ | ٢ |
| لۆ لای | بۆلای | ٨٨ | ٢٣ |
| الذذین | الذین | ٨٩ | ٩ |
| هەرو | هەر یەکبێ و | ٩٠ | ٢ |
| وەلییانە | لێیان | ٩٠ | ٥ |
| دوایان | داوایان | ٩١ | ٥ |
| کومانیان | گومانیان | ٩٢ | ١٣ |
| کوترە | گوترە | ٩٤ | ٣ |
| بوشداریان | بەشداریان | ٩٥ | ١٧ |
| -٣ | زیادەیە | ٩٦ | ١٢ |
| تۆ ؟ | لەتواناو | ٩٧ | ١٧ |
| ئیسحاقی | ئیساحاحی | ٩٨ | ٤ |
| خوابنو | خوابونایە | ٩٨ | ١٦ |
| جولەکە | جولەکەو | ٩٩ | ٦ |
| یعن بکم | یعذبکم | ٩٦ | ٨ |
| فأن | فأنا | ١٠٤ | ٤ |
| کەمان | جولەکەکان | ١٠٤ | ٢٣ |
| لآقتلك | لآقتلنك | ١٠٩ | ٩ |
| بۆلای | بۆلای من | ١٠٩ | ١٤ |
| اصحال | أصحاب | ١٠٩ | ٢١ |
| هەروە | هەروەها | ١١٣ | ٥ |
| لەشتێ | لەشێ | ١١٣ | ١٨ |
| خۆتا | خۆتان | ١١٧ | ١٣ |
| پەرستنەکانی | لەپەرستندکان | ١١٧ | ١٥ |
| ئەوانەو | ئەوانە | ١١٨ | ١ |

| هەڵە | ڕاست | لا | دێڕ |
|---|---|---|---|
| وازم | واز | ١٣٩ | ٢ |
| باوەڕان | باوەڕدارن | ١٤٠ | ١٥ |
| بۆ | لە | ١٤٠ | ١٥ |
| يخشى | نخشى | ١٤٢ | ١٢ |
| سيأتى | أن يأتى | ١٤٢ | ١٦ |
| والله | الله | ١٤٩ | ١ |
| ضرب الله | حزب الله | ١٤٩ | ١٨ |
| لەنێو | لەپێش ئێوە | ١٦٠ | ١٠ |
| ناوان | تاوان | ١٥٢ | ١٢ |
| والأصبار | والأحبار | ١٥٥ | ١٩ |
| يضيعون | يصنفون | ١٥٥ | ٢٠ |
| منبوسطان | مبسوطتان | ١٥٧ | ١٠ |
| كارچاكەی | كاری چاكەی | ١٦٨ | ٢ |
| يعتقلون | يقتلون | ١٦٩ | ١ |
| بو | بەناوی | ١٧٠ | ٥ |
| بڕاياری | بڕياری | ١٧٢ | ١٩ |
| ديتاری | دياری | ١٧٥ | ١٠ |
| هەوەك | هەروەك | ١٧٦ | ٢١ |
| ئەكەينە | ئەكەينەوە | ١٨٦ | ٤ |
| اوكذبوا | وكذبوا | ١٨٦ | ٢٣ |
| ڕۆژ گرتن | ڕۆژوگرتن | ١٩٠ | ٢ |
| فيها | فيهما | ١٩١ | ٦ |
| هەشتێ | هەرشتێ | ١٩٢ | ١٦ |
| شوێند | سوێند | ٢١١ | ٤ |
| ئەپەستن | ئەپەرستن | ٢٨٦ | ٥ |
| ئەخۆن | ئەخۆين | ٢١٢ | ٢١ |
| يتومان متامها | يقومان مقامهما | ٢١٣ | ٥ |
| اشتحق | اسحق | ٢١٣ | ٩ |
| ڕاسپيراوەكان | ڕاسپێراوە | ٢١٤ | ١ |
| ڕاسپيراوەكان | ڕاسپێراوە | ٢١٤ | ٢ |
| خوردەمەنی | خواردەمەنی | ٢١٩ | ١٨ |
| مانی | مانای | ٢٢١ | ٩ |
| ابناء | أبناء | ٢٣٢ | ٧ |
| هەدنێ | هەندێ | ٢٣٣ | ٨ |
| فەرمانمان | نەمان | ٢٣٣ | ١٨ |
| اونزل | أنزل | ٢٣٥ | ١٨ |
| قفريشتەكان | فريشتەكان | ٢٣٦ | ٤ |
| زانايا | زانايان | ٢٣٦ | ٥ |
| لەدەرنەئەبو | بەدەرنەبو | ٢٣٦ | ١٧ |
| يكسبون | يلبسون | ٢٣٧ | ٤ |
| ئەوە | ئەو | ٢٤٠ | ٩ |
| وان تمسسك | وأن يمسسك | ٢٤٣ | ١ |
| ئەوە | ئەو | ٢٤٣ | ١٤ |
| لای‌فلح | لايفلح | ٢٤٧ | ١٢ |
| فەزی | نەزری | ٢٤٩ | ٩ |
| ئەكرن | نەكردن | ٢٤٩ | ٧ |
| بەڕاستی | بەڕاستی نيە | ٢٥٠ | ١٦ |
| پليەوە | پايەو | ٢٥١ | ٣ |
| گفتوگۆ | گفتو گۆو | ٢٥٤ | ٣ |
| اطثرهم | اكثرهم | ٢٦٣ | ٥ |
| مثالكم | امثالكم | ٢٦٤ | ٥ |
| هەتا | هەتانە | ٢٦٤ | ١٠ |
| ئاشكران | ئاشكرا | ٢٦٤ | ١٣ |
| وضّراء | والضّراء | ٢٦٩ | ١٩ |
| بالفطرة | بالغداة | ٢٧٧ | ٩ |
| بەخێز | بەخێو | ٢٧٧ | ١٣ |
| پەرستان سو | پەرستان و | ٢٨١ | ١٢ |
| تتعجلون | تستعجلون | ٢٨٣ | ١٢ |
| انتم | ثم انتم | ٢٨٨ | ٨ |
| هەڕشە | هەڕشەيە | ٢٨٩ | ١٨ |

| هەڵە | ڕاست | لا | دێر |
|---|---|---|---|
| فریویی | فریوی | ٢٩١ | ٢١ |
| حیم | من حیم | ٢٩٣ | ٥ |
| تدعون | اتدعون | ٢٩٤ | ١ |
| ڕزگارۆبێ | ڕزگاری بێ | ٢٩٤ | ٦ |
| خوای | خوا | ٢٩٧ | ١ |
| پێش | پتیش | ٢٩٨ | ١٧ |
| الأفلين | الضالين | ٣٠٠ | ١٦ |
| بنەوەیە | منەوەیە | ٣٠٣ | ١٣ |
| کرون | کردوون | ٣٠٤ | ١٩ |
| عیسی | عیس | ٣٠٧ | ١٤ |
| پەرێز بوونی | پەرێز بوون | ٣١١ | ٢ |
| خۆیان | خوایان | ٣١٢ | ٢ |
| ئایان | ئەیان | ٣١٦ | ٧ |
| خالق | فالق | ٣٢٢ | ٣ |
| زیندەی | زیندەیە | ٣٢٣ | ١٥ |
| توانا | توانای | ٣٢٤ | ١٢ |
| کەم | بەردەوام | ٣٢٨ | ٣ |
| یتفقهون | یفقهون | ٣٢٨ | ١٧ |
| دڵیان بە | دڵیان | ٣٣٠ | ١٠ |
| وجعلوە | وجعلوا | ٣٣٢ | ١ |
| کردوەتەوە | ڕونکردوەتەوە | ٣٣٢ | ٩ |
| وێنە | وێنەی ئەو | ٣٣٣ | ٩ |
| سروشت | سروش | ٣٣٥ | ٩ |
| بەڕاستی | ڕاستی | ٣٤٠ | ٣ |